# ئەو تاریكییە درەوشاوەیە.



نووسینی: تاهیر بنجەلوون

وەرگێڕانی: غەفور ساڵح عەبدوڵڵا

حكومەتی هەرێمی كوردستان
وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوان
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوكردنەوە

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوكردنەوەی سلێمانی

كتێبی هەنار ژمارە: 23
ئەو تاریكییە درەوشاوەیە

- نووسەر: تاهیر بنجەلوون
- وەرگێر: غەفور ساڵح عەبدوڵڵا
- بابەت: رۆمان
- پیتچنی: نووسەر
- هەڵەچنی: مستەفا زاهیدی
- نەخشەسازیی بەرگ: جەبار سابیر
- نەخشەسازیی ناوەوە: رێبین مەجید
- سەرپەرشتیاری چاپ: كارزان عەبدوڵڵا
- قەبارەی كتێب: 2/1 A4
- ژمارەی لاپەڕە: ( 274 )
- زنجیرەی گشتیی كتێب: (760)
- تیراژ : (500) دانە
- چاپ: چاپخانەی ئاوێنە
- نرخ: ( 3000 ) دینار
- ژمارەی سپاردنی (1942)ی ساڵی 2010ی وەزارەتی رۆشنبیریی و لاوانی دراوەتێ.

بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوكردنەوەی سلێمانی
گردی ئەندازیاران- بەرامبەر كوردستانی نوێ

**وتەیەک:**

**هەموو رووداوەکانی ئەم رۆمانە لەواقیعەوەیە، لە شایەتیەکانی زیندانیەکی بەندیخانەی (تزمامارت)ەوە وەرگیراوە. کەسێکی ئازیزەو ئەم کارە رۆمانووسیەی بەو پێشکەشکردوە، هەروەها پێشکەشی کردوە بە منداڵەکەی رەزا، کە سێیەم رووناکی ژیانیەتی.**

**عەزیز بنبین، یەکێک بوو لەو سەربازانەی کە بەشداری کۆدەتاکەی ساڵی 1971 بوو لە مەغریب دژ بە رژێمی پاشایەتی شا حەسەنی دووەم، نەفی کرابوون بۆ بەندیخانەی (تزمامارت)، دوای هەزاران رۆژ لە تاریکیدا، وەکو تارمایەکی مرۆڤانە هاتەدەرەوەو، ئازاری دڵی خۆی بۆ قەڵەمەکەی تاهیر بنجەلون گێڕایەوە، بەرلەویش هاوڕێکانی سەربردی خۆیان گێڕابوەوەو، ببوونە کتێبی پڕفرۆش لە ئەوروپا. تاهیر بنجەلون بە توانا بێهاوتاکانی توانی شایەتی ئەو هاووڵاتیەی خۆی بکاتە ئاوازێکی دوورو درێژ لە ئازار، کە خوێنەر بەر لەوەی برژێتە چاویەوە دەرژێتە ناو دڵیەوە. کراسێکی تاریکی پێ دەبەخشێ، کە زیندانیەکە ماوەی هەژدە ساڵ تێدا ژیا. لە زیندانێکەدا کە هێندە نزم بوو نەیدەتوانی تیا بە پێوە بوەستێ، وەک بڵێی ئامادەکرابوو بۆ ئەوەی تامردن بیگووشێت. بنجەلون دەڵێ کاتێ ئەم رۆمانەی دەنووسی دەلەرزی و ئارەقەی دەکرد، لەبەر سەختی کارەساتەکەیش هەندێ جار دەستی بە گریان دەکرد. بنجەلون لە فەرەنسا هێرشی زۆری کرایە سەر، دوای دەرچوونی ئەم رۆمانە بە زمانی فەرەنسی، لەلایەن ئەوانەی کە لە تزمامارت رزگاریان ببوو، بیانوویان ئەوە بوو کە ئەوەندە ساڵ بەو کارەساتەی زانیبوو و باسی نەکردبوو، دووان لەوانە (محەمەد رایس) بوو کە سەربردەکەی خۆی لە تزمامارت نووسیبوەوە، بە ناونیشانی( هاتوچۆ بۆ دۆزەخ) و، ئەویدیکە (ئەحمەد مەرزوقی) بوو خاوەنی کتێبی (تزمامارت زیندانی ژمارە 10)، گەرچی ئەوان وەکو بیرەوەری نووسیبوویان ، بەڵام تاهیر بنجەلون وەکو کارێکی هونەری داهێنەرانەی رۆمان نووسیویەتی. تۆ کاتێ رۆمانەکە دەخوێنێتەوە هیچت لەبەردەمدا نیە، جگە لەوەی سەرسوڕماو بیت بە توانای مرۆڤ بۆ دامێنگیری ژیان و سەرخستنی، سەرەرای توندو تیژ و ئازار و ئەشکەنجە، کە لە هەموو ئاقارێکەوە چاویان تێبڕیوە، هیچت لەبەردەمدا نیە تەنها لەوەی کەسەرسووڕماو بی بەتوانای ئەم زیندەوەرە ئەفسووناویەوە، بۆ داهێنانی فێڵ و دۆزینەوەی رێباز بۆ بەرگریکردنی زوڵم وئازار و توندوتیژیی. رۆمانی (ئەو تاریکیە درەوشاوەیە)ی بنجەلون شاکارێکی فۆتۆگرافی سەرسووڕهێنەری ئەم رۆماننووسەیە بۆ وێناکردنی رۆژانەی ئازارێکی رەش کە لەسەر جەستەی ئەو زیندانیانەی، کە لە جیهانێکی دیکە دەژیان وێنەکێشرابوو، کارێکە شایانی گریانە بۆی و لە گەڵیدا لە لێواری مەرگدا بوەستی. رۆماننووس دەچێتە ناخی ئەزموونێکی مرۆڤایەتی دەگمەنەوە لە ململانێ لە گەڵ مەرگدا. کات سیاقی رۆمانەکە نییە، ئەمەیش لێهاتووی بنجەلون دەردەخات، کاتێ چیرۆکی هەژدە ساڵ لە چاڵێکی تاریک و تنکدا دەگێڕێتەوە کە شەوان ورۆژانی وەکو یەک وان.**

**وەرگێڕی کوردی**

(1)

گەرچی زۆرجار بەدوای بەردە رەشەوە گەڕاوم کە رۆحی مەرگ پاک دەکاتەوە، دەڵێم و گەرچی خەیاڵی بیرێکی بآ بن دەکەم، تونێلێک بەپەنجەکانم، بە دانەکانم هەڵمکەندوە، هیوایەکی کەللەڕەقم هەیە، کە بۆ دەقیقەیەک، دەقیقەیەکی درێژی نەمر، تیشکی رووناکی دەبینم، بلێسەیەک لەوانەیە لە بیلبیلەی چاوم چاپ بێت و، هەناوی نەشکاوم بیپارێزآ، لێرە دەبێتە نیشتەجێی سنگم و شەوە بێکۆتاییەکان دەلاوێنآ، لێرە، لەم گۆڕەدا، لە ناوجەرگەی ئەم زەویە شێدارە، کە پڕ لە بۆنی مرۆڤی خاڵی لە مرۆڤایەتی خۆیان، بە لێدانی ئەو شیشە ئاسنە کە پێستە دەگروآ و، بینایی و دەنگ و ئەقڵی لـآدادەماڵآ. بەڵام ئەقلڕ چ کەڵکێکی هەیە، لەوشوێنەی کە لەچالڕ نراووم، مەبەستم لەژێر زەوی کە بە خاک سپێردراین و، تەنها کونێکی بچووکی لـآیە بۆئەوەی هەناسە بدەین، بۆئەوەی لەکاتی شەوانە پآی بژین و، بەسە بۆئەوەی کەفارەتی گوناهەکانمان بدەین، مەرگ لە هێواشیە بەلەباریکیەکەیدا وای لێهاتووە مەرگێکی زۆر لەسەرەخۆبێت، هەموو کاتێکی بنیادەمی تەواوکردووە، ئەو بنیادەمانەی کە ئێمە لەوان نین، ئەوانەی هێشتا پاسەوانیمان دەکەن، ئەوانەی کە لە لەبیرچوونەوەی تەواویاندا نیشتەجآ بووبن، ئاە لە هێواشی! یەکەم دوژمنی ئێمەیە، ئەوەی کە پێستە داوەشاوەکانمان لە بەرگ دەگرێت و، نایەڵێت برینە دەم دابچڕاوەکانمان قەتماغە بگرن، تەنها بۆ کاتێکی دوورودرێژ نەبێت. ئەو هێواشیەی کە وای لە دڵانمان دەکرد لەسەر ریتمێکی خۆشخوانیدا تۆزێک مەرگ لێبدەن، وەک بڵێی لەسەرمان بوو، وەکو مۆمێکی داگیرساو بکوژێینەوە، دوور لەخۆمان و بەخۆشیەکی باشەوە، زۆرجار بیرم دەکردەوە کە ئەو مۆمە لە مۆم دروست نەکراوە، بەڵکو لە کەرەستەیەکی نەزانراو درووست کراوەو، تیشکێکی نەمر دەبەخشێت، پەردەیەکی هێماییە بەسەر مانەوەماندا، هەروەها خەیاڵی ئەوەم دەکرد کە سەعاتێکی لمی زەبەلاحە، هەر دەنکە لمێکی دەنکە ساوەرێکە لە پێستەکەماندان دڵۆپێکە لە خوێنەکەمان، مژێکی بچووکی ئۆکسیجنە و لەکیسمان دەچێت، هەرکە کات بەرەو ئەو چاڵە قووڵە شۆڕدەبووە کە تێیدا بین. بەڵام لەکوآ بووین؟ بآ چاوەکانمان لەو شوێنە بووین. ئایا شەو بوو؟ راستتر ئەو بوو. ئیدی شەو دەبێتە هاوڕێمان و، مۆڵگەمان و جیهانمان و گۆڕستانمان، ئەمە یەکەم زانیاری بوو کە پێم گەیشت، بەزیندوو مانەوەم و، ئەشکەنجەدانم و گیانەلآم، چەند مەسەلەیەکن لەسەر پەردەی شەو تۆمارکراون، یەکسەر ئەوەم پێزانی، وەک بڵێی هەمیشە ئەوەم زانیوە. ئەو، ئاە لێفە لە تۆزو گەردە چنراوەکەم. چۆڵایەکەم پڕیەتی لە درەختی رەش، بای تەزیویش راستیان ناکاتەوە، تەنها بۆ ئازاردانی قاچم نەبێت، پەنجەکانیشم بەقۆناغی رەشاش داڕزاون، شەو دانەدەهات، وەکو دەڵێن، بگرە لەوآ بوون بەدرێژایی وەخت خۆی لاگرتبوو، سەروەری ئەشکەنجەکانمان پیشانی هەستەکانمانی دەدا، ئەگەر سەرکەوتوو بووینایە لەوەی کە هەستمان بەتاڵکەینەوە، هەروەکو هەندێک وایان دەکرد، لەوانەی ئەشکەنجەدرابوون، چونکە جەستەی خۆیان بەجێدەهێڵن، بەبڕێکی رادەبەدەر لە تەرکیزو هەلیان بۆ دەڕەخسێنآ، کە هەست بە ئازار نەکەن. جەستەی خۆیان بەجێدەهێشت بۆ جەلادەکانیان و، بەردەوام دەبوون لە بیرچوونەوەی هەموو شتآ، دەچون بەلای نوێژکردنەوە، یان تێڕامانێکی هەنووکەییەوە. شەو پۆشاکمان بوو، لەوانەیە لەو دنیا وترابێت کە بەسەرپەرشتی خۆی دەورەی دابووین. هیچ رووناکیەک دیار نەبوو، شوێنەواری تروسکاییەک دیارنیە، بەڵام چاوەکانمان، گەرچی بیناییان لەدەستدابوو، لەسەری راهاتبوون، لە تاریکایدا دەمانبینی، یان پێمان وابوو دەبینین، وێنەکانمان لە تاریکاییدا سێبەری گواستراوە بون ، پێیان لەیەکتری هەڵدەکەوت، یان بەگۆزە ئاوەکان، یان پێیان دەنابە سەر پارچە نانێکی رەقەوەبوو، کە هەندێک هەڵیانگرتبوو بۆ پاراستنی گەدە لە تێکەلڕ هاتن. شەو وازی هێنابوو لەوەی کە شەو بێت، نە رۆژی مابوو نە

**ئەستێرەو نە مانگ و نە ئاسمان، ئێمە شەو بووین، بۆ هەتاهەتایە شەوایەتی جەستەکانمان و هەناسەکانمان و ترپەکانی دڵمان و لەپەکوتێمان، لەم دیوار بۆ ئەویدیکە دەگوێزرانەوە، بەبآ هیچ تەقەلایەک، چونکە رووبەرەکە رووبەری گۆڕی زیندوویەک بوو —هەرچەندآ ئەم وشەیە دەڵێم دەبووایە بمگۆڕیبایەوە بەقووتاربوون-. بەڵام راستیەکەی من زیندوو بووم، ئازاری ژیان دەچێژم بە بەدبەختیە سەختەکەیەوە، لە تاقیکردنەوەیەک کە کۆتایی نیە جگە مەرگ نەبێت —بەڵام ئەو هەمووە- هەرچەندآ ناخۆش بێت- لەژیان دەچن.**

**ئێمە لەپەنای هیچ شەوێکدا نیشتەجآ نەبووین، شەومان شێداربوو، شێدارێکی توند، لینج، پیس، بۆگەن، بۆنی میزی پیاوان و مشکەکوێرەی لێدەهات. شەوێک بوو لەسەر پشتی ئەسپەشێ بۆمان هاتبوو، گەلە سەگێکی هار دوای کەوتبوون، کەواکەی خۆی فرێدایە سەر سەروچاومان و، ئیدی هیچ شتآ سەرسووڕماوی نەدەکردین، کەوایەک تەنانەت کونیشی تیانەبوو کە مۆرانە دروستی کردبێت، نەخێر، کەوایەک بوو لە لمی شێدارو خۆڵێک تێکەلڕ بە ریتنی هەموو جۆرە ئاژەڵێک بوو، بە پێستەکانمانەوە دەنووسا وەک بڵێی رێوڕەسمی لەچاڵنانمان تەواوببوو، نەخێر، باوەز لەپڕێکدا ئەوەندەمان دەداتآ کە دووربین لە ژیان و، نزیک بین لە مەرگ. ئەم کەوایە قورساییەکەی چەندان تەن بوو، نەدیتراو بوو، بەڵام هەست پێکراویش بوو، هەرکە دەستم لێی دەدا پێستەی پەنجەکانم دادەماڵی، دەستم لەپشتم دەشاردەوە بۆئەوەی جارێکی دیکە دەستم بەری شەو نەکەوێت، بەمجۆرە دەستی خۆم دەپاراست. بەڵام هەرچەندآ ساردی چیمەنتۆکە زۆری بۆ دەهێنام دۆخی پاڵکەوتنەکەم بگۆڕم بەویدیکە، لەسەر سک پاڵدەکەوتم، رووخسارم بەزەویەوە دەنووسا، ئێشی تەوێڵم پآ باشتر بوو لە ئێشی دەستەکانم. کەواتە هەلی هەڵبژاردنی ئەوەمان هەبوو کە کام لەو دوو ئێشە چاکترە، بەڵام بەڕاستی دەبووایە هەموو لەش بێشایەت، هەموو بەشەکانی، بەبی جیاوازیی و، گۆڕەکە ئامادەکرابوو (دەربڕینێکی دیکە لە دەربڕینەکانی ژیان، بەڵام دەبآ شتە بچووکەکان لە شتەکانی ژیان بخوازین)، بۆئەوەی لەش بەرگەی ئەم جۆرە ئەشکەنجانە بگرێت و، بیانێژێت و هێواشتر لە هێواشی و، لەژیاندا بمێنێتەوە بۆئەوەی ئەشکەنجەکانی دیکە سەروەر بن.**

**لەڕاستیدا، گۆڕەکە زیندانێک بوو درێژیەکەی سآ مەترو پانیەکەی مەترونیوێک بوو، بەڵام میچەکەی زۆر نزم بوو، بەرزیەکە لەنێوان سەدوپەنجا سانتیمەترو سەدوشەست سانتیمەتر دەبوو. نەمدەتوانی بەپێوە بوەستم، چاڵێک بۆ پیساییکردن و میزکردن هەبوو. چاڵێک نیوبازنەکەی دە سانتیمەتر بوو، بەشێکی جەستەکانمان بوو و، باشتر وابوو زوو لەبیری خۆمانی بەرینەوە، بۆئەوەی بۆنی پیسایی و میز نەکەین، بۆئەوەی بەتەواوی بۆن نەکەین. بۆئەوەی ئەمە بکەین نابآ لووتی خۆمان بگرین، نەخێر، هەرگیز، بگرە دەبووایە لووتمان کراوە بێت و لە بۆنکردن بوەستین، لەسەرەتاوە کارێکی سەخت بوو، مەشقێک بوو دەبووایە بکرابایە، دەبآ تێپەڕیکەین بە هەچ نرخێک بێت، لەوآ بین بآئەوەی لەوآ بین، دەبآ مرۆڤ هەستەکانی خۆی دابخات و بیخاتە سەر ئاقارێکی دیکەو، ژیانێکی دیکەی پآببەخشێت، وەک بڵێی تووڕدرابوومە ئەو چاڵەوە بەبآ پێنج هەستەکەم، ئەمەیش وابوو، خۆم وا پیشان دەدا کە لە دۆلابێک بەئەمانەت دامناون لەوێستگەیەک و، لە جانتایەک رێکم خستوون و، بەپاکی بە لۆکەو ئاوریشم پێچاومنەتەوە، پاشان لەلایەک پاراستوومن، دوور لە دەستی جەلادەکان ، دوور لە دەستی هەمووان، نوشتەی دوارۆژێک وەکو تووڕەکەیەکی لم دەکەوتمە نێو چاڵەکەوە، وەکو رزمەیەک شێوەی مرۆڤی هەیە، دەکەوم و هەست بە هیچ ناکەم، هەستم بە هیچ نەدەکردو لە هیچ شوێنێکمدا هەستم بەئازار نەدەکرد ، نەخێر، نەگەیشتبوومە ئەم جۆرە حاڵەتە، دوای چەند ساڵێکی ئێش وئازار، پێم وایە ئازار یارمەتی دابووم، لەبەر جەختی ئازارەکەو لەبەر زۆر ئەشکەنجەکێشان، بەرە بەرە توانیم، لە جەستەی خۆم جیاببمەوە، تا وای لێهات لەو چاڵەدا بەربەرەکانی دووپشکم**

**دەکرد ، دەفڕیم بۆ ڕۆخی دیکەی شەو ، بەڵام بەرلەوەی بگەمە ئەوەی کە پێی گەیشتم، دەبوو چەند سەدەیەکی زەمەن ڕآ بکەم، لە شەوی ئەو تونێلەی کە کۆتایی نەبوو. قەرەوێلەمان نەبوو، تەنانەت پارچە ئەسفەنجێکیش، وەکو نوێن بآ، تەنانەت کۆمەڵە پووشێکیش یان گەڵای ژاژ کە ئاژەل تیا ڕمبازێن دەکات، هەریەکەمان دوو بەتانیەی خۆڵەمێشیان پآداین و ژمارەی 1936 ی لەسەر چاپ کرابوو، ئایا ئەوە مێژووی دروستکردنیان بوو، یان ئەوەتا نیشانەیەکی تایبەتە بەوانەی کە بەمەرگی لەسەرەخۆ حوکمدراوون؟ بەتانیەی تەنک و ئەستووربوون، بۆنی خەستەخانەکانیان لـآدەهات، وەک بڵێی لە گیراوەیەکی خاوێنکەر هەڵکێشرابون، دەبووایە بەو بۆنە ڕابهاتباینایە، بۆ ڕۆژانی هاوین سوودیان نەبوو، لە زستانیشدا لەسەرما نەیدەپاراستین، یەکێک لە بەتانیەکانم نووشتانەوەو کردم بە نوێنێکی تەسک و، لەسەرلا دەنووستم و، کاتآ بمویستبایە ئەمدیو ئەودیو بکەم. لە خەوەکەم ڕاست دەبوومەوە بۆئەوەی لۆچەکانی تێکنەدەم، هەرکاتآ وام کردبایە، بەتایبەتی لەسەرەتاوە، سەرم دەتەقی بە میچەکەوە. خۆم بەبەتانیەکەی دیکەم دەپێچایەوەو، بۆنی ئەو دەرمانە پاککەرەوەم هەڵدەمژی و، تووشی سەرەیەشەیەکی سەیری دەکردم، بەتانیەکان ژەهراوی بوون! چەند هەستم دەکرد کە زەوی شەق دەبێت و هەڵمدەلووشێت! هەمووشتآ بەووردی حیسابی بۆکرابوو، هەریەکەمان بۆی هەبوو ڕۆژانە پێنج لیتر ئاو بەکاربهێنآ. کآ ئەم ژمارەیەی پآدابوون؟ دیارە پزیشکەکان ئەوەیان نیشان دابوون بەهەرحالێ، ئاوەکە بەتەواوەتی بۆ خواردنەوە شیاو نەبوو ، مەتارەیەکی بلاستیکم هەبوو، ئاوم تیادەکردو ڕۆژێک لـآدەگەڕام تا بنبنێتەوە، لەبن مەتارەکە چینێک قوڕو پیسیی لینج کۆبۆوە. تۆبڵێی لەو حیسابکردنەیان بۆ هەموو شتێک، زەوی زیندانەکەشیان بەکاشیەکی گەورە کردبآ و، دوای چەند مانگێک، یان چەند ساڵێک و بکەوینە خوارەوە بەکۆمەل بۆ ناو چاڵێک کە لەوانەیە یەکسەر لەژێر بینایەکەدا هەڵکەنرابێت؟**

(2)

**لە شەوی 10ی تەممووزی 1971 ساڵەکانی تەمەنم ڕاوەستان، نەچوومە ساڵەوەو، منداڵی خۆم نەبینی، لەوڕۆژەوە تەمەنی خۆم لەکیس چوو، بەسەروچاومەوە دیارنەبوو، لەڕاستیدا من لەوآ نەبووم، تا ڕووخسارێک ببەخشمە تەمەنم، چونکە لەلایەنی عەدەم وەستابووم، لەو شوێنەی زەمەن بوونی نیە، دراوەتە دەم (با)وە، خۆم دابووە دەست ئەو ڕۆخە بەربڵاوەی پڕ لە پەشتەماڵی سپی بو و شنەبایەک دەیانشەکێنێتەوە، بە بەهرە لەئاسمانێکی خاڵی لەئەستێرەکانی، لەوێنەکانی، لەخەونەکانی منداڵیی کە پەناگای بوو، لەهەموو شتآ خاڵی، تەنانەت لە خودایش، پەنام بردە بەر ئەولایە بۆئەوەی فێری لەبیرچوونەوە ببم، بەڵام سەرکەوتوو نەبووم. ڕۆژێک بۆئەوەی بەهەموو خۆمەوە لەعەدەمدا نیشتەجآ بم و، تەنانەت بە بیرکردنەوەیش. بەدبەختی وەکو بەڵێنێک بۆم هات، وەکو زریانێک، لەڕۆژێکدا ئاسمانەکەی شین بوو، هێندە شین بوو، چاوی لێلڕ کردم بۆ چەند ساتەوەختآ بینابیم کوێربوو، و سەری حەپەساوم وا لار بوەوە وەک بڵێی خەریک بوو بەردەبوەوەو، زانیم کە ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی شین خەڵتانی خوێن دەبێت، لەناخی خۆشمدا لەوە دڵنیابووم، تەنانەت خۆم دەستنوێژم گرت و نوێژم کرد لەو سووچەی کە زۆر کش و مات بوو، تەنانەت ڕکاتێک زیاتر نوێژم کرد، وەکو ماڵئاواییەک لە ژیان و بەهارو خێزان و برادەران و خەونەکان و زیندوەکان. لە گردەکەی بەرامبەر ماکەرێک بە نیگایەکی کەیل و خەمبار سەیری دەکردم. وەکو خووی ئاژەڵەکانی دیکە کە بەزەییان بە مرۆڤدا دێتەوە. لەبەرخۆمەوە وتم: "هەر هیچ نەبی ئەو نازانآ کە ئاسمان شینەو، ئەویش نیە کە خوێنی دەڕژێت".**

**کاَ لە ئێمە دیوارەکانی کۆشکی (سیخێرات)ی سپی بیردەکەویتەوە؟ کاَ خوێنی سەر چەرچەفی سەرخوانەکانی لەبیرەو، خوێنی سەر گیاوگژی سەوزی بە بلّقی باخچەکە؟ لەپڕێکا ڕەنگەکان بوونە تێکەڵەیەکی کوت وپڕ. شینایی لە ئاسمان نەماو سوورایش لە جەستەکان نەما، خۆر خوێنەکانی بەخێراییەکی ڕچاونەکراوەوە دەلستەوە، بەلاّم ئێمە فرمێسک بەری چاوی گرتبووین، فرمێسک سەربەخۆی بەخوڕ دەهاتە خوارآ و دەستی تەڕدەکردین کە توانای چەک هەڵگرتنیان نەبوو. لەشوێنێکی دیکە بووین و، لەوانەیە لەودیویشەوە بووینایە، لەوشوێنەی کە چاوە شڵەژاوەکان سەروچاو بەجێدەهێڵین و لەپشتی ملەوە جێگر دەبن. چاوەکانمان سپی بوون، ئیدی نە ئاسمان دەبینی و نە دەریا. شنەبای فێنک سەروچاوی ختووکە دەداین، لەولاشەوە دەنگی تەقە بەبآکۆتایی دەنگی دەدایەوە و، بۆماوەیەکی دوورودرێژ ڕاوەدوی دەناین، دوای ئەوەیش گوێمان لە هیچ نیە، گوێیەکانمان تێدا نیشتەجآ بوون، نازانم ئایا خۆمان دایە دەستی یەکەکانی گاردی پاشایەتیەوە، کە یاخیبووەکانی ڕاوەدوودەنا، یان ئەگەر دەستگیرکراین و چەک کراین لەسەردەستی ئەو ئەفسەرانەی کە هەڵوێستی خۆیان گۆڕیبوو بەپآی ئاقاری هەڵکردنی (با) یەکان. هیچ ڕەئێکمان نەبوو، تەنها سەرباز زیاتر هیچی دیکە نەبووین، داشی دامە بووین، دەرەجەدار بووین، بآئەوەی دەرەجەکەیان سەرپشکیان بکات تا دەستپێشخەربن، چەند جەستەیەک بووین لەو گرەی هاوینەدا هەستمان بەسەرما دەکرد. دەستمان لەپشتمانەوە بەسترابوونەوە، ئێمەیان لە لۆریەکان پەستانبووەوە لەگەلڕ مردوو و بریندارەکاندا، سەرم لەنێوان دوو سەربازی کوژراودا هەڵواسرابوو، هەرچییەک بآ کە لەچاوم دەچۆڕآ، بەخوێنێکی گەرم وگوڕ دەچێت، هەردوو سەربازە کوژراوەکە لەکاتی مردنیان میزو پیسایی خۆیان شل کردبوو، بەلاّم، ئایا ئەوەی وەکوو من بوو هەقی ئەوەی نیە کە بێزی بێتەوە؟ جارێکیان ڕشامەوە، دەبآ ئەو مرۆڤەی کە خوێنی کەسانی دیکە لەسەر سەروچاوی دەڕوات لەچی بیربکاتەوە؟ لەو ماکەرەی سەر گردەکە، لەو منداڵەی کە دەوری سوار دەبینآ و شمشێرەکەی داردەستەکەیەتی، لەوانەشە هەرگیز بیرنەکاتەوە، هەوڵدەدات لە جەستەی خۆی دەرچێت و، لەوآ نەبێت، هەوڵدەدات بڕوابکات ئەو خەوتووەو کە ئەوەی دەیبینآ خەونێکی زۆر زۆر ناشیرینە، نەخێر، دەمزانی کە ئەوە خەون نیە، بیرکردنەوەکانم ڕوون بوون و، هەموو ئەندامەکانم بەهێزەوە دەلەرزین، لووتی خۆم نەگرت، بگرە پڕ بە سییەکانم ڕشاونەوەو مەرگم هەڵدەمژی. دەمەوآ بەتاساوی بمرم، هەوڵمدا سەرم بخەمە ناو ئەو کیسە پلاستیکەوە کە لە نزیک لاشەکان دانرابوو، ئەم هەوڵدانەم تەنها بووە هۆی وروژاندنی تووڕەیی یەکێک لە سەربازەکان و خێرا پآلەقەیەکی کێشا بەملمەدا، لەهۆش خۆم چووم، بۆنی تەرمەکانی دەوروبەرم ڕەوینەوە، بۆنی هیچم نەدەکرد، وەک بڵێی قوتار بووم، بەلاّم کێشانی قۆناغە تفەنگێک بەسەر ئێسقانی قاچمدا بەئاگای هێنامەوە. لەکوآ بووین؟ سەرمایەکی تەزێنەر بوو، دەشآ لە تەرمخانەی نەخۆشخانەی سەربازیی بووین لە (ڕەبات)، هێشتا دەست بە جیاکردنەوەی زیندوو و مردووەکان نەکرابوو، هەندێک دەیاننالاّندو هەندێکیش سەری خۆیان دەکێشا بەدیوارەکەوەو، نەعلەتیان لە چارەنووس و ئایین و سوپاو خۆر دەکردو، هەندێک دەیانووت کە کۆدەتاکە بەهۆی خۆرەوە شکستی هێنا، چونکە خۆرەکە سووتێنەر بوو، لەپێویست زیاتر گەشتر بوو، و هەندێک هاواریان دەکرد: "ئەمە چ کۆدەتایەک بوو؟ دروشمەکەمان تێکەل بە خوێنمان بوو "خودا، نیشتمان، شاه"، وەک بڵێی ئەوانە ئەو دروشمەیان دەووتەوە، وەکو پاشبەندێک، سروودێک، پێیان وابوو بەوە کەفارەتی خیانەتەکەیان دەدەنەوە. بێدەنگ بووم، بیرم لە هیچ نەدەکردەوە، هەوڵمدەدا لە عەدەمدا لەناو بچم و، گوێم لە هیچ نەبی و هەست بە هیچ نەکەم.**

(3)

**لە بەشی (ب) بیست وسێ كەس بووین و، بۆ هەریەكێكمان لە زیندانەكە كونێك لە زەوییەكە هەڵكەنرابوو بۆ پێشاو، لێرەدا كونێكی دیكە هەبوو لەسەر دەرگا ئاسنەكە بۆ هاتنەژوورەوەی هەوا، ناومان نەبوو، نە رابردوو نە ئایندەمان نەبوو، هەموو شتێكمان لێسەنرایەوە، تەنها پێستە و سەرمان پێوەمایەوە، هەمووومان نا، ژمارە (12) یەكەم كەس بوو كە ئەقڵی لەدەستدا، ئیدی بووە پشتگوێخراو، قۆناغەكانی سووتان، چووە قوژبنی ئازاری گەورەو سەری بەجێهێشت، یان ئەوەی لە دەرگای سەربازگاكە پێی مابوو، هەندێ دەیانووت گوایە بینیوویانە سەری داچەماندوەو، وەك بڵێی سەری خۆی دادەكەنێت، پاشان چەمیوەتەوە بۆئەوەی لەنێوان دوو تاشەبەردا بیشارێتەوە، بەرەهایی هاتەژوورەوە، هیچ خۆی لێنادات، بەبرانەوە لەگەڵی خۆیدا قسەی دەكرد، تەنانەت لەكاتی خەویشدا لێوەكانی بەچەند وشەیەكی نەزانراو ورتەورتیان بوو. ئەوەمان رەتدەكردەوە جگە لە ناوەكانی خۆمان و نازناوەكانمان بانگی یەكتر بكەین، ئەمەمان لێقەدەغە نەبوو، ژمارە (12) ناوی (حەمید) بوو، لاوازو بالابەرزو رەنگ زەرد بوو، كوڕی یاریدەدەرێك بوو لە جەنگی هیندی چینیدا باڵێكی لەدەستدابوو، ئیدی سوپا فێركردنی منداڵەكانی گرتەئەستۆ، كە هەموویان چوونە ریزی سەربازیەوە، حەمید ویستبووی ببێتە فڕۆكەوانی مەدەنی و خەونی بەوەوە دەبینی ریزەكانی سوپا بەجێبهێڵێ. مەحاڵ بوو لەكاتی رۆژدا شتێك بێدەنگی كات، وڕێنەكەی هەندێ دڵنیایی بۆ دەهێناین، هێشتا توانای كاردانەوەمان هەبوو بۆ ئارەزووكردن لە بیستنی قسەی مەنتقی، دەربڕینەكان هانی دەداین بۆ بیركردنەوە، یان زەردەخەنە یان دوعاكردن. دەمانزانی كە حەمید لەشوێنێكی دیكەیە، ئەو بەجێی هێشتووین، ئێمەی نەدەبینی، حەمید، بەوجۆرە بوو، تەنانەت ئایندەی ئەگەریمان بوو، تەنانەت كە بەگوێماندا دەدەن، ئاینده بەلامانەوە واتای نەبوو، بوونی نەبوو، لەوانەیە دكتۆرەكان بەئەنقەست دەرزیەكی بێهۆشیان لێدابی بۆئەوەی شێت بێ، پاشان وەكو نموونەیەكی زیندوو بۆ لای ئێمەیان ناردبوو، كە ئەمە چاوەڕێمانە. ئەم جۆرە مەسەلەیە شیاون، چونكە ئەو چەند مانگەی كە لە زیندانەكان بەئەشكەنجەوە بەسەرمان بردن هەندێكمان ژیانی لەدەستدا و، هەندێكی دیكەمان وەكو حەمید ئەقڵی لەدەستدا، زایەڵەی دەنگی ناوەناوە بە تاریكیدا دەنگیدەدایەوە، ئەو وشەیەی دەیووت تێدەگەیشتین، یان هەر دەربڕینێك: (براشە)، (بو و بو و ئەلهوی)، (بش معقول)، پۆپلین)، (بریە گفل)، (بباس)، (برچ)، (بریج جدا)، (بوت من بوع و بگش)(*).. ئەو رۆژە دەبووە رۆژی پیتی (ب)، پاسەوانەكان لێی دەگەڕان وەكو خۆی هیوایان ئەوەبوو گەورەبوونی تووڕەییمان ببێتە هۆی ئەوەی بوونی لەنیوانماندا زۆرتر ناڕەحەت و بەئازار بێت.. بۆئەوەی نەكەوینە داوی گەمەكەیانەوە، (غەربی) ژمارە (10) قورئانی دەخوێند كە لەبەری بوو. ئەویش وەكو هەموومان لە قوتابخانەی قورئان، قورئانی خوێندبوو.**

**بەڵام ئەو بەپێچەوانەی ئێمە بوو، خۆی ئامادە دەكرد ببێتە موفتی سەربازگەكە، تەنانەت لە پێشبڕكێیەی قورئان خوێندندا بەشداری كردبوو، خەڵاتی سێیەمی وەرگرتبوو، موسوڵمانێكی پیاوچاك بوو، نوێژەكانی لەكاتی خۆیدا دەكرد، هەمیشە پێش خەوتن ئایەتی قورئانی دەخوێندو، لە قوتابخانە قوتابیانی ئەفسەران نازناوی (ئوستاد)یان پێی دابوو. هەركە ئوستاد دەستی بە قورئان خوێندن دەكرد، دەنگی حەمید بەرەبەرە كز دەبوو، تا بەتەواوەتی بێدەنگ دەبوو، وەك بڵێی خوێندنەوەی كتێبی پیرۆز ترسی ئارام دەكردەوە، یان بەلانی كەمەوە، وڕێنەكەی دوادەخست، هەركە ئوستاد دەگەیشتە كۆتایی خوێندنەوەكەی و دێڕی (سەدەقە ئەڵاوئەلعەزیم)ی دەوت، تا حەمید بەحەماسەتەوە خوتبەی دەدا، بەهەمان ریتمی بەجەخت و هەمان پەشۆكاویەوە، كەسیش جورئەتی ئەوەی نەبوو خۆی تێهەڵقورتێنێ، پێویستی بەوە بوو ئەم هەموو گوزارشتانە بەعەرەبی و بە فەرەنسی دەربێنێ، وەك بڵێی ئامرازی خۆی بوو، بۆئەوەی**

بەجێمان بهێڵێ و خۆی لێمان دابڕێت، چونکە بانگی مەرگی خۆی دەکرد، هەرکە تووشی پەلەقاژەکە بوو مەرگی بۆهات و سەری خۆی چەند جارێک کێشا بەدیوارەکەوەو لەقیژەی خۆی بەردەوام بوو، پاشان نە دەنگ و هەنیسکی نەدەبیسترا، ئوستاد فاتیحای خوێند، بگرە تەجویدێکی وتەوەو، سروودەکەی جوان بوو، پاشان بێدەنگیەکی ترسناک باڵی کێشا.. ئوستاد هەڵبژێردرا بۆئەوەی لەگەڵ پاسەوانەکاندا دانوستان بکات دەربارەی تەگبیرکردنی بەخاک سپاردنی حەمید، دانوستانەکە بەگڕ وگۆڵ و دوورودرێژ بوو. چونکە مەسەلەکە بەرزدەکرێتەوە بۆ فەرماندەی سەربازگەکەو، ئەویش چاوەڕێ دەکات تا وەڵام لە پایتەخت دێتەوە، ویستیان تەرمەکە بەبێ ڕێورەسم فرێدەنە چاڵێکەوە، بەبێ نوێژو بێ قورئان خوێندن. یەکەم کردەوەی بەرگریکردنی ئێمە داوامان کرد، کە هەریەک لە ئێمە بەشێوەیەکی شایستە بەخاک بسپێردرێت، ئێمە بیست ودوو کەسەکە بووین، لەدەوری ئەو تەرمە کۆبووبووینەوە، کە هێشتا دەنگی لەگوێماندا مابوو. بە سوونەتی ئیسلام پاکانەمان هێنایەوە کە نابێ ناشتنی مردوو دوابکەوێت، چونکە نابێ لە یەکجار زیاتر خۆر لەسەر مردوو ئاوابێت، بۆیە دەبێ پەلەبکرێت لە ڕێورەسمی بەخاکسپارن، و هەروەها هاوینەکەیش تاسێنەرە بوو، لە مانگی ئەیلوول بووین و تەرمەکە زوو بۆگەنی دەکرد.

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر ڕێورەسمی بەخاکسپاردن بەڕێوەچوو، سەرەڕای باروودۆخەکە، بەختەوەر بووین، ڕووناکی ئاسمانمان دوای چل وحەوت ڕۆژ تاریکی بینی. پێڵوەکانمان پرتەپرتیان بوو، وایکرد هەندێکمان بگرین. ئوستاد سەرپەرشتی ڕێورەسمەکانی کردو، داوای ئاوی کرد بۆ شوشتنی مردوەکەو، خامی سپی بۆ کفنەکەی. ئەوەیش هەلێکی ڕەخساو بوو، بۆئەوەی هەریەک لە ئێمە، ئەو شوێنە دیاری بکات کە لێیەتی، بۆ خاڵی دیاریکردن دەگەڕام، بەشەکەی ئێمە بە شوورایەکی قایم و، بەلانی کەمەوە چوار مەتر بەرز دەوروەدرابوو، مەسەلەیەکی بێگومانیش هەبوو: کە ئێمە لەدەریاوە نزیک نەبووین، لەدەوروبەری سەربازگەکە چیای خۆڵەمێشی رووتەڵە هەبوو، یەک چڵە درەختی لێنەبوو، سەربازگەیەک بوو لەدوورەوە دیار بوو، عەدەم، چۆڵی، زیندانەکەمان نیوەی لەژێر زەوی بوو، پاسەوانەکان لە دوو مەخفەری بچووک بوون، لە دووری چەند سەد مەترێکەوە، لەو شوێنەی کە ئێمە (حەمید)مان لێ بەخاک سپارد.

بەدرێژایی سەعاتێک یان کەمتر، هەردوو چاوەکانم بەکراوەیی هێشتەوەو، دەمم دابچڕیبوو، بۆئەوەی تا دەتوانم ڕووناکی هەڵمژم، بۆئەوەی ڕووناکی هەڵمژم و لەناوەوەمدا عەمباری بکەم، وەکو پەنایەک بۆ خۆمی بیپارێزم، تا بیری خۆمی بخەمەوە هەرکە ئەو تاریکیە قورسە خۆی هاویشتە سەر پێڵوەکانم، لەشی خۆم بە ڕووتی هێشتەوە، بۆئەوەی پێستەکەم تێری ڕووناکی ببێت و، وەکو شتێکی گرانبەها عەمباری بکات، بەڵام یەکێک لە پاسەوانەکان فەرمانی پێدام کە کراسەکەم لەبەر بکەم، لە ئێوارەدا شەرم دایگرتم لەو دڵخۆشیەی کە بەخاکسپاردنی یەکێک لە هاوەڵەکانم بۆی هێنام. تا ئەم ڕادەیە بەخەستی بەزەییم لەدەست دابوو، دڵڕەقی گەیاندمیە ئەو ڕادەیەی کە داوای سوود بکەم لە مردنی یەکێکمان؟ ڕاستیە تاڵەکە، بە ڕووت و قووتی لەبەرامبەرم وەستاوە، ئەگەر مەرگی نزیکێکم هەلی بینینی خۆری بۆ ڕەخساندم بۆ چەند ساتەوەختێک، ئایا ئەمە وام لێدەکات بۆ کۆچ کردنی بەتاسەوە بم؟ تەنها من نەبووم ئەم بیرۆکانەی بۆ هاتبوو، (ئیدریس)یش ژمارە (9) جورئەتی ئەوەی کرد ئەوە دەربڕێت: بەخاکسپاردن بەلای ئێمەوە بۆنەیەک بوو بۆ دەرچوون و بینینی تروسکاییەک ڕووناکی، ئەمە پاداشتی ئێمە بوو، هیوای نهێنیمان بوو، ئەو هیوایەی کە بە وشە جورئەتی دەربڕینیمان نەبوو، بەڵام بەبیرماندا دەهات و مەرگ بووە تیشکی خۆرێکی بەشەوق. بەتەئکید ئەوان ئێمەیان فرێدابووە ئەوێوە بۆئەوەی بمرین و، پاسەوانەکانیش بۆیە لەوێ بوون تا ماوەیەکی درێژتر لەوێ بمێنینەوە، جەستەکانمان دەبووایە بەرە بەرە تووشی داوەشان ببن، تا ماوەی ئەشکەنجەمان درێژتر بێ، بۆئەوەی لەسەرخۆ تەشەنەبکات، بۆئەوەی ئەندامێک لەبیرنەکرێت، یان پارچەیەک لە پێستە، تا لە پاژنە پێیەوە تا

نووکی قژەسەر لە توێیەکانەوە، لەنێو چرچیەکان ڕآ بکات و، وەکو دەرزی لێی بچەقێت و بەدوای دەمارێکەوە بگەڕێت بۆئەوەی ژەهرەکەی خۆی تآبکات. با مەرگ بێت، زیندوەکان بۆی لەمەڵاسدا بن بۆئەوەی رۆژ ببینن! دروستکراوەکەی دەستی پێکرد. حەمید دەستپێشخەر بوو، بۆئەوەی مشتآ رووناکیمان بداتآ، دیاری ئەو بۆ ئێمە ساتی ماڵئاواییکردنی بوو، ئەو بآ ئازار کۆچی کرد، یان بەلانی کەمەوە بآ ئازار بوو. دوای ئەوە ساڵێکمان لەو چاڵەدا بەسەربرد، ئەو پرسیارەی کە هەریەکێک لە ئێمەی سەرسوڕماو کردبوو: "ئێستا نۆرەی کاممانە؟"، من هەندآ راست کردنەوەی خۆم هەبوو. ئەویش ئەوەبوو کە (ئیدریس) تووشی نەخۆشی ماسوولکەو ئێسقان هاتبوو، ئەسڵەن لەشوێن خۆی نەبوو کە لەگەلڕ ئێمەدا بێت، بگرە دەبوو لە نەخۆشخانەی سەربازی بووایە لە (ریبات)، بەڵام فەرماندەی تیپ ئەوەی لەبیرکردبوو، لەسەری نووسرابوو کە لەگەلڕ ئێمە راپێچ بکرێت و لە بەندیخانەدا، لەژێر زەوی بمرێت. هەردوو قاچی لاواز بوون و چەمابوونەوەو بەسنگیەوە نووسابوون و، ماسوولکەکانی نەرم ببوونەوە، نەیدەتوانی تەنانەت دەستیشی هەڵبڕێت، پاسەوانەکان ڕێگایان داماَ کە خواردن بکەم بەدەمیەوەو، بۆ سەر پێشاویش یارمەتی بدەم، نەیدەتوانی پاروو بجوێت، بگرە پاروم بۆ دەجوی و دەرخواردیم دەدا لەگەلڕ قوومە ئاوێکدا. جاری وابوو سوورهەڵدەگەڕاو نەیدەتوانی بکۆکێت، دەچەمایەوەو سەری خۆی دەخستە نێو هەردوو رانیەوەو بەسەر زەویەکەدا خل دەبوەوە، بۆئەوەی ئاوەکە رێچکەی بۆری گەدەی بگرێت، لاوازی وای لێکرد بەچۆلەکەیەک دەچوو پەڕوباڵی بەردابێت. بەباشی نەمدەتوانی چاوەکانی ببینم، دیار بوو کزبوون، بۆش بوون، بەچوارمشقی دەخەوت و سەری دەدایە دیوارەکەوە، هەردوو دەستی دەخستە ژێر پێیەکانیەوە، ئەم دانیشتنەی بەمشێوەیە پێویستی بە کات و هەوڵدان بوو، بەڵام دۆخێک بوو هەلی خەوتنی بۆ دەرەخساند بآئەوەی لە جومگەکانیدا هەست بە ئازار بکات، پاشان بەرە بەرە مەلەکەتی قسەکردنی لەدەست دا، دەبووایە بلْمەبلْمەکانیم بخەملاندایە، باش دەمزانی بۆ خۆی داخوازی مەرگی دەکرد، بەڵام نەمدەتوانی لەوەدا یارمەتی بدەم. ئەودەمە ئەگەر حەبێکی شینم پآبووایە کە ئیسراحەتی بداتآ لەوانەیە پێم بدایە، لە دوارۆژەکانیدا نانی نەدەخوارد، هەستم کرد کە مەرگ لەنێو چاوەکانیدایە، هەوڵێدا شتآ بڵێت، دەشآ ژمارەیەکی دەووت، هەستم کرد ژمارەی چلە، دیار مەرگ چل رۆژ دەخایەنێت تا هەموو جەستە داگیردەکات، بەڵام لەحاڵەتی ئەودا، مەسەلەکە کەمتری خایاند. لەکاتی شووشتنی دا زۆر ئازارم کێشا، ئەژنۆکانی ئەوەندە چەمابوونەوە لە سنگی چاڵێکیان دروستکردبوو، پەراسووەکانی لە جومگەکانی چەقیبوون، زەحمەت بوو هەردوو قاچی، یان هەردوو دەستی راست بکرێنەوە، جەستەی تۆپێکی هەڵزەپاوی ئێسک بوو، کێشی لە چل کیلۆ کەمتر بوو، بووبووە شتێکی سەیرو بچووک، هەموو خەسڵەتێکی مرۆڤایەتی لەدەستدابوو، چونکە نەخۆشی هێندە نابووتی دابوویە، خەریک بوو لەشوشتنەکەی دەبوومەوەو، دوو پاسەوانەکە پاڵیان پێوەنام و تەرمەکەیان خستە سەر دارەمەیتەکەو، بردیان دوای ئەوەی منیان گەڕانەوە بۆ زیندان، حەپەسابووم، بەڵام بەرلەوەی شتێک بڵێم هەردوو پاسەوانەکە لەچاو وون بوون.

( 4 )

زۆرترین مەسەلە ئاساییە پڕوپووچەکان، لەتەنگانەی سەختدا دەبنە نائاسایی، بگرە زیاتر ئەو مەسەلە دنیاییانەی کە حەزی لێیەتی.. دەسبەجآ هەستم کرد کە هیچ هەڵبژاردنێکی دیکەمان لەبەردەم نیە، دەبآ واز لە هەوڵە ئاساییەکانی رۆژانەکانمان بهێنین، لەبیریانکەین و، لەبەر خۆمانەوە بڵێین: "ژیان کەوتە پشتمانەوە"، یان: "لە ژیان

دەرهێنراین" و لە هیچ پەشیمان نەبین و لە هیچ گازندە نەکەین و، بچووکترین داخوازیش داوانەکەین، ژیان لەودیوی دیکەی شوورا دوولاکەیە کە گۆڕێچەی سەربازگاکەی داوە، دەبآ دەسبەردای خووەکانی ژیان ببین، کە پێویستیان بە مەشق و خۆڕاگری هەیە، وەک بڵێی فێری ئەوە بین، بۆ نموونە کە ڕۆژەکان و شەوان تێکەڵ بوون و، لەسەرەتا قێزەوەنەکانیشیاندا لە یەک دەچن: وازم لەوە هێنا لەوەی کە وەکوو جاران بین: بەیانی لەخەو هەڵسین و لەرۆژی دواتر لە شتە کوت وپڕ شاراوەکانی بیربکەینەوە، بچینە ژووری خۆشتن و لەناو ئاوێنەدا چاو ببڕینە سەروچاوی خۆمان ، کە چارە گرژکردنێکی گاڵتە پێکردنمان ـلأبەدیار دەکەوێت ، بەرامبەر بەو ڕۆژگارەی کە بەناچاریی هەندآ شوێنەوار لەسەر پێستەمان بەجێدەهێڵآ، کەفە سابوون دەدەین لەسەروچاومان و ریشمان دەتاشین و، بیرکردنەوەمان دەچێت بەلای چەند مەسەلەیەکی دیکەوە، مزەمزێکی گۆرانی و بەفیکە ئاوازێک لێدەدەین. پاشان دەچین بۆ لای دووشەکەوە، چارەکە سەعاتێک، لەژێر ئاوەکەی دەمێنینەوەو، بۆئەوەی لەزەتێکی بچووکمان دەست کەوێت، لەزەتێک هەردوو شانمان رێژنەیەکی ئاوی گەرمیان بەرکەوێت، جەستەشمان بە سابوونی بۆنخۆش دەشۆرین، پاشان خۆ وشککردنەوەو، لەبەرکردنی کلسونێکی پاک و خاوێن و، کراسی باش ئوتوکراو، پاشان هەڵبژاردنی قات و بۆینباغ و پێڵاو و، خوێندنەوەی رۆژنامەو خواردنەوەی فنجانێک قاوە. واز لەو مەسەلە بچووکانە بهێنین و تەماشای دواوە نەکەین. ئەم سیناریۆیە بگۆڕین و ئەو هەموو شتانە بخەینە بەرچاوی خۆمان، کە لەئێستاوە تا دوایی لێمان روونادەن، چۆن رابێین کە دانەکانمان نەشۆرین. لە دەممانددا بۆنی فلۆری قەشەنگ نەکەین، بۆنی هەناسەی ناخۆش و ئەو بۆنانە بکەین، کە لە جەستەی پشتگوێخراوەوە دێت بە گژماندا.. رۆژانە ئەو پێنج لیترە ئاوەم نزیکەی هەمووم بۆ خۆشوشتن بەکاردەهێنا، خۆشوشتن سەرەڕای هەموو بارودۆخێک فەرزێکی پێویست بوو، پێم وابوو ئەگەر ئاو نەبووایە بەتەواوی هەرەسم دەهێنا، وریای دەسنوێژگرتن بووم بۆ نوێژکردن. بۆئەوەی هەست بکەم پاک وخاوێنم، بەتانیە وەکو خاولی بەکارنەهێنم. بەڵکو دەبێ چاوەڕێ بم تاوەکو دڵۆپە ئاوەکان خۆیان وشک دەبنەوە. ئەم مەشقکردنە کاتێکی درێژی ـلأگرتم، بەڵام سوودەکەی زۆر گەورە بوو، خۆم وا لەقەڵەمدا کە گەڕێنراوەتەوە بۆ سەردەمی ئەشکەوتەکان و، دەبآ فێری داهێنانی هەموو شتآ بی بە ئامرازی کەمتر لە کەم.

لەسەرەتاوە، بۆئەوەی دڵی خۆم بدەمەوە، وام خەیاڵ دەکرد کە ئاگاداری رادەبەدەری خودواوەند بۆ رزگاربوونم موعجیزەیەکم بۆ دەنێرێت ، هەروەکو ئەو کۆتاییە بەختەوەرانەی کە لە فیلمە ئەمریکیەکاندا روودەدەن، پاشان شێوەی گریمانەی ماقووڵم دەهات بەبیردا، کە بوومەلەرزەیەک رووبدات، هەورەتریشقە بدات لە پاسەوانەکان، کاتآ بۆ جگەرەکێشان لەژێر درەختێکدا کۆبونەتەوە ، یان فەرماندەی سەربازگەکە، قوماندار کە لەخەویدا تەنها خەونێک دەبینآ و، لەئاسمانەوە دەنگێکی بۆ دێت، فەرمانی دەداتآ کە لە سەرۆکەکانی یاخی بێت و بەرەڵامان بکات، ئەگینا ژیانە کلۆڵەکەی لەلایەن خوداوەندەوە سزادەدرێت. بەڵام ئاگاداری خوداوەند گوێی بە چارەنووسی ئێمە نەدەدا، گاڵتەی پآدەکردین، گوێم لە قاقای پێکەنین و شۆڕشی تووڕەیی بوو. لەکاتێکدا نووقمی زیندەخەونەکانم بووم، دوو پاسەوانەکە دەرگای زیندانەکەمیان کردەوەو بەرەولامان پەلاماریان دا. تا منیان خستە ناو توورەکەیەکی پانەوەو، توورەکەکەیان بەرەو دەرگای دەرەوە راکێشا. بۆشایەکەم بە قاچ بەرلەقە دەداو، هاوارەکەم بە تەشەری هەردووکیان دەتاسا: ئەوەتا ئەمە بەزیندوو دەخەینە چاڵ، ئەمەیش رەوشتی باشتان دەداتآ. زیندانیەکان دەیانقیژان بە کۆی دەستەکانیان لەدەرگاکانیان دەدا. بەهەموو هێزێکمەوە لەناو توورەکە ئەستوورەکەدا پەلەقاژەم دەکرد. لە پڕێکا ئەوەم بۆ هات فاتیحایەک بخوێنم، ئەمەیش هێزێکی نائاشنای دامآ، بەئایەتەکان دەمقیژاند تا هەموو بێدەنگ بوون، خەریک بوو دەگەیشتنە ئەوسەری رێپێلگەکە بەرەڵایان کردم، گوێم ـلأبوو یەکێکیان بەهاوڕێکەی دەوت کە ئەوان هەڵەیان کردووە:

-نەخێر ئەرکی خۆمان بەجێهێنا..

بەڵام قوماندار سووربوو کە خۆی بەدەستی خۆی چاڵی بۆ هەڵکەنین.

-نەخێر تەنها وێنەیە، مەبەست تەنها بیانترسێنین.

-پێموانیە.

-بەڵێ، فەرمانی کوشتنمان پێ نیە جگە لە حاڵەتی هەوڵدانی راکردن نەبێت.

-ئەی ئەحمەق، دەبووایە ئەمەت دروست کردبایە!

-نەخێر، تۆ هیچ تێنەگەیشتیت.

" -باشە، با مەسەلەکان لەلای قوماندار روون ببنەوە."

لەکاتێکدا ئەوان دەمەقاڵێیان بوو، منیش قورئانم دەخوێند، پاشان تووڕەکەکەیان کردەوەو منیان گەڕانەوە بۆ زیندان. هەرکە گەڕامەوە بۆ ئینفرادی پێکەنین و قاقایەکی تووڕەییانە منی داگرت، نەمتوانی خۆم بگرم یان تۆزێک سووکیان کەمەوە، پێدەکەنیم و پێدەکەنیم و بەپێ دەمکێشا بە زەویەکەدا، دەمزانی ئەوە تەنها بۆ تووڕەکردن و تۆقاندنمان بوو. شانی راستم ئازاری دەدام، دیاربوو لەکاتی پەلەقاژێم لەناو تووڕەکەکەدا بەر بەرد کەوتبوو، ئەوان بەتەواوی سەرپشک کرابوون بۆ جووڵانەوە لەگەڵماندا، چی رێگایان لێدەگرێت ئەگەر هاتنەوە بۆ راپێچکردنی کەسێکی دیکەمان و، وا خۆیان نیشان بدەن کە دەیانەوێ لەناویببەن، یان فڕێیدەنە چاڵێکەوە، یان تووشی سزای خستنەچاڵەوەی بکەن، کە لە سوپادا سزایەکی باوە، دەست و قاچی دەبەستنەوەو دەیخەنە چاڵێکی خۆڵەوەو دایدەپۆشن و تەنها سەری بەدەرەوە دەبێت، لەبەر خۆری هاوین یان بارانی زستاندا، لەوانەیە گاردەکانمان لیستێکیان پێبوو ژمارەیەک شێوەی بەدڕەفتاری تیابوو، بەپێی ئارەزووی خۆیان بەسەرمانیدا دەسەپێنن. بەڵام ئەوەی بووە مایەی گاڵتەپێکردنم، دوای چەند رۆژێکی کەم، ئەو دوو پاسەوانە ناوبراوە دایان لە دەرگای زیندانەکەم و لێم دەپاڕانەوە کە رقم لێیان نەبێتەوە: "لەراستیدا هەڵەیەک روویدا. کاتێ کەسێک نەخۆش دەکەوێت یان دەمرێ فەرمانمان پێدەکرێت کە لەناوی بەرین. بۆیە گوێ لەم ئامۆژگاریە بگرە: نەخۆش مەکەوە، بەڵام ئەگەر مردیت ئەوە مەسەلەکە لەنێوان خۆت و خوایە. بەهەرحاڵ بە نەخۆشی یان بێ نەخۆشی کەس لێرە بەزیندوویی ناچێتە دەرەوە، کەواتە لەبەرژەوەندیتە تەندروست بی."

وەڵامم نەدانەوە، دیاربوو لە رواڵەت قسەکەیان بۆ من بوو، بەڵام قسەکەیان بۆ هەمووان بوو. هێشتا لەژێر کاریگەری شۆکی گواستنەوەبووین لە بەندیخانەیەکەوە بۆ یەکێکی دیکە، بەڵام دەسبەجێ لەبەرخۆمەوە راستم کردەوە :ئێرە، لە بەندیخانە نیم، لێرە، زیندانی بوونی نیە کە دەبی ماوەیەکی دیاریکراو لە بەندیخانە بەرێتەسەر. من، بگرە ئێمە، زیندانی هەتاهەتایین و رێگای دەرچوونمان نیە. ئەمەیش چیرۆکی (بابێون)ی بیرهێنامەوە، ئەو زیندانیە فەرەنساییە کە توانی لە زۆر بەندیخانەی سەخت لەجیهاندا هەڵبێت. بەڵام من (بابێون) نیم و، نە گوێیش هەرگیز دەدەم بە کابراو چیرۆکەکەی. لێرە، هیچم لەبەردەمدا نیە، یان هیچمان لەبەردەمدا نیە، جگەلەوەی کە بەرگری بکەین. ئێمە لەحاڵەتی جەنگداین لەگەڵ دوژمنێکی نەبینراوی تێکەڵ بە تاریکیی، خەریکە دەبێتە تاریکیی، ئایا وتم "دوژمن؟" راستی دەکەمەوە: لێرە، دوژمنم نیە. دەبێ قەناعەت بەوە بهێنم: نە هەست، نە رق، نە دژ. خۆم بەتەنیام و،

**بەتەنیام و لەوانەیە دوژمنی خۆم بم، واز لەوەش دێنم، ئەمانە هەمووی دەخەمە خانەیەکی داخراوەوەو لەبیری خۆمانی دەردەهێنم.**

(5)

**مەرگم بیردەکەوێتەوە، هەندآ کاتی خایاند بۆئەوەی هەست بکەم کە بیرکەوتنەوە دوژمنە. کآ لـآدەگەرێت ئێستا یادەوەریەکانی بمرن و، دواجار وەکو بڵێی حەبێکی ژەهر قووت دەدات. بەڵام چۆن بزانین کە سۆزداریی لەو شوێنەدا دەبێتەهۆی مردن؟ لەژێر زەوی لەبیرکرابووین، زۆر دوور لە ژیان و بیرەوەریەکانمان، سەرەڕای ئەو شوورانەیش کە دەوریان داوین، دیوارەکان هێندە قایم نەبوون، هیچ شتآ رێگای لە هەڵچوونی بیرکردنەوە نەدەگرت. تاقیکردنەوەیەکی فریودەرە، کە خۆت بدەیتە دەستی زیندەخەونیێکەوە، زۆرجار رابردوو بەوێنەی جوان دەوڵەمەند دەکات و، هەندآ جاریش تەڵخن و هەندآ جاری دیکەیش روونن، بە پەرت وبڵاوی و نارێکی دەردەپەرێن و، تارمایی گەڕانەوە بۆ ژیان دەبەخشن و بەبۆنی ئاهەنگ بۆنداربوون، یان سەرسووڕهێنەرتر لەوەش بەبۆنی بەختەوەریەکی ئاسایی: (ئاە)، لە بۆنی قاوەی بەیانیان و نانی گەرم، (ئاە)، بۆ نەرم ونۆڵی چەرچەفە گەرم وگوڕەکان و قژی ژنێک کە جل وبەرگ لەبەردەکات.. ئاە، بۆ بەیانیانی منداڵان لە یاریگای قوتابخانەو، بۆ سەمای خەنجەر باڵا لە ناوجەرگەی ئاسمانێکی ساماڵدا لەدەمەوعەسرێکدا! (ئاە)، چەند شتە سادەکان جوانن و، چەند ترسناکن کاتآ لێرەنین، بەبآ ئەوانە مەحاڵە هەتاهەتایە! ئەو خەونەی کە لەسەرەتاوە چوومە ناویەوە، درۆ بوو. بەئەنقەست خامی رووداوەکانیم جوان کردو، بەخۆڕایی رەنگێکم خستە سەر رەشەکە، ئەوە گەمەیەک بوو، هەندآ چەپەڵیم تیا دۆزیەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرا جەلجەلەکەم بەهەندآ رەکەبەرایەتیەوە باشتر بکەم، هێشتا پێویستم بەو لێبوردنە درۆیە هەبوو، بۆئەوەی قەناعەت بەو لەخۆبووردیە بهێنم کە تووشی ببووم، هەڵخەڵەتاو نەبووم، رێگاکە سەخت و درێژە، رێگایەکی گومان لێکراوە. دەبآ هەریەکێک لە ئێمە قبووڵی بووایە کە شتێکی لەدەست بچێت. نابآ چاوەڕێی هیچ بێت تا زیاتر ئامادەبێت بۆ ئەو چاڵە تاریکەی شەوی هەتاهەتایی، کە بەڕاستی شەو نەبوو، بگرە کارتێکردن و تێکلڕ و رەنگ وبۆنی خۆی هەبوو. شەو ئامادەگی هەبوو بۆئەوەی لەرزۆکی خۆمانمان بیرخاتەوە.**

**دەبآ بەگوێرەی توانا بەرگری بکەین، بۆئەوەی نەکەوین، هەموو دەرگاکان دابخەین، رەق بین. مێشکمان لە رابردوو خاڵی بکەینەوە، پاکی بکەینەوە، هیچ ئاسەوارێکی لەسەرمان نەهێڵین، سەیری دواوە نەکەین، فێربین یادنەکەینەوە، ئیدی چۆن رێگا دەبەنە سەر ئەم ئامێرە؟ چۆن خۆمان لە بەرزایەتی منداڵیمان بپارێزین، بآئەوەی بەتەواوەتی بیر لەدەستنەدەین، بآئەوەی شێت نەبین؟ دەبآ دەرگا لەسەر پێش دەی تەمموزی ساڵی 1971 دابخەین، نەک نابآ سەرلەنوآ بیکەینەوە، بەڵکو لەسەریشمانە دەبآ ئەوە لەبیرکەین کە چی لەودیویەتی. دەبوو هەست نەکەین دوای ئەوە، کە من بایەخ بە ژیانی رابردووی بەر لەو رۆژە شوومە دەدەم، تەنانەت ئەگەر شەوان وێنەو دەربڕین بۆم هاتن و بەدەورما سووڕانەوە، دەبی دەریانکەم، لێیان تووڕەبم، چونکە من ناتوانم بیانناسمەوە، دەبی ئاگاداریان کەمەوە کە من کەسی مەبەست نیم. هیچ پەیوەندیەکم نیە بەو تارماییانەوە، لەم جیهانە نیم، بوونم نیە، بەڵآ، منی ئێستا قسەدەکەم، رێک ئەوە رویدا: لەم جیهانە نیم، هەر هیچ نەبآ لە جیهانەکەی ئێوە، لەگەڵ ئەوەشدا توانای قسەکردنم پاراستووەو، ئیرادەی بەرگریکردن و تەنانەت ئارەزووی بیرچوونەوەیش، تاکە شتێک کە نابآ لەبیری بکەم ناوەکەمە.**

پێویستم پێیەتی، وەکو وەسیەتنامە ئەزبەری دەکەم، وەکو نهێنی، لەو چاڵە تاریکەدا کە ژمارە (7)م وەرگرتووە، وا ڕێکەوت لەکاتی گرتنماندا من لە ڕیزەکە حەوتەمین کەس بووم، نە زیادو نە کەم. خەونەکانم بە پیت بوون. زۆرجار سەردانم دەکەن، لەگەڵمدا بەشێک لە شەو بەسەردەبەن، پاشان دەڕەوێنەوەو لەبنی بیرکردنەوەم پاشماوەی ژیانی ڕۆژانە بەجێدەهێڵن، خەوم بە بەرەڵاکردنەوە نەدەبینی و، نە بەپێش لە دەستگیرکردنم، بگرە خەونم بە زەمەنێکی هەڵواسراو بە چلڕ وپۆپی درەختێکی ئاسمانیەوە دەبینی، بەڵآ، کاتی ترسە، منداڵەکە لەناخماندا بەئاگادێتەوە، بەڵام لێرە شێت و ئاقل لەناخماندا ململانێیەکی تالڕ دەکەن، کامیان دەتوانآ تا بتوانێت دوور بمبات، بە زەردەخەنەو دڵنیاییەوە چاودێری بێنەوبەرەی ئەم دوولایەنەم دەکرد، ئەگەر یادەوەریم بەبیردا بهاتبایە، بەهەموو توانایەکمەوە هەوڵم دەدا کپی بکەم و ڕێگایان لـآبگرم و، پرۆگرامێکی پیشەییم گرتەبەر بۆئەوەی لێیان ڕزگار بم: دەبوو جەستە ئامادەکەم بۆ گەیشتن بە خود، هەناسەدانی درێژ لەڕێگای سکەوە، خودانە هەست کردن بەکردەی هەناسەکێشان، واز لە وێنەکان دەهێنم دەرپەڕن، چوارچێوەیان بۆ دروست دەکەم، بۆ ڕاوەدونانی هەرچی لەدەوریاندا هەیە و، چاوەدتروکێنم تا دەردەکەون و پاشان چاو دەبڕمە وێنەیەکیان بەدووروردرێژی چاوی تآدەبڕم، تا وشک دەبێت، هیچ نابینم جگە ئەو وێنەیە نەبآ، هەناسەیەکی قوڵڕ هەڵدەکێشم، دڵنیام ئەوەی کە دەیبینم جگە وێنە هیچی دیکە نیەو دەبآ نەمێنآ، بەکردەوەی بیرکردنەوە یەکێکی دیکە جگە خۆم دەخەمە شوێنەکەم و، دەبی قەناعەت بەخۆم بهێنم کە هیچ هەقێکم بەسەر ئەو وێنەیەوە نیە و لەبەرخۆمەوە دەڵێم: ئەم بیرەوەریە هی من نیە، لێرەدا هەڵەیەک هەیە، ڕابردووم نیە، بۆیە بیرەوەریم نیە، لە 10ی تەمموزی 1971 لەدایک بووم و مردم. بەر لەوە کەسێکی دیکە بووم، ئەمەی ئێستام پەیوەندی نیە بەوی ترەوە. لە هەڵکۆڵینی ژیانی خۆم وەستاوم، لەبەر شەرم دەبآ دوربم لەوەی ئەم کابرایە ژیاوەو یان ئێستا دەژی، ئەم دەربڕینانە چەند جارێک دەڵێمەوە تا کابرایەکی نەناسراو دەبینم شوێنەکەی داگیرکردووم. لەسەرەخۆ لەو وێنەیەی کە وشکم کردبوو، ئەم نەناسراوە جێگای گرتمەوە، لەتەنیشت ئەو کچە کە دەزگیرانم بوو.

دەزانم ئەو دەزگیرانەکەی جارانمە.. کەی لە یەک جیابووینەوە؟ لەو ساتەدا کە کەسێکی دیکە خۆی دزیەوەو هاتە ئەم بیرەوەریەوەو، لەتەنیشتەوە دانیشت و بەختەوەریی بەسەروچاویەوە دیارەو، هیچ ڕێگایەک نیە پەیوەندی بە دەزگیرانەکەمەوە بکەم، چونکە زۆر دوورەپەرێزم، هیچم نەبوو جگە بیرکردنەوە نەبی بۆئەوەی پەیوەندی بکەم بەو جیهانەی کە لەسەرەوەی ئەم چاڵدایە.

چۆن بەدەزگیرانەکەم بڵێم کە لەمەودوا چاوەڕێم نەکات، ژیانی خۆی بژێت و منداڵێکی ببێت، چونکە من نیم؟ دەبووایە ئەوەم ببڕایەتەوە: کە ئیدی دەزگیرانم نیە، ڕۆژێک لەڕۆژان دەزگیرانم نەبووەو، ئەو ژنەیش لەبیرەوەریەکەمدا، تەنها غەواریەکە، بەهەڵە هاتبوو، یان بەدزیەوە هاتبوو، ئەو نەناسراوە، لەژیانی خۆمدا نەمدیوە، ئەو و پیاوە نەناسراوەکە کە هاتنە ناو وێنەکەوە، هەردووکیان بە من نامۆن، دەبآ وێنەیەک بێت ڕۆژێکیان لە گەشتێکی باغی گشتیدا گرتوومە، کام باغ، نا، نا باغ نا، چۆن کەسێکم بیرکەوێتەوە کە نازانم کێیە؟ ئەم سەرەتایانەم دەووتەوە بۆئەوەی وێنەکە ماندووکەم، بۆئەوەی نەمێنآ و لە لەبیرچوونەوەدا نووقم بێت. بەوجۆرە کاتآ وێنەکانی دیکە هەوڵیان دەدا لەبیردا بێنەدەرآ. هەڵیانمدەوەشاندەوەو، خۆم وا پیشان دەدا کە من دەیانسووتێنم. لەبەرخۆمەوە دەمووت: ئەوا هی من نین، خانەکەیان هەڵە کردووە، کەسی مەبەستیان هەڵەکردووەو، بەئاسانی نەمدەتوانی وێنەکان بناسمەوەو، لەسەریشم نەبوو ئەوە بکەم، ئەگەر هەوڵمدایەو بووە خولیایەکی بەجەخت و سەری خۆم دەکێشا بەدیوارەوە تا ڕادەی سەرگێژکەر، ئازاری خۆم دەداو لەبیرم دەچووەوە. لێدانەکە لەناوچەوان بوو دەتوانآ ئەو وێنانە بشکێنی کە دوام

دەکەون، بۆئەوەی رامکێشن بۆ لایەکی دیکەی دیوارەکە، بۆ لایەکی دیکەی گۆڕستانە شاراوەکەمان، هێندە کێشام بەسەری خۆمدا ئاوسا، بەڵام سووکتر بوو، چونکە لە زۆر بیرەوەریەکان خاڵی بووەوە. زیندانەکەم گۆڕ بوو، گێژاوێک بوو بەرە بەرە جەستەی هەڵدەلووشی، نەخشەیان بۆ هەموو شتآ کێشابوو، ئێستا هەست دەکەم بۆچی ئێمەیان دەستگیرکرد، لە مانگی یەکەم لە بەندیخانەی (قونەیتەرە)ی ئاسایی، ئاسایی مەبەستم دەتوانین رۆژێک لەرۆژان دوای بەسەربردنی ماوەی زیندانیەکەم دەرچین و، لە زیندانەکاندا دەتوانین لەکلاورۆژنەیەکی بەرزەوە ئاسمان ببینین، مەبەستم بەندیخانەیەک حەوشەی پیاسەکردنی تیایەو، زیندانیەکان دەتوانن بەیەکبگەن و قسەبکەن و نەخشە بۆ ئاینده دابنێن. بەندیخانەی (قونەیتەرە) بەناوبانگ بوو، بۆ تووندوتیژی یاساکانی و دڵرەقی پاسەوانەکانی و، لەوآ سیاسیەکان بەند دەکرێن، بەڵام کە (تزمامارت)م ناسی، بەندیخانەی (قونەیتەرە)م وا هاتەپێش چاو، سەرەڕای زۆر لەبارەیەوە وترابوو، بەندیخانەیەک بوو لەوەدەچوو مرۆڤانە بێت، لەوآ رووناکی ئاسمان و کزە هیوایەک هەبوو. دە ساڵ، ئەوە ماوەی حوکمەکەمان بوو، ئێمە لەنێو ئەفلە تەکبیرچیەکان نەبووین، بگرە دەرەجەدار بووین و فەرمانمان جآبەجی دەکردو، چاوەڕآ بووین، چاڵەکان ئامادە بکرێن و بکرێنە جێگای سەرەمەرگ و، چاوەڕآی ئەوە بووین ئەندازیارو پزیشکەکان لە تاقیکردنەوەی هەموو ئەگەرەکان ببنەوە، بۆ درێژەدانی ماوەی ئەشکەنجەدان و دواخستنی مەرگ بەپێی توانا، لە (قونەیتەرە) ماینەوە، بەندیخانەیەکی ترسناک بوو سەرەڕای ئەوەی ئاسایی بوو، هەرکە بەشەو دەستیانکرد بە گواستنەوەمان و بەچاوی بەستراوەوە، رەچاوی ئەوەمان دەکرد هەریەکەو لەپشتەوە گوللەیەک بەپشتی سەریەوە بنێرێت، بەڵام نا، ئەوە بەخشینێکە و شایستەی ئەوە نین، بێگومان، لەچارەمان نووسرابوو کە بمرین و بەڵام نەک دەسبەجآ، چونکە دەبآ ئەشکەنجە بچێژین و، بژین، هەموو چرکەیەک ئازاری جەستەو هەمو ریسواییە زەینیەکان کە دووچارمان دەکەن، ئۆە، مەرگ کوتوپڕ دەبآ وەکو بڵێی قوتاربوونە، دڵ لە لێدان دەوەستێت! دەمارێک دەتەقآ، خوێن بەربوونێکی زۆر، لەخۆچوونێکی یەکجارەکی، رۆژانێکم بەسەربرد ئاواتەخواز بووم ژیانم دەسبەجآ کۆتایی بێت و، بیرم لە خوا کردەوەو، لەوەی کە لەقورئاندا هاتووە، لەبارەی خۆکوشتنەوە! بڵآ هیچمان تووش نایەت تەنها ئەوەی کە خوا بۆی نووسیووین. لەوانەیە رقتان لە شتێک بێت و خودا بۆتان بەخێرێکی زۆری دەگێرێت:

"قل لن ی سیبنا الا ما کتب الله لنا. فعسی رن تکرهوا شیئا و یجعل الله فیه خیرا کبیرا". کآ خۆی بکوژێت دەگاتە ئاگرو بەنەمریی تیا دەمێنێتەوە، بەو ئامێرەی کە خۆی پآکوشتووە. کآ خۆی لەسێدارە بدات و ئەشکەنجەکەی سێدارەدان دەبێت و، کآ بەسووتان خۆی بکوژێت و لەناو ئاگرێکی نەمردا دەمێنێتەوەو، کآ خۆی فرێداتە دەریاوەو هەتا هەتایە بەخنکاویی دەمێنێتەوە.

شەوێکی گەرمی مانگی ئۆگستی 1973 بوو، خەوم زڕابوو نەمدەتوانی بخەوم. گوێم دەگرت و گوێم لە ترپەی دڵم بوو، هەستم بە دڵتەنگیی دەکردو ترسێکی ئاڵۆز دایگرتم. نوێژەکانم کردو لەسەر لای چەپ پاڵکەوتم، بۆئەوەی گوێم لە ترپەی دڵم نەبێت و، نزیک سەعات سێی بەرەبەیان، دەرگای زیندانەکەم کرایەوەو سآ زەلام پەلاماریان دام، یەکێکیان دەستی کەلەبچە کردم و، ئەوی دیکە بەتیلماسکێکی رەش چاوی بەستمەوە و، سێیەم پشکنیمی و دەستی گرت بەسەر سەعاتەکەمداو، لە گەڵ ئەو پارە کەمەی کە لەگیرفانم پێم بوو. پاشان بەرەو رێبێلگەکە بردمی و لەوآ گوێم لە هاواری کەسانی دیکە بوو، دووچاری ئەوە ببوون کە منیش دووچاری ببووم. لەحەوشەکەدا کۆیانکردینەوە، مەکینەی لۆریەکان ئیشیان دەکردو هاڕشەیان دەهات و، دەستیان کرد بە ژماردرن. کآ گوآی لەناو و ژمارە سەربازیەکەی خۆی بێت، دەبآ بچێتە پێشەوە، سەربازێک بەرەو پەیژەیەکی بچووک پاڵی پێوەنام ، کە لەوێوە بۆ لۆریەکان سەردەکەوتین.

هەندآ نارەزاییان دەکردو، بێئەوەی کەس گوێیان بداتآ، لەماوەی چەند دەقیقەدا هەمووومان سواری ئەو لۆریانە بووین کە بە چادر داپۆشرابوون، پاشان بەرەو ئاستێکی نادیار ئێمەیان برد: مەرگ، لەوانەیە سەعاتێک بێت، بەچاوی بەستراوەوەو بەدەستی کەلەبچەوەو بآجووڵە کۆچ بکەیت، وێنەیەکی دیاری لەسێدارەدانی بآدادگاییکردنەو، لەمێشکی هەمووواندا دیارە. ئەوەی لەتەنیشتم دانیشتبوو، خەریکی نوێژکردن بوو. تەنانەت دوو شایەتمانیشی هێنا: (اشهد ان لا اله إلا الله واشهد ان محمدا رسول الله)، پاشان هەمان رستەی بەخێرایی دووبارەدەکردەوە، تا وای لێهات مەحاڵ بوو لێی تآبگەیت، وشەکانی ناوت بگرە بە بڵمەبڵمەوە دەیووتەوە، جەستەمان وەکو سەندوقی سەوزە دەلەقین، زانیمان کە لۆریەکە لەرێگای قیر لایداوە، سەربازەکان نایانەوآ جووڵانەوە یان نیزەکانیان زانراو بن. گەشتەکە هێندە سەعاتی خایاند وای لێکردم دەستی خۆم لە ژماردرنی کات بگرمەوە، ساتێک هەستم کرد ئۆتۆمبیلەکان بە بازنەیی رێدەکەن، لە تاریکیدا وێنەکان سپی بوون، بەخێرایی دەهاتنە پێش چاو. هەموو دیمەنەکان لەسەر شاشەی مێشکم دووبارەبوونەوە: رووناکیە گەشەکانی (سەخیرات)، خوێنی وشکەوەبووی ژێر هەتاو، سستی دادگا، گەیشتن بە بەندیخانەی (قونەیتەرە)و، بەتایبەتی سەروچاوی دایکم، کە زیاتر لە دوو ساڵ بوو نەمدیبوو، بەڵام هەندآ دەهاتە خەونم. بێگومان منیش پێم وابوو ئەو گەشتە بەرەو نادیارە گەشتی مردنمانە، سەیر لەوەدابوو ئەوە نەیدەترساندم، تەنانەت هەوڵی ئەوەشم نەدەدا کە بزانم لەکوێن، ئایا سوپا دەتوانآ پەنجاوهەشت پیاو لەناوبدات و لەگۆڕێکی بەکۆمەڵدا بیانشارێتەوە؟ کآ بەرگری لە ئێمە دەکات و داوای دادپەروەری دەکات؟ دۆخێکی دەرەکیمان دەبینی، هەموو شتآ تیا دەکرێت. باشتر وایە واز لە خەملاندن بهێنین، لۆریەکان لە رێکردنی بازنەیی خۆیان بەردەوام بوون و، هارەی مەکینەکان ئاگادارمان دەکەنەوە کە رێگای لوتکەیەکی هەوراز دەگرینەبەر. لەوانەیە چیایەک بێت، کەش گەرم بوو، هەواکەیش بۆگەن بوون، خەریک بوو دەخنکاین، چادرە ئەستوورەکە، لە تەپ وتۆز نەیدەپاراستین، بەڵام هەوای لێدەگرتین جگە شتێکی کەم نەبێت. هەستم بە تینوویەتی دەکرد، هەمووومان هەستمان بە تینوویەتی دەکرد. هەرکە داوای ئاومان کرد، ئەو عەریفەی لەتەنیشت شۆفێرەکەوە دانیشتبوو هاواری کردو وتی: "دەمتان داخەن ئەگینا بە تێپ بۆتانی دادەخەم."

بەشەو گەیشتینە جێگای مەبەست. کەشەکە خۆش بوو بەو تەڕاییەی کە دوای سەعاتەکانی رۆژی گڕەو گەرما دێت، گوێمان لە دەنگ گەلێک بوو تێیان نەدەگەیشتین، دەبی مەفرەزەیەکی دیکەی سەرباز جێگای مەفرەزەی پێشووی گرتبێتەوە، پاشان بەسەر دو بڕدا دابەش کراین و، تآگەیشتم کە بەشی (ر) هەندآ ئەفسەری لەخۆگرتبوو، بەڵام بەشی (ب)م بەرکەوت، هێشتا چاومان بەسترابوونەوەو دەستیشمان کەلەبچە بوون، کەس نەهات کەلەبچەکانمان بکاتەوە، پەڕۆکان لەسەروچاومان لادات، جگە بۆ رۆژی دواتر نەبێت.. بەداخەوە، کاتآ پەڕۆکەیان لەچاوم کردەوە جگە تاریکیی هیچی دیکەم نەدەبینی، وامزانی کوێر بووم. ئێمەیان خستە زیندانێکی هەتاییەوە، دروستکرابوو بۆئەوەی هەتاهەتایە بمێنآ، نووقمی تاریکی بوو.

(6)

لەبەرخۆمەوە دەمووت:

**ئیمان ترس نیە، خۆکوشتن چارەسەر نیە، مەینەتیش تەحدایە، بەرگریکردن ئەرکی سەرشانەو فەرز نیەو، پاراستنی کەرامەتیش مەرجی موتڵەقە، ئەمەیش کێشەکەیە: کەرامەت ئەوەی لێم دەمێنێتەوە، هەریەکێکمان بەگوێرەی توانای خۆی تەقەلا دەدات کەرامەتی نەڕوشێت و، ئەمەیش ئەرکی منە، کە بەپێوە بمێنم، پیاو بم نەک پەڕۆیەک، نەک گسکی نایلۆن، نەک هەڵە. تا مابم حوکم لەسەر ئەوانە نادەم کە لاواز دەبن و، دەستبەرداری ململانێکە دەبن، ئەوانەی بەرگەی ئەو ئەشکەنجەیە ناگرن کە بەسەریاندا دەسەپێ و، تا وایان لـێدێت لەژێر ئەشکەنجە هەرەس دێنن و، خۆیان دەدەنە دەستی مەرگێکی هێواشەوە.**

**فێربووم کە حوکم بەسەر مرۆڤدا نەدەم هەتا ماوم، بەچی هەقێ ئەمە دەکەم؟ مرۆڤێکم وەکو هەمووان، ورەی خۆم هەیە بۆئەوەی خۆم نەدەم بەدەستەوە. هەموو مەسەلەکە ئەمەیە، ورەیەکی چەسپاو و رەق، کە هیچ سازشێک قبووڵ نەکات، ئەم نموونەیەم لەکوێ بوو؟ لەسەردەمێکی دوور، کاتی منداڵیی، لەدایکمەوە زۆرجار دەمبینی دەجەنگا بۆئەوەی بەخێومان کات، من و براکانم و خوشکەکانم، رۆژێک لەرۆژان دەست کورتی زەفەری پێنەبردبوو و دەستبەردار نەبوو، دایکم هیچ هیوایەکی بە باوکم نەمابوو، حەزی لە ژیان بوو، خۆپەرست تاڕادەی ئازاردان ئەو مێردمناڵە بوو ، کە لەبیری نەبوو ئەو خاوەن خێزانەو، هەموو پارەو پوولی خۆی لەلای بەرگدرووەکان خەرج دەکرد، بۆئەوەی هەموو هەفتەیەک دیشداشەیەکی ئاوریشمی بۆ بدوورن و، ئەو کراسانەی لەئینگلتەرەوە بۆی دەهاتن و، ئەو بەڵغانەی کە لە (فاس)ەوە بۆی دەهاتن، جاری وا هەبوو بۆنی لە شانشینی سعوودیەی عەرەبیەوە بۆ دەهات و، جاری واش هەبوو لە پاریسەوە بۆی دەهات، بۆئەوەی لەکۆشکی خانەوادەی (کەلاوی) پاشادا خۆی با بدات، لەو کاتەشدا دایکم رەنجی دەدا، بەدرێژایی هەفتە کاری دەکرد بۆئەوەی پێویستمان بە هیچ نەبێ، کەممان بەردەکەوت، تەنها خۆی بچووک بوو، دوا هێشوو بوو، دایکم پێی دەووت (جەرگە بچووکەکەی.(**

**هەقی بوو ناز بکات، دایکم هەمو ویقارێکی خۆی لەدەست دەدا، لەبەردەم میرە بچووکەکەیدا، لەبەردەم منداڵێکی سەرسوورهێنەرو زۆر زیرەک و خاوەن چەندین ئارەزووی بێئەژماردا. سەیریش نیە بەبۆنەی بوونی بەتەمەن پانزە ساڵەوە ماتۆڕێکی هەبێ. یان لەنێوان دوو قاقادا دانیشتن لەسەر خوانی نانخواردن دانی پیدابنی و بڵێ: "دایە، من پیاوانم لە ژنان پێ باشترە، حەزی لە رۆجێ مامۆستای ئەدەب بوو". ئاە، ئەی میرە بچووکەکە، هەموومان خۆشمان دەویست، لەوانەیە لەبەرئەوەی بەرامبەر دایکم بوەستین یان ناڕەزایی دەربڕین بەرامبەر رێبازەکەی، دڵی بەو منداڵە خۆش بوو، دڵی پێی دەکرایەوە، شەیدای جوانیی و گورج وگۆڵیە نائاساییەکەی بوو، ئەو رۆژەی باوکمی لەماڵ دەرکرد کۆی کردینەوەو ئاگاداری کردینەوە: "تەمەڵم ناوێ لەماڵەکەمدا، نابێ کەس لەخوێندن دوابکەوێت، من لەئێستاوە دایک و باوکتانم."**

**کاتێ دایکمی خواست، باوکم لەشاری مەراکش زەڕەنگەر بوو، ئەو دوکانەی لە خاڵۆی بۆ مابوەوە کە منداڵی نەدەبوو، وەکو کوڕی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرد، کاتی خۆی لە خوێندنەوەو لەبەرکردنی شیعری گەورە شاعیرانی عەرەبدا بەسەردەبرد، هیچ شتێ لە خوێندنەوەو شیعر لەبەرکردن دووری نەدەخستەوە، تەنها هەوڵدانی بۆ تەفرەدانی ئەو ژنە جوانانەی کە لەبەردەم دوکانەکەیدا چەنەبازیان دەکردو، سەیری خشڵە دانراوەکەی ناو جامخانەکەیان دەکرد. ناوبانگی بەوە رۆیشت کە ئەو پیاوێکە حەزی بەفریودانەو بازرگانی نازانێت و، بەهەرحاڵ، خۆی ئامادە دەکرد بۆئەوەی لە زانکۆی (فاس) ببێتە مامۆستای ئەدەب، بەڵام هەرکە باوکی بانگ کرا بۆ تەختی (کلاوی) پاشا، دوکانەکەی داخست و، چوو بۆ کۆشک و خۆی تەرخان کرد بۆ وتنەوەی زمانی عەرەبی بە کوڕانی پاشاو نەوەکانی. ئەمەیش سەرەتای پەنجاکان بوو، ئەوکاتە پاشا دۆستی فەرەنسیەکانە بوو و کۆمەکیاریان بوو. دەبوو باوکم خۆی لەوە**

بآئاگا کردبایەو خۆی وا لەقەڵەم بدات هیچ نازانآ دەربارەی ئەوەی لەناوەندە نیشتمانیەکان دەووترێت. باوکیشی هەروەها دەیووت کە لە سیاسەت ئیش ناکات. ئەو باوکە، کە باش نەمدەناسی، لەڕاستیدا شاعیر و هاوڕێی شاعیران بوو، حەزی بە ڕێکپۆشی و رابواردن بوو، بەدوای برادەریی خاوەن دەسەڵاتەوە هەڵپەی بوو، و خۆشی خستنە پێکەنینیان، هەستی بەوە نەکردبوو کە ڕۆژێک دەبێتە خاوەن خێزان، یان بەرامبەر منداڵێکی زۆر هەست بە لێپرسینەوە بکات، لەبەر بیرتیژی و هەستی گاڵتەوگەپی ڕەهایی و هەمیشە دەستنیشانکەر بوو، بەهۆی ئەو ڕۆشنبیریە تەقلیدییەی کە هەیبوو، دەیتوانی بەبآ هەڵەکردن هەزاران بەیتە شیعری (بن براهیم) بڵێتەوە، لەکۆتایی شەستەکاندا بووە لیبۆکی شاە و برادەریشی. لە سوپا بووم کاتآ یەکێک لە براکانم هات بۆ لام و هەواڵەکەی دامآ: "پاشا بەبآ باوکمان هەڵناکات، بوون بە دوو برادەری گیانی بەگیانی، لەبەرئەوە نایبینین، کاتی خۆی هەمووی لە کۆشک بەسەردەبات، تەنانەت لەسەفەرکردنیشی لەگەڵیا خۆیدا دەیبات."

بەوجۆرە بوو، ئەو منداڵە ڕوو خۆشەی مەراکش، لێزانی فریودانی دۆنجوانی، بیری زیندوویی شیعری میللی، ئەو پیاوەی کە هەردەم هۆی ئەشکەنجەی دایکم بوو، ئەو کەسەی کە تەنها بیری لە خۆشیی کەسایەتی خۆی دەکاتەوە، زەرەنگەری شار، پەرۆشی بەسۆز بۆ تەختی (کلاوی) پاشا، ئەو پیاوەی منداڵەکانی خۆی ناناسێتەوە ئەگەر لە جادەوبان تووشیان بوون، لەڕاستیدا مەسەلەکەیش جگە لە لیبۆکی شا چیدیکە نەبوو. لە دیدی دایکمەوە ئەو پیاوە بوونی نەبوو. بەڵام ئێمەش بۆمان قەدەغە بوو کە بە ئاماژە، تەنها بەئاماژەیش بەو باوکە نادیارە بدەین، ئەو پیاوەی ئەوەندە بایەخ بە ڕێکخستنی ڕەنگەکانی بەڵغەکەی و دیشداشەکەی دەدات، ئەوەندە هەوڵ نادات بەدواداچوون بکات بۆ خوێندنی پەککەوتووی دوایین منداڵی. خەمی ئەوەبوو تەنها خزمەتی شاە بکات، لەبەر پێیدا بیت و دەستەونەزەر بێت بۆی، بەرلەو چاوی نەچێتە خەو، مەتەڵی بۆ بڵێت، بیکاتە پێکەنین هەرکە دڵی تەنگ بوو، دەربڕینی شایستە بدۆزێتەوە، هەرشتێک و لە شوێن خۆی بێت، بەوە ڕازی بێت کە نابێ ژیانی تایبەتی خۆی هەبێت، بەردەوام خۆبەخشی میزاجی ئەو بێت، پێش هەموو شتآ نابآ فەرمانە گاڵتەجارییەکەی، ڕۆڵێکی گرنگیشی دەبینی لەلای شا. هەندآ لە دارودەستەی شاهنشایی پەنایان دەبردە بەری و، سکاڵاو بەشخوراویان بەرێت بۆ لای گەورەی، کاتآ ئەم ئامادە دەبێت گوێی لێبگرێت، ئەو شارەزای میزاجی بوو، چونکە لێی دەپرسێت، بەزەردەخەنەیەکی پانەوە سەیری خاوەن داخوازی دەکات، بۆئەوەی پێی بڵێت: "ئەمڕۆ خاوەن شکۆی کەیف سازە". لیبۆک بوو، دەشبی بەوەوە شانازی کردبێت، وەک بڵێی تاجدارکردنی سەرجەم ژیانی پیشەییەتی و، وەدیهێنانی خەونێکی دیکەیە،: بەلای شاوە، وەکو چۆن باوکیشی لەلای کلاوی پاشا وابوون، بۆیە ئەو کابرایەم بیرهاتەوە، چونکە لە 10 ی تەمموزی 1971دا بیرم کەوتەوە کە من کوڕی ئەوم، ئەو لەناو ئەو بانگهێشتکراوانەدا بوو، بۆ ئاهەنگی یادی لەدایکبوونی پاشا، لە کۆشکی سخێرات، لەو شوێنە کە جەستەی گەورەپیاو و دبلۆماسی و پیاوانی دەسەڵات وەکو مێش بەربوونەوە، بەدەم ڕێژنەی گوللەی سەرجەم ئەو ئۆردووەی کە هەموویان فوتابی ئەفسەر بوون منیان تیا نەبووم، من تەقەم نەکرد، لەژێر کاریگەری شۆکەکە بووم، وەک بڵێی شێتی زۆری لێکردبووین و، بەبێزهاتنەوە یاخی بووین، یان لەبەر شکستی بوون یان لەبەرئەوە بوو ئێمە مردبووین بێئەوەی پێی بزانین، ئاوها بۆی دەچووم، هەر لە یەکەم ساتی چوونە ژوورەوەم بۆ کۆشکی هاوینە مردبووم. مردبووم و لەوەش پەشیمان نەبووم، هەموو شتآ لەدەورم دەسووڕانەوە، خەڵکی، مێزەکان، چەکەکان، خوێن لەناو حەوزی مەلەکە، ئەستێرەکانی بەرەبەیان و، بەتایبەتی خۆرەکە، کە وازی نەدەهێنا لە دواکەوتنمان. چەند ڕۆژێک تێپەڕین، هەرکە باوکم ئەوەی پێگەیشت، کە من لەناو پەلاماردەرەکان بووم، هەردوو ڕوومەتی خۆی ڕنیەوە بۆ دەرخستنی شوورەیی خۆی و، کەوتە بەردەم پێیەکانی شاەو، بەگریانەوە ماچی دەکردن و، کاتآ دەستەکانی شا بەرزی کردنەوەو حاشای لێکردم بەم قسانە: " خودا بەر لە بیست وحەوت ساڵ کوڕێکی دامآ، داوا لە خودا دەکەم لێمی

**بسەنێتەوە، بیمرێنآ و لە ئاگری دۆزەخدا بیسووتێنآ، خودای بانی سەر گەورەیە. من لەناخی ڕۆحمەوە و بەهەموو هەست و نەستێکمەوە بێبەریم لەو کوڕە ناڕەسەنەو، دەیخەمە بەردەم ڕیسوایی و لەبیرکردنی هەتاهەتاییەوە. ناوی خۆمی لێدەسەنمەوەو، تووڕی دەدەمە چاڵێکی پیس و پۆخڵیەوە تا مشک و سەگەکان دلڕ و هەردوو چاو و جەرگی هەڵدڕن و، پارچە پارچەی کەن و، بۆئەوەی تووڕبدرێتە دەریای لەبیرچوونەوەی هەتاهەتاییەوە، خوا شایەتە، یا خاوەن شکۆیشت شایەت بآ، دەڵێم و دووبارەی دەکەمەوە: ئەو کوڕە کوڕی من نیە، نەبووەو ڕۆژێکیش بوونی نەبووە. یا خاوەن شکۆشتان بفەرمآ بەتووڕدانی منیش لەدەریای لەبیرچوونەوە، چونکە خەڵتانی ئەو ڕیسواییە بووم، ئیدی شایانی ئەوە نیم خزمەتکارو نۆکەری تۆ بم، دەرمکە، قسەیەک بڵآ، ئیدی لەمڕۆ بەدواوە ئەم سەروسەکوتە نابینی، کە لە ڕووی نایەت سەیری رووخسارت بکات. ئەم سەروچاوە کە نەک لەبەر ڕیسوایی سوورهەڵگەڕێت، بگرە ڕووکەشی خۆی لەدەستداوەو خۆی بووەتە ڕیسوایی، بەلای منەوە ئەو کوڕە ناڕەسەنە مردووە، بەزیندوویی ڕەوانەی ئەشکەنجە بکرێت، تا دوا نوزەی ژیانی کەفارەتی ئەو گوناهە بکات، کە وەسف ناکرێت و دەرهەق بە خاوەن شکۆ کردوویەتی و، هەروەها دەرهەق بە خوایش و دەرهەق بە خزمەتکارێکی چرووک، من لێی بێبەریم و حاشای لـآدەکەم، من نەعلەتی لێدەکەم، نەعلەتی لێدەکەم. نەعلەتی دەکەم، چۆن خودا بەخشینی تۆم بەرکەوێت؟ چۆن، ئەی خاوەن شکۆ، بەتەمای یارمەتی تۆ بم، نەک بۆ ڕزگارکردنی ئەو پیاوەی کە خیانەتی لە خوا کردو، نیشتمانی بریندارکردو لەناخی ڕێگادا گەورەترین خەتا بکات، شێتایەتێکە لە وێنەی نەبووە، هەوڵبدات پیلان بگێڕآ دژ بە ژیانی تۆی میرخاس و، ڕازی بووی پایەبەرز وەکو ئاسمان، ژیانی تۆ، ئەی میری ئیمانداران، کە ڕاستەوخۆ لە ڕەچەڵەکی پێغەمبەرەوە هاتووی، چۆن بتوانم، ئەی خاوەن شکۆ، کە بەر یارمەتی تۆ بکەوم، بۆئەوەی لە ژیان بەردەوام بم، بآئەوەی ملشۆڕ نەبم و چاوم لەبەر تووندیی ڕیسوایەکەو شوورەیی چاوم هەڵنەیەت. لەبەر ئەو ڕیسواییەی کە خیانەتی ئەو کەسەی لەپشتم هاتووە؟ گەورەو، سەروەرم، خاوەن شکۆ، من کە لەبەردەمتدا وەستاوم، بەدەستی کەلەبچەوە، با کرداری خاوەن شکۆ بەرامبەر نۆکەرەکەی خۆی چۆنی دەوآ با وابێت، من موڵکی تۆم، خێزانەکەم خێزانی من نیەو، منداڵەکانیشم منداڵی من نین، من لەبەر پێی خاوەن شکۆدا کەوتووم."**

**شاه بە ورتە ورتەوە فەرمانێکی داو لێیداو ڕۆیشت، باوکمی بەهەرەسەوە بەجێهێشت. لەسەر ئەژنۆ کەوتبوو، لەبەردەمیدا دەستی پان کردبووەوە، کە نیشانەی ئەوپەڕی دەستەوسانیە.**

**وابزانم شاه لە دۆخێکدا بوو ڕێی نەدەدا شتێکی دیکەی گوآ لێبێت و، پێم گەیشت کە داوای لە باوکم کردبوو لەگەڵیدا بمێنێتەوە تا دوا شەو و، شیعرەکانی (بن ئیبراهیم)ی بۆ بڵێتەوە، تا سەعات چوار یان پێنجی بەیانی خەو نەچووە چاوی. دوای ئەوەی باوکم دڵنیابوو کە ئاغاکەی بە لوتفەوە لایدا بەلای ئاقارێکی دیکەی شەودا، زۆر بە وریایی هەڵساو لە ژوورەکە چووەدەرەوەو پاشەوپاش لەسەر نووکی پەنجەی پێیەکانی دەڕۆیشت، ئەم هەمووەم دوای بەربوونم لە بەندیخانە بەچەند مانگێک پێگەیشت. ئەمڕۆیش، ئەو پرسیارە زۆرم بۆ دەهێنآ کە بۆ ماوەی هەژدە ساڵ زۆری بۆ دەهێنام، بآئەوەی جورئەتی ئەوە بکەم کە بە وشە دایڕێژم، لەترسی ئەوەی نەبا شێت ببم یان خەمۆکیەکی کوشندە دامگرێت، ئەو خەمۆکیەی کە تووشی هەندێک هاتبوو و بەرە بەرە بەرەو لەناوچوون بردنی، ئەو پرسیارە ئەمڕۆ نامترسێنآ تەنانەت وایدەبینم کە بەسەرچووە، بەڵام واتای خۆی لە دەست نەداوە: ئەو ڕۆژەی لەگەڵ ئەفسەرە قوتابیەکان چووینە ژوورەوە بۆ کۆشکی شاهانەی هاوینە، دەمویست کآ بکوژم، ئایا شا یان باوکم؟.**

(7)

سەرلەنوآ چاڵەکەیە، تاریکیەکی ئەنگوستەچاوە، تەنانەت کونی میچەکە وەها کرابوو کە هەوای لێدەهاتەژوورەوە، بێئەوەی رووناکی ببینین، (کەریم) ژمارە (15) بوو، کورتەباڵا، قەڵەو بوو، خەڵکی ناوچەی (حاجب) بوو، ئەو ناوچەیەی کە ژمارەیەکی زۆری سەربازو دەرەجەدارو ئەفسەری دابوو بە سوپا، بنەماڵەکەی (کەریم) هەموو سەرباز بوون، بە باوباپیرەوە. بۆی نەبوو هەڵبژێری. براکانی هەموویان سەرباز بوون، بەڵام ئەو خۆی ویستبووی ببێتە ئەفسەر. هەرکە دەچوو بۆ خولی مەشقکردن لە سەربازگەی (حاجب) خەونی بەوەوە دەبینی بچێتە قوتابخانەی (هرمومو)ەوە. لاوێکی بآدەنگ بوو، بەدەگمەن بزەی دەهاتآ، بەڵام تاقە هەوەسی ئەو کات بوو، دەیتوانی زۆر بەوردی کات لە رۆژان یان لە شەودا هەرکاتآ بآ بەرێکی دیاری بکات. ئەم بەهرەیەی وایلێکردبوو کە ببێتە رۆژژمێرو پەندۆلمان، دەیگەیاندین بەو ژیانەی کە لەدوای خۆمانەوە بەجێمانهێشتبوو، یان لەسەر سەرمان بوو. ئەوەی کە زۆر لێی دەترسا ئەگەر لەگەڵر یەکێکماندا بکەوتایەتە دەمەتەقێیەوەو ژماردنی کاتەکە هەڵە بکات، تەنانەت هەندێکمان حەزمان لێبوو، بۆ رابواردن بەم پرسیارە تواناى تاقی بکەنەوە: (ئێستا سەعات چەندە؟) و بەتایبەتی: (ئێمە لە چی رۆژێک و لە چی مانگێکداین."

پەنجەنان بە زەنگەکەوە پەندۆلە قسەکەرەکە دەکەوێتە ئیش: (لە ساڵی 1975 داین، 14 ی مایۆو، سەعاتیش رێک نۆو سی و شەش دەقیقەی بەیانیە.(

بۆ برادەران پێشنیازم کرد کە واز بێنن لە بێزارکردنی بێسوود: ئەو رۆژەی سآ جار لەکات ئاگادارمان دەکاتەوە، ئەوەی مەبەستمانە بزانین لەکوێن، هیچ نەبآ لە کونە تاریکەکانمان بەزەینیش بی و، وامان لێدەکات بەسەر زەمەنندا زاڵر بین.

)کەریم) توانی لەوەدا ئیشێک بدۆزێتەوەو زۆربەی وەختی پێ بەسەردەبرد. بەلامانەوە، ئێمە، زەمەنێکی رووتی نیگەرانیە، کە پەیدەر پەیەکی کوێرانەی تارمایەکی دابەشکراوی سەر دەقیقەکانە، پاشان سەعاتەکان، ئەنجایش بۆ رۆژەکان، هێمن بوو دەرون بێگەرد بوو، لەبەرئەوەی پاسەوانی کات بوو، پێی وابوو ئەو سەر بە گروپەکە نیە، بەڵام بەبی لاف و گەزاف یان زۆرداربی، ئەو لەسایەی تاریکیەکانەوە پەی بە پلەوپایەی خۆی دەبرد. لێزانیە شاراوەکەی و وردبینیەکەی مایەی سەرسوڕمانمان بوو، هیچ نەبوو بیڵآ دەربارەی ئەوەی ئێمە تێیدا بووین. بووە رۆژژمێرو پەندۆلمان، جگە لەوە ئەڵتەرناتیڤێکی دیکی پی قبوول نەبوو، وەک بڵێی رێبازی خۆی بوو بۆ دامینی گیربی ژیان، نادیار بآ لە شوێنکەوتنی شێوازی زەمەنێکی لە ئێمە قەدەغەکراودا، سەیریش لەوەدا بوو کە کۆیلەبوونی بۆ کات ئازادی کردبوو، خستبوویە دەرەوەی هەر پێکانێک.

بەتەواوی لە شەیتانۆکە تەنکەکەی خۆیدا دوورەپەرێز بوو. لە هەموو شتآ کە بیخڵافێنآ و ڕێڕەوی حیسابەکەی لەدەست بدات تەکیبووەوە، ناچاربوو کە میتۆدی و وردەکاری بێت، ئەمەیش ئەرکی ئەو بوو و تەختەی قوتاربوونی بوو. بەڵام من هەر زوو هەستم پێکرد کە غەریزەی مانەوە یارمەتیم نادات کە بەزیندوویی بمێنمەوە، تەنانەت ئەو غەریزەیەش کە لەگەڵ ئاژەڵاندا لێی هاوبەشین، تێک شکابووین، ڕێگا بۆ مانەوە لەژیاندا چۆنە لەم کونەدا. سوودی چیە گەر یەکێکمان جەستەی بۆ ڕووناکی بەکێش بکات، جەستەیەکی تێکشکاو و نابووت؟ خرابووینە بارودۆخێکی حیسابکراوی وردەوە، بۆئەوەی ڕێگە لە هەوڵدانی غەریزەکەمان بگرێت بۆ ئایندەیەک. هەستم کرد کە زەمەن هیچ واتایەکی نیە، جگە لە جووڵەی بوونەوەرو شتەکاندا نەبآ. حاڵەکەیش وابوو کە ئێمە بە کپی و نەمریی شتە مادیەکان مەحکوم بووین، لە هەنووکەیەکی وشکەوەبوودا بووین، ئەگەر یەکێکمان بلووایە بەدبەخت بآ و، ئاوڕ لەدواوە بدات، یان لە ئایندەدا خودی خۆی تاقی بکاتەوە، واتای ئەوە بوو پەلە لە مەرگی خۆی دەکات، چونکە هەنووکە تەنها جێگای بەڕێوەچوونی بەسەرهاتەکانی تێدا دەبێتەوەو، دەبووایە تەنها ساتی زۆر پێویست بەکاربهێنین، بێئەوەی فیکری تیا بخەینەکارو، لەوانەیشە هەستی من ئەوە بێت کە ژیانی خۆم ڕزگارکەم.

ڕۆژێک هەرگیز حیسابی ئەوەم نەکردبوو کە گسک. تەنها گسک، ئەوەندە بەسوود دەبێت، پاسەوانەکان ڕازی نابوون بێنە کونەکانمانەوەو بەرماوەکانمان خاوێن بکەنەوە. دەبووایە خۆمان بەنۆرە ئەوەمان کردبایە، تەنها دەرگای گەورەکەیان دەکردەوە، بەرلەوەی بڕۆن و دەیانووت ئەوان ئامادەنین کە تووشی میکرۆبەکانمان بن! پیس وپۆخلڕ و ڕیشن بووین و، هەمووشتآ لەدەوروبەرمان کێڵگەیەکی بەپیت بوو بۆ زۆربوونی میکرۆب و نەخۆشیەکان. ڕۆژێکیان، کاتآ (حسێن) ژمارە (20) گسکی دەدا، هاوارێکی لـآبەرزبوەوە، وەک بڵێی هاواری خۆشیە، پاشان لەزیندانەکەی من نزیک بوەوەو پێی وتم:

-دەزانی لەوسەری داری گسکەوە بازنەیەکی ئاسنی پێوەیە!

-با هەبآ؟ بۆئەوە هاواردەکەیت؟

"ئاسنە! ئەگەر بتوانین دەریبهێنین لەوانەیە بتوانین چەقۆیەک یان گوێزانێکی لـآدروست بکەین ." .

بەوجۆرە من و حسێن دە ڕۆژ بەنۆرە خەریکی ئەو پارچە ئاسنە بووین، تا پانمان کردەوە، ئینجا بە بەردێکی زبر دانمان بۆی دروستکرد. هەرکە دەمەکەی تەنک و تیژ بوو، بڕیارماندا قژەکانمان ببڕین و هەندێکمان ویستیان ڕیشیان بەنۆرە بتاشن. لەودەمەدا (عەبدوڵا) ژمارە (19) بازنەی گسکێکی دیکەی دەرهێنا، قسەیەک هەبوو دەمزانی دەڵآ: "بەوشکی بۆی بتاشن" واتا برادەرەکەمان چی پێخۆش نەبوو بۆی بوو. لەحاڵەتی خۆشمدا ئەم قسەیە تەنها خواستراو نەبوو: ڕیشم بە سابوون و تۆزێک ئاو تاشی، ڕیشم زۆر هاتبوو، قەف قەف دەمبڕی، بێگومان ئاوێنەشم پێنەبوو.

تەنانەت ئەگەریش ئاوێنە هەبووایە، ڕووناکی نەبوو. وەکو کوێر ڕیشم تاشی. کوێر ببووم. چۆن دەمتوانی بەخۆمی بسەلمێنم کە کوێر نیم؟ دەمبینی بآئەوەی ببینم، زیاتر خەیاڵم دەکرد لەوەی ببینم.

گوێزانەکە بەسەر پێی ئەم دەست و ئەو دەستی کرد، پرۆسەی (ڕیشتاشەکە) مانگێک یان زیاتری خایاند، بەڵام گوێزانەکەی دیکە حسێن، کە لە هەموومان لێزانتر بوو، پێنج دەرزی لـآدرووست کرد. بەسەعات خەریکی ڕنینی گوێزانەکە بوو، تا زۆر باریک بآ و بتوانی کەرتی کات بەگوێزانێکی دیکە، بیکاتە چەند بەشێکەوە، پاشان لەهەر بەشێک و کونێک دروست بکات بۆ ڕەتکردنی دەزوو.

سەرمامان بوو هیچ کەل وپەلێکمان پێنەبوو، کاتێ دەستگیرکراین جل وبەرگی تەنکمان لەبەربوو، ئەوەیش لەمانگی تەمموزدا بوو، جلی هاوینەمان لەبەربوو.

بۆ خۆشبەختی کراس و پانتۆڵی ئەوانەمان هەڵدەگرت کە دەمردن. ئێستا دەرزیمان هەیەو دەتوانین شوێنە دڕاوەکانی جلەکانمان بدوورینەوە. دەتوانین دوو سێ سوخمە بۆ ئەوانە بدوورین کە لە ئێمە لاوازترن. سەرما دوژمنی گەورەمان بوو. بە ڕێک وپێکی پەلاماری دەداین، یان لەرزی لێدەهێناین، یان تووشی سکچوونی دەکردین، ئەمەیش بواری هیچ شیکردنەوەیەکی نەبوو. ئاساییە کە سەرما تووشی سکچوون ناکات، بەڵکو ترس دەبێتە هۆی. هەرکە وشکە سەرما دەهات نەماندەتوانی دەستەکانمان بەیەکیانەوە بساوین، یان دەست لەسەروچاوی خۆمان بدەین. وشکایی مردوومان تێدا دەڕۆیشت، ئەوجایش دەبووایە وەستابایەن، بەشانی چەماوەو سەری نەویەوە هەڵدەسامە سەرپێ، هەندێ جار بەچوارمشقی دەمامەوەو، لەزیندانەکەمدا بەئاستی هێڵی سووچەکەوە ڕێم دەکرد، هێندە سەرما بوو نەیدەهێشت بیربکەمەوەو، گوێم لە دەنگی برادەرەکانم بێت، وەکو وێڵی بیابان تراویلەکە ببینێ، سەرماکە هێندە سەخت بوو هەموو شوێنەوارێکی دەسڕیەوە، وەکو بڵێی کونکەری کارەباییەو پێستە کون دەکات و خوێنی لێئانایەت. چونکە خوێن لە دەمارەکاندا مەیی بوون، گرنگ ئەوەیە چاو نەنووقێنی، نەخەویت، ئەوانەی لاوازیی وای لێدەکردن خەویان لێبکەوێت، لەماوەی چەند سەعاتێکدا دەمردن، چونکە خولی خوێن لە خوێنبەرەکاندا دەوەستاو دەمەیی و، شەختە لە مێشک و دڵ جێی دەگرتەوە، بۆئەوەی بەرگری ئەو سەرما سەختە بکەین، دەبێ بەئاگابین، پێیەکانمان بجووڵێنین، لەشوێنی خۆمان بجووڵێنەوە. قسەبکەین، قسە لەگەڵ خۆمان بکەین، گوێ نەدەین بە دەرزیاژنەکانی، نکووڵی بوونی بکەین و ڕەتیکەینەوە. بابا، (ال سعداوی)یان ئێوارەیەک هێنا بۆلامان، لەسەرما ڕەق بوەوەو مرد. دووان بوون، درێژو لاواز بوون، ئەویدیکە ناوی (جومعە) بوو، بێدەنگ بوو، هەرکە گەیشتن شەکەت بوون، دیاربوو ئەشکەنجەدرابوون. زۆر بەزەحمەت ڕێیان دەکرد، پاسەوانێک هات و هەریەکەیانی فڕێدایە زیندانێکەوەو وتی:

"کوڕانی قەحپە ئێوەم بەهێمنی هێنا، هەردووکیان کوڕی قەحپەن لەئێوە زیاتر، چونکە هەردووکیان خائینن، لە ئێوە خائینترن، ئەوان پێیان وایە گوایە بیابان خاکی مەغریب نیە". هیچ شتێکمان نەدەزانی دەربارەی ئەو بیابانە، ئێمە لەدوورەپەرێزێکی تەواودا دەژیاین، جاری وا هەبوو دەگمەن هەواڵمان پێدەگەیشت، لەزمانی پاسەوانەکانەوە دەمانبیست، کە باسی برادەرەکانیان دەکرد لە بەرەی شەڕ، لەکاتی ڕێپێوانی سەوزدا لەژێر خاک زیندەبەچاڵ کرابووین، سات ناساتێ لە پاسەوانێکەوە گوێمان لێدەبوو دەیووت:

"لەوانەیە سوودێکتان لێببینین: بتانخەنە پێش بۆ پاککردنەوەی ئەو ڕێگایانەی کە ئەو خوێڕیە خائینانە مین ڕێژیان کردوون. ئەو جاشە بەکرێگیراوانە کە جەزائیر هانیان دەدات بۆ زەوتکردنی بیابانەکەمان. هەر هیچ نەبێ کە یەکێک تەقینەوەی مین پارچە پارچەی دەکات، یا یەکێک لە سەربازە قارەمانەکانمان نەبێت، یا یەکێک بێ لە ئێوە، خائینی نیشتیمانەکەی؟"

مەرگی (بابا) چەند ڕۆژێک سەرقاڵی کردین، پاسەوانەکان پێیان وابوو خەوتووە، بەڵام دراوسێکەی ئەوی تەنیشتی زیندانەکەی پێی وتن گوێی لە هەناسەی نیە، بە نووکی تفەنگەکانیان هەوڵیاندا هەڵیسێنن. نەجووڵایەوە، مردبوو، سەرەڕای هەموو شتێ یەکێک لە پاسەوانەکان وتی: "انا لله وإنا اليه راجعون."

بەدەنگی بەرز دەستمان کرد بە قورئان خوێندن، پاسەوانەکان کە بینیان ناتوانن تەحەمولی ئەو کەشە تازێبارە بکەن لێیاندا ڕۆیشتن، ئاسمان خۆڵەمێشیەکی تۆخ بوو، باران بەخوڕ دەباری، ڕاوڕەسمی ناشتنەکە سەرپێی و خێرا

بەڕێوەچوو، سەرمای دەرەوە هەندآ خۆشتر بوو لەسەرمای ناوەوە. کاتآ (بابا) هات دیشداشەیەکی شینی لەبەربوو، دیشداشەیەکی فش و درێژ، ئەویش جل وبەرگی تەقلیدی خەڵکی بیابانە، توانیمان هەڵیگرین، یان بتوانین بەزۆر لەدەستی پاسەوانەکانی دەربێنین. توانیمان بۆ خۆم و حسێن لە کوتاڵی ئەو دیشداشەیە سآ پانتۆلڕ و پێنج کراس و چوار کلاسین بدوورین، ئیدی چۆن مەرگی بەقازانج دادەنێین بۆ ئەوانەی لەدوای خۆی ماونەتەوە؟ ڕەحمەتمان بۆی ناردو نوێژمان بۆ ڕۆحی کرد، لەوپەڕی باشووری مەغریبەوە هاتبوو تا لەناو ئێمەدا بمرێت. بەڵام (جومعە) رووخساری تووندو ڕەق بوو. هەرکە بەئاگاهاتەوە لە سروشتی شوێنەکە کە لێی بوو، هەستی کرد ئەو چاڵە وەکو گۆڕی بەکۆمەڵی ئێمە وایە، قیژەیەکی بە ناڵەی بۆکرد. بەردەوام بوو، پاشان کەوتە وتنی گۆرانی خێڵەکەی خۆی، بەرلەوەی بە ڕۆژو بە شەو نوقمی بێدەنگیەکی تەواو ببێت، نەدەخەوت، لەبەرئەوەی باڵا درێژ بوو، چوارمشقی دادەنیشت، جارناجارێک ورتەورتی بآواتای دەهاتآ.

هەرکە گوێی لـآبوو (کەریم) مانگ و ڕۆژو سەعاتی دیاری کرد، هێندآ هێور بووەوە، یەکسەر وتی:"ئەو ڕۆژە بۆیە هاوارم کرد، چونکە نەمدەتوانی شەو  و ڕۆژ لێک جیابکەمەوە، تەنانەت خەریک بوو شێت بم. ئا ئێستا دەزانم کە چی ڕوودەدات، براکانم داوای لێبوردن دەکەم، بەئاسانی ئێمەیان تووش کرد، ئەمە تەڵە بوو، خیانەت بوو، دوای مەرگی (بابا) خۆشەویسترین کەس لەبەر دڵم، ئیدی گوآ نادەم، بڕوام بە شۆڕش هەبوو، تەنانەت پێمان وابوو دەتوانین گەلی مەغریبی بەلای خۆماندا رابکیشین و پشتگیری کێشەکەمان بکەن. بەڵام هەڵە بووین، جەزائیری و کوبییەکان یاریان پێکردین. من لە مەراکش لەدایک بووم، وەکو ئێوەم، کاتآ هاتن بۆ ڕازیکردنم زۆر بەحەماسەوە بووم" پێم وترا:

"گەردەلوولی شۆڕش هەمیشە لە باشوورەوە هەڵدەکات. ڕۆیشتم بۆ باشوور، ناوی خۆم گۆڕی بە ناوێکی دیکە، بوومە جەنگاوەر لە سوپای بیاباندا."

قسەی دەکرد بۆئەوەی نەخەوآ، گوێمان لە قسەکەی دەگرت، بەڵام من بیرم لە مەسەلەیەکی دیکە دەکردەوە، خەونم بەوەوە دەبینی پارچەیەک لە دیشداشە شینەکەی بەرکەوێت. هەموو شتێکم دایە ئەوانی دیکە، ئەوەتا لەسەرما هەڵدەلەرزم، جووتەگونم زۆر ئازارم دەدەن، هەوڵم دەدا بەناو لەپەکانم گەرمیان کەمەوە، بەڵام جمگەکانم خەریک بوو دەیانبەست. دەستەکانم بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ توانای گرتنی ئامێری زیندەمیان نەبوو ، ئەگەر پارچە کوتاڵێکم دەستکەوێت بەلانی کەم دەتوانم جۆرە پێچنێک دروست بکەم و دەیانپۆشم.

چاوەڕآ بووم تا لە قسەکەی ببێتەوە، ئەنجا داوای ئەوەی لـآبکەم، هەرکە لە کپی تاریکیە داخراوەکان گوێم لە دەنگی کوتاڵەکە بوو، دەدرەوشایەوە، لەخۆشیا ڕاپەڕیم و سەرم کێشای بە میچەکەوە، پاشان وتی: "دەیکەمە پریارسکەیەک و بۆت فڕێدەدەم."

بەڵام، وەکو فیلمە بەتەشویقەکان، کوتاڵەکە نەکەوتە ناو زیندانەکەمەوە، بگرە کەوتە بەردەم دەرگاکەی، چۆن هەڵیبگرمەوە؟ بە چ ئامرازێک؟ ئەگەر پاسەوانەکان چاویان پێی بکەوێت خێرا دەستی بەسەردا دەگرن، حسێن پێی وتبووم کە گسکەکەمان لای خۆمان هەڵگرتووە، لەم زیندانەوە بۆ ئەویتر ڕەتکرا تا دەستم کەوت، ئەوجا کەوتمە گەڕان بۆ پارچە کوتاڵەکە، گسکێکی کوێر لەناو دەستانی کوێردا! لەسەر سک لەزەویەکە درێژ بووومەوە، دەستم بە داری گسکەکەوە بۆ دەرەوە درێژکردبوو، بەدوای کوتاڵەکەوە دەگەڕام، دوای سەعاتێک لە هەولڕ و تەقەلا پرۆسەکە سەری گرت، هەڵهەڵەیەکم لێدا، هاوارێکی بیابانم دەرپەڕاند، وەکو هاواری سووریێستەکان دوای سەرکەوتنیان لە

**جەنگێک لەگەڵ سوپای ئەمریکادا. ئەوشەوە نەخەوتم، خۆم گەیاندە پارچە کوتاڵەکە کە تۆزێ لەسەرما دەپارێزێ، بۆ ڕۆژی دواتر چووم بەلای دووربنی ئەوەی کە لەو سەرمای تەزیوە دەمپارێزێ.**

( 8 )

**لە وەسفی قاوەی خەراپدا دەڵێن: (ئاوی گۆرەوی)، زۆرجار ئەو لێکچوواندنەم بۆ ڕۆژانی یەکەمی دەستگیرکردنمان بەرکادەهێنا. بەڵام ڕاست نەبوو، بێگومان ئاوی گۆرەوەی تام وبۆنێکی ناخۆشی هەیە، بەڵام شیاوی خواردنەوەیە، تەنانەت زۆریش، ئەوەی بەیانیان پێمان دەدرا، گوایە قاوە بوو بە ئاوی شلەتێن و، تێکەڵێ بە کەرەستەی نەشەویاتی برژاوی کوتراو. مەحاڵ بوو بەتەواوی کە بزانین چیە. لەوانەیە نۆک بێ، یان فاسۆلیای سوور، بەتەئکید نە قاوە بوو نە چایش بوو، بەڵام بەتەواو چی بوو؟ پرسیارەکە بەسەرسووڕماوی مایەوە، چونکە لە گەدەدا وەکو دەرمانێکی تایبەت دەبێتە هۆی دڵ تێکچوون و ڕشانەوە، تۆ بڵێی شلە هۆقنەیەکی پاشەڵ بێت؟ یان تێکەڵەیەکی میزی حوشترو میزی فەرماندەی سەربازگەکە بێ؟ بێئەوەی بپرسین کە بەتەواوی چیە قووتمان دەدا. نان، بەڵێ، بەشێکی نانی سپیمان هەبوو وەکو بەردی نەشارد، کەمترین ڕادەی تینی گەرمایی هەبوو بۆئەوەی لەبرسان نەمرین و، چەند بیرم لەوە دەکردەوە کە پزیشکێک هەر خەریکی ژمارەی سوعرەکانە کەی پێویستمان پێی هەیەو، لە ڕاپۆرتێکدا تۆمارکراوە بۆ ئەم مەبەستەو کیژێکی سکرتێری لێوسوورکراوی دەرپۆقیوو بە ئامێری چاپ تایپی کردوەو، قژەکەی لەدواوە کردووەتە کێکێکی بەرز، پاشان پێشکەش بە ئەفسەرەکە دەکرێت کە ڕایسپاردووە ئەوەی بۆ بکات، نانەکە وەکو تایەی ئۆتۆمبیل وابوو، ڕەق و، ئەستوورو، بێتام بوو، سوێند دەخۆم بە هەرکەسێکی دا بکێشێت دەیکوژێت، نانێک بوو لە چیمەنتۆ دروستکرابوو، ناجوورێ، بگرە دەکرمێنێت.**

**زۆربەشمان ئازاری دانمان هەبوو، خواردنی ئەو نانەش ببووە منەتێکی زیادە. زۆرمان ئاوە گۆرەویەکەی بەیانیانی هەڵدەگرت بۆئەوەی بەشە نانەکەی خۆی پێ بخوسێنێ. بەڵام ئەوانی دیکە پارچە پارچەی دەکەن و ئاوی نەشەویاتەکەی ڕۆژانەی پیادەکەن، نەشەویات، نەشەویاتی خەمۆکیم و، هاوڕێم و، میوان و، عادەتە زۆرەملێکەم و، مانەوەم و، ڕقەکەی ناوەوەم و، خۆشەویستیە فەوتاوەکەم و، سووتاو و، تووڕدراو و، بەشە سوعرە گەرمیەکەم. شێتیە سەرکێشەکەم، نەشەویات دەیخۆم و پاشان لەگەدەم دەریدەکەم وەک بڵێی لەزەتێکە. نەشەویاتی بەیانیان و ئێواران، وەکو ئەوەی دکتۆر بینووسێت، دەرفەتی گۆڕینی بۆ نیە، جۆراوجۆریش ناکرێت، دەبێ لەش ڕابێت لەسەر نەشەویات تا دەمرێت، نانی وشک، نەشەویات بە ئاو کوڵاو، بێ بەهارات و بێ ڕۆن، هەفتەی جارێک بەبەزی حوشتر دەیکوڵێنن، بۆنێکی سووتاوی ناخۆشی هەیە، بەڵام ئەوەی لە قاپەکەم هەیە دەیماشێنمەوەو لووتی خۆم دەگوشم.**

**پێم باشتر بوو –ئەوەی کە دەیڵێم لەم چاڵەدا واتای هەبێ- بڵێم نەشەویات بەئاو کوڵاو. هەمووومان تاکە سیستمێکی خواردنمان پێ پەیڕەو دەکرا، هەمان نەشەویات و دووبارەبوونەوە تا مردن. بەمجۆرە هەژدە ساڵم بردەسەر، ڕێک شەش هەزارو شەش سەدو شەست و سێ ڕۆژ، هیچمان نەدەخوارد جگە نەشەویات و نانی وشک نەبێ. نەمدەزانی گۆشت یان ماسی چیەو، نابێ بڵێم خواردنم دەخوارد بگرە بەزیندوو ماینەوە، هەر زوو جگەرەم لەبیرچووەوە. تەنانەت هەستم بەو**

بێبەش بوونە خراپە نەدەکرد کە(لەعەرەبی) ژمارە (4) تووشی شێتی کردبوو. هاواری دەکرد، ئەو تاقە کراسەی هەیبوو دەیدڕی، بانگی پاسەوانەکانی دەکرد، رازی بوو هەموو شتێکیان بداتآ لەجیاتی جگەرەیەک و دەیووت:

"ئەگەر رازی نیت جگەرەیەکم بدەیتآ، وەرە تەنیشتمەوە دانیشەو لێگەڕآ با ئەو دوکەڵە هەڵمژم کە بیری دەکەم، چیت دەوآ بیبە، بەڵآ، دەزانم کە من هیچم نیە.. تەنها فنگم نەبآ.. پێتی دەبەخشم و لەئێسقان زیاتر هیچی پێوەنیە.. بەڵام مژێکم بەرآ، تەنها مژێک و دواجار بمکوژەو، فیشەکێک بنآ بە فنگمەوەو وەکو رۆکێت بۆی دەردەچم بۆئەوەی بۆ هەتاهەتایە بگەمە دۆزەخی جگەرەکێشەکان. دەی، لەبیریکە کە هەردووکمان دوژمنین، لەبیرت نەچێت هەردووکمان خەڵکی وڵاتێکین، لەپێناوی جگەرەیەک دەتوانی بچیت بۆماڵمان و لەوآ پارەو جل وبەرگت دەدەنآ." ..

)لەعەرەبی) مانگرتنی لە نانخواردن راگەیاند و لێگەڕا بمرێت، لەماوەی مانگێکدا ناڵەی دەهات :

)دەمەوآ بمرم.. بۆ مەرگ لەسەرخۆ دێت؟ کآ هاتنی دوادەخات و نایەڵێ بۆلام دابەزێت و، خۆی بکاتە ژێر دەرگای زیندانەکەمەوە؟ جووتآ سمێڵی پێوەیە، پاسەوانێکی دڵڕەقە، رێگای خۆی دەبرێت، چەند مردن سەختە کاتآ بیمانەوێت بمرین، مەرگ گوێم پێنادات، بەڵام لێگەڕآ با رەت بآ، باش پێشوازی بکەن، ئەمجارەیان من دەبات! رزگارم دەکات، چاک ئاگاداربن، کۆسپ بە دەنگی دوعاکەمەوە هات. ماڵئاوا، ئەی قوتابیە ئەفسەرەکان، ماڵئاوا شۆڕشگێڕەکان، ماڵئاوا هاوڕێیان، ئەوا کۆچ دەکەم، بەتەئکید کۆچ دەکەم و، لەوآ بەبێ کۆتایی جگەرە دەکێشم.(..

زۆرجار مەرگ لێی هەڵەی دەکرد، دوای هەفتەیەک بەسەرچوو بەسەرئەو شەوەی کە مەرگی تیا بینی بردیەوە. (لەعەرەبی) کوڕێکی چاک بوو، بەردەوام نیگەران بوو، خزمەتگوزارو هەندآ ساکاریش بوو، لەپۆلدا، لە (هرمومو) لە دەرنەچووان بوو، یەکسەر دوای کۆدەتاکە دەرەجەکەیان لێی دەسەندەوەو، دەیانکردەوە بە دەرەجەداری بچووک، تەنها مەسەلەکە چەند رۆژێک بوو، توانای بەردەوام بوونی نەبوو، فایلەکەی پشتگوێی خرا، رۆژی جووڵانەوەکە لەگەڵ ئەوانی دیکە خۆی بە لۆریەکدا هەڵگژان، بآئەوەی بزانآ بۆکوآ دەچێت و چی دەکا. کاتآ جگەرەی دەکێشا دەیجوو، دیاربوو ئەوە تاکە خۆشیی ئەوبوو. لە دوارۆژەکانی هێندە گۆڕابوو بە بنیادەم نەدەچوو، هەردوو چاوی زەق و سوورهەڵگەڕابوون و، قەراغ دەمی کەفاوی بوو، ئێسکەکانی سەروچاوی دەرپەڕیبوون، سەروچاوێکی پڕ بەدبەختی و پڕ رق و کینە، مامۆستا (غەربی) لەکاتی ناشتنیدا قورئانی دەخوێند، رووناکی زۆر ترسناک بوو، بەهار بوو. تا توانیم چاو و سیەکانم لەو رووناکیە پڕکرد. هەمووان چاویان لەمن کرد. (غەربی) برێک وەستا، چاوەکانی نووقاندو پڕ بەسیەکانی هەوای هەڵمژی و، پاشان دەمی کردەوە وەک بڵێی هەواکە قووت دەدات. بەڵام پاسەوانەکان لێمان گەڕان ئەم تەرم بە خاک سپاردنە زیاتر بقۆزینەوەو، ماڵئاوا، بۆ بەیەکگەیشتنێکی نزیک! لەوآ یەکدەگرین، لەوێ پەنا دەبەینە بەر خوداو رەحمەتی (انا لله وانا اله راجعون.(

بچووکترین گومانم نەبوو دەربارەی ئەو مەسەلەیە، نە موڵکی شا بووم و نە هی فەرماندەی گۆڕستانە ژێر زەویەکەو، نە هی پاسەوانە چەکدارەکان، تەنها هی خوا بووم. ئەو تەنها رۆحم پێی دەگات و سزای دەدات. تووندوتیژی سەرۆکی سەربازەکانمان بەلاوە هیچ نەبوو، بروام بە خوای بەرزو مەزن و مێهربان و گەورە زیادی دەکرد، کە ئاگای لە هەموو شتێکی زەوی و ئاسمانەو ئاگای لە دڵان و چارەنووسی خەڵکی هەیە. ئەو رووناکیە لەو رۆژەی مانگی ئەبریلدا، نیشانەی رەحمەتی خۆی بوو. دوای ئەوە هەستم بە دەروون روونی و دڵنیایی کردو، هەستم کرد کە ئامادەم بگەڕێمەوە بۆ کونەکە. بۆ پاککردنەوەی زیندانەکەی (لەعەرەبی) خۆبەخشیم کرد. بۆئەوەی بەرگەی بۆنی ریتن و رژانەوە بگرم، وێنەی رووناکی و بەهارەکەم دەهێنایەوە بیری خۆم. تەنانەت ناچار نەبووم کە هەناسەی خۆم بگرم. لەیەک کاتدا لە

دوو جآ بووم، لێرەو لەشوێنێکی دیکە، بە مزە مز گۆرانیەکم دەووت. وەک بڵآی دڵم خۆشە، بڕیارمدا خەمۆکی و رقبوونەوە لە دەروونی خۆم دووربخەمەوە، وەکو چۆن بیرەوەریەکانم دوورخستەوە. زەوییەکەم دەشۆری ئەو شوێنەی وردە نان و نەشەوییات تێکەلڕ ببوون و بۆگەنی کردبوو، بۆنی ڕژانەوەو گەناوی، دەبی بۆنی رەنگی هەبێت، پێم وابوو رەنگی سەوزباوێکی بەڵەک بەڵەکە، یان ئەوەتا هەموو شتآ رەشەو تەقەلام دەدا رەنگ بۆ شتآ دابنێم، بۆ جێگایەک کە جگە لە بۆگەنی و رەشهەڵگەڕاو چیدی لـآ نیە. ئەوە مەشقێکی بەسوود بوو بۆم، هەرکە یەکسەر گەڕامەوە بۆ زیندانەکەم، خۆم شۆری، تۆزێک هەستم بە حەوانەوە کرد، وەک بڵێی رق لێبوونەوە لەوەدایە کەسمان بۆنی خواردنێکی بۆگەن نەکات..

(9)

ئەوانەی کە لەناوچوون لەبەر برسیەتی نەبوو، بگرە لەبەر رق و کینە بوو. رق پیاو لاواز دەکات، لەناوەوە لەش دەخواتەوەو دەستگای بەرگەگرتن تووش دەکات، کاتآ رق و کینە لەناوەوەماندا جێگیر دەبآ، مەسەلەکە بەدارڕزانمان کۆتایی دێت، دەبوو ئەو تاقیکردنەوەیەم بکردبایە بۆئەوەی هەستم بە مەسەلەیەکی ئاوها ئاسان بکردایە. مەشق پێکەرێکم بیردێتەوە لە فێرگەی (هرمومو)، نامەردو کەساس و خەمۆکی بوو، هەردووچاوی زەرد بوون، وەکو رەنگی رق، رۆژێکیان نەهاتە ریزەوە، وتیان خراوەتە نەخۆشخانەوەو ماوەیەکی دوورودرێژی لـآدەمێنێتەوە، لەبیرم نیە تووشی چی هاتبوو، بەلآم دەیانووت جادووی ژنێک لە چیا لێی داوە، کە دەستدرێژی سێکسی کردووەتە سەر کچی ژنەکە. چۆن دەتوانین رقمان نەبێتەوە سەرەڕای ئەو هەمووەی پێوەی دەتلێینەوە؟ چۆن دەتوانین لەو جەلادە بآ رووخسارانە گەورەترو میرخاستر بین؟ چۆن بتوانین هەستی تۆڵە سەندنەوە تێپەڕکەین کە هەستێکی وێرانکەرە؟ هەرکە دڵنیابووم کە لەنێوان مردووە پێشینەکان کەسانێک هەبوون رق و کینەیان لەناخی خۆیاندا لەئامێزگرتبوو، هەستم کرد کە ئەوانە یەکەم قوربانیەکان بوون، ئەو کەسەیش ئەو بیرەی لەمێشکمدا چەسپاند، (روشدی) بوو، ژمارە (23)، پیاوێکی رۆح سووک و هێمن بوو، زیرەک و وریا بوو، زۆرجار لەدڵی خۆمدا دەمووت بەهەڵە پیشەکەی خۆی هەڵبژاردبوو، چی ئەوی بۆ سوپا هێنابوو؟ ئەو لە شاری (فاس) لە بنەماڵەیەکی گەورە بوو، بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندو رقیان لە سوپا دەبووەوە، دیاربوو تاکەکانی خێزانەکە پێیان وابوو، کوڕانی شاخ و لادێیەکان تەنها ئەوان دەچنە سوپاوە، خێزانەکەیان تەقەلایان دابوو، منداڵەکانیان خوێندنی بالآ تەواوکەن، بۆئەوەی ببنە گەورە فەمانبەرانی دەوڵەت، یان ببنە گەورەپیاوانی کار، روشدی لەو ناوەندەوە هاتبوو، رقی لەوە دەبووەوە کەسێک ئەوەی بیرخاتەوە، لە سوپا خۆی ناونووس کرد بۆ ناڕەزایی دەربڕین دژ بە دایک و باوکی و، بۆئەوەی رەچەڵەکی خۆی لەبیرچێتەوە، رەگ وریشەی هەڵکێشآ و، لە پەروەردەکردنی نیمچە ئۆروستوکراتی دوورکەوێتەوە، حەزی لێبوو تێکەڵی هەموو ناوەندێک بێت، بووینە برادەر، جۆرە رێکەوتنێک کۆی کردینەوە، وابزانم هەردووکمان، روشدی و من، هەستمان دەکرد قوماندار (ئا) پیلان دادەنێت بۆ کۆدەتایەکی سەربازی و، کاتآ فەرمانمان بۆ هات سواری لۆریەکان بین، تەماشای یەکترمان دەکرد، چاوانمان دەبریسکانەوە، لەوانەیە بەهۆی فرمێسکەوە بێت یان بەهۆی ترس لە چوونە ناو نادیاریەوە بآ، سەرنجی ئەو قسە دوورودرێژەماندا لەنێوان قوماندار و یاریدەری دەستەڕاستی عەتا، بەلآم کاتی بەرێکەوتنمان بێدەنگیەکی کپ بوو، روشدی جگەرە لەدوای جگەرەی دادەگیرساند. بەدرێژایی وەخت سەری داخستبوو،

پێم وابوو دەگریا، روشدی پەشۆکا بوو، شۆک ببوو، لەکاتی پەلامارداني کۆشک پێی وتم خۆم دەدەم بەدەستەوە، دەلەرزی. بەسەر تفەنگەکەیدا کەوت و گوللەیەک بەر شانی کەوت و لەهۆش خۆی چووە. کاتآ سەرلەنوآ لە بەندیخانەی قونەیتەرە یەکمان بینی، پێی وتم ئەو هێشتا تێناگات بۆچی لێرەیە، دەیووت ئەو هیچی نەکردوە، ئەوە هەڵەیەکی گەورە بوو، زوڵمە، ئەنجام بآئومێد بووم لەوەی قەناعەتی پآبهێنم بەواقیعی حالڕ رازی بێت. ئەو دەربارەی تۆڵەو کوشتن نەبآ باسی هیچی نەدەکرد.

تووشی نەخۆشی رق ببوو کە چاکبوونەوەی نیە، دەیویست هەمووان بکوژرێن: پاسەوانەکان، دادوەرەکان، پارێزەرەکان، خانەوادەی شاهانە، ئەوانەی کە هۆی بەندکردنی بوون. هەرکە گوێزراینەوە بۆ تزمامارت، ئەوەندەی نەخایاند تا ئەقڵی تێکچوو، نەیدەزانی چی دەڵآ، بەڵام لەسەر رقی خۆی مایەوە. لەناوەوە هانی دەداو دەیخواردەوە، وای لێدەکرد لەگەلڕ خودی خۆی نامۆبێت. لەوماوەیەدا کەسمان لێنەمردو نەماندەتوانی چاومان بەیەک بکەوێت. زۆرجار بانگم دەکرد، بەڵام وەڵام نەبوو، جگە لە هاوارو قیژەی ئاژەڵێکی بریندار نەبێت، ئەویش دەیویست پەلە لە مەرگی خۆی بکات، بەڵام مەرگیش لەگەلڕ جەلادەکانماندا پیلانی دەگێڕا لە هاتندا سەبری دەکرد، رۆژێکیان داوامان لە پاسەوانەکان کرد کە رێگەمان بدەن چاومان پێی بکەوێت بۆ چرکەساتیک، بێگومان رێگەمان پێنەدەدرا لەو قۆرتە بێینەدەرەوە، بەڵکو رێگەمان بدەن سەردانی بکەین و چرا کارەبایەکەیش لە پاسەوانەکە بخوازین، بەڵام رەتکردنەوەی نالەی کردو ببڕای ببڕ بوو هەڕەشەی کردو جنێوی دەدا، ئەوەبوو مانگرتنمان راگەیاند، لە قسەکردن مانمانگرت، بەبآ قسە، بەبآ جووڵە، تەنانەت هەناسەشمان حیسابی بۆکرابوو دەنگی لێوەنەدەهات، چەند دەقیقەیەک لە بآدەنگی خامۆش و قورس و نارەحەت، کە فێڵ بوو بۆئەوەی پاسەوانەکان ئەقڵیان بپەڕێت، دەستیان کرد بە قیژەقیژ، بەقۆنداغە تفەنگ لەدەرگاکانیان دەدا، بەڵام وەکو مردوان بآدەنگ ماینەوە. بآدەنگی و تاریکیەکان میزاجێکی بەپیتن بۆ دەرپەڕاندنی جنۆکە، ئەمەیش بێگومانە. یەکێک لە پاسەوانەکان بانگی کرد: جنۆکە "دەی، با بڕۆین لێرە، ئەم شوێنە جنۆکەی لآیە، سوێندتان بۆ دەخۆم ئەجنەیەکی چاو پرشنگدارم بینی. با ئەم خوێڕیانە بەجآبهێڵین بۆ ئەجنە، ئەوانیش لەهەمان تیرەن، لەهەمان تاریکی و نتکی، دەی، خێراکەن با بڕۆین."

بەترسەوە رۆیشتن، بەڵام ئێمە دڵخۆشی خۆمان دەربڕی بەقاقای پێکەنین، وەکو چۆن جنۆکە دەداتە قاقا پێکەنین.. (روشدی) مان بەر لە مردن نەبینی. ئەو پاسەوانەی کە هات بۆ تەماشاکردنی مردوەکە. تاوێک ترس دایگرت، کاتآ بە لایتەکە رووناکی خستە سەر سەروچاوی مردوەکە، گەڕایە دواوەو هاوارێکی ترسناکی لێبەرزبووەوە، خێرا دەرچووە دەرەوەو لایتەکەی بەجآهێشت، هەوڵماندا بە کلکە گسکەکە دەست بەسەر لایتەکەدا بگرین ، بەڵام درزی نێوان زەویەکەو ژێر دەرگاکە تەسکتر بوو لەوەی کە پیا رەت بێت. هەرکە پاسەوانێکی دیکە بۆ رێکخستنی کاروبارەکان هات، بەیەک وشەیش توانجی نەدا، بەڵکو ئاماژەی کرد بۆ من و حسێن، بۆئەوەی تەرمەکە بشۆرین و کاری ناشتنەکە لە شەوا بکەین، دیار بوو دەرجەداری گروپ بوو. ناوی (مەفازلڕ) بوو.

هەرکە لەدەوری تەرمەکە کۆبوینەوە پێی وتین:

"جاری داهاتوو کە مانبگرن، دووپشکتان تآبەردەدەم، ئەوجا بابزانین کآ لە ئێمە جنۆکەیە، بەڕاستی ئێوە یان من؟ دەی.. ئەو بۆگەنە فڕێدەنە چاڵەکەیەوە."

بەیەک دەنگ بە فاتیحا خوێندن وەڵاممان دایەوە، یەکەم سوورەتی قورئانە، پاسەوانەکانیش بەتووندی رووەو دەرگای چاڵەکە پاڵیان پێوەدەنایین، (مەفازلڕ)یش میزی بەسەر بەردێکی گەورەدا دەکرد. پەندۆلە قسەکەرەکەمان پەکی

**کەوت، کەریم لەبەر جەنازەکەی شەو زۆر تێکچوو و، لەبەر هەڕەشەو گوڕەشەکانی فەرماندەی گروپەکە، وەکو بڵێی ڕێڕەوی زەمەنی ون کردبوو. لە زیندانەکەیدا گوێمان لە گریانەکەی دەبوو، کاتآ هەوڵیدەدا ڕۆژانی هەفتەو سەعاتەکانی یادکاتەوە، ئامۆژگاریم کرد کە هێمن بآ، بۆم دووپات کردەوە کە مەسەلەکان وەکو جاران دەگەڕێنەوە جێگای خۆیان، خەوت، بۆ ڕۆژی دواتر بەلاساییکردنەوەی قوولەی کەڵەشێر خەبەری کردینەوە:**

**"ئەوا سەعات پێنجە، ئەی برایانی ئیماندار کاتی نوێژی بەیانیە، ئەی موسڵمانەکان، هەڵسن لەخەو، نوێژ دوامەخەن."**

**پاش تۆزێک وتی:**

**"مەخەونەوە، مەخەونەوە، براکانم، ئاگاتان لێ بآ ئێمە لە وەرزی هاوینین، ڕۆژی سێی تەمموزی (1978)ە، کات پێنج و سی و شەش خولەکە، ئەمە کاتی دووپشکە، چاک ئاگاتان لێ بآ، دووپشکەکان گەیشتن، هەست بە بوونیان دەکەم، گوێم لێیانە، دوای سەرمایەکی سەخت و شآ، هاوین هات، هاوینی دووپشکەکان، دەبآ ڕیزەکانی خۆمان یەک خەین، خەریکە ئامێرەکەم پەکی دەکەوێت، چونکە هەست دەکەم غەریبێک لە زیندانەکەمدا هەیە، نەخێر، جنۆکە نیە، نەخێر، پیاوکوژەکانن، مۆرانەی وردن و پێوەدەن و ژەهری خۆیان دەڕێژن."**

**لە کاروباری دووپشک بووم بە شارەزا، دەیناسم و لەمەوبەریش لێم نەکۆڵیوەتەوە. دەزانم چۆن دەڕواو، لەکاتی ڕۆیشتندا چۆن خشەی دێت و، لە چ گەرمایەک پێوەدەدات و، حەزی لەکوێیە خۆی بشارێتەوەو چۆن دژەکەی دەخەڵەتێنآ. ئەم هەمووەم بە حیدس هەست پێکرد، لەو تاریکیەی کە تیدا دەژیاین، نەماندەتوانی ببیینین، بۆ یەکەمجار ئەو هاوینە دەرکەوت، هەر لەخۆیەوە نەهات، یان بەرێکەوت بآ، ئەفسەرەکە بۆ ناو چاڵەکەی بەرەڵاکردبوون، لەوە دڵنیابووم، ئەگینا چۆن پێنج هاوینمان بردە سەرو، هەستمان بەم مۆرانە ترسناکانە نەکردبوو؟ بەڵام ئەو کابرایە چۆن توانی ئەوە بکات؟ لەو بڕوایەدا نیم، هەرچەندآ زەنمان خراپ بێت، کە سەرهەنگێک یان ژەنراڵێک کۆبونەوەیەک گرێبدات، لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی دیکەی دەرەجەدار فەرمان بدات بە یەکێک لە دەستوپێوەنەکانی، بچێت دووپشک بگرێت و لەچاڵەکەماندا بەرەڵای کات. نەخێر، ئەم کردەوەیە دەستپێشخەریەکی تاکەکەسیە، ئەو ئەفسەری گوردانە، دەبی ئەو سەربازی یەک پلیتە بێت، تۆڵەی لێدەکردینەوە، نەک لە خۆشەویستی ڕژێمی پاشایەتیدا، بگرە لەبەر ڕقبوونەوەی لەو سەرانەی کە دووریان خستبووەوە بۆئەو ناوچە دوورە، بۆ پاسەوانی چەند مردوویەکی زیندوو، یان بە بارێکی دیکە، بۆ پاسەوانی ئەو ڕزگاربووانەی کە بە مەرگی لەسەرخۆ حوکدرابوون. وەکو کەریم پێی وتین، دەبآ خۆمان بۆ مەسەلەکە ئامادەبکەین. دوای ژەمی خواردنی نەشەویاتی ئێواران، لە زیندانەکە بەپێوە وەستاین، بەڵام من لەبەر بەرزی باڵام نووشتامەوە، ژمارە (21) –(واکرین)ی ڕووخۆش پێی وتین کە لە منداڵیی لە (تفراوت) بە ڕاوەدووپشک گەمەی کردوە، شوێنێکی زۆر گەرم و وشکە، پێی وتین کە دوپشک مۆرانەیەکی غەدارە، بەڵام زیرەک نیە، حەزی لێیە خۆی بە بەردەوە بنووسێنێت، بەڵام ئەگەر بکەوێت پێوە دەدات. ئەوەی دەیووت ڕاست بوو، چونکە دەبوو بێدەنگی بووایە، بگرە بێدەنگیەکی خامۆش، بۆئەوەی ئەو شوێنە دیاری بکەن کە دووپشک بۆی دەچێت، مادامێکی گوێمان لە خشەیەتی. بەدڵنیاییەوە دەزانین کەی لەسەر سەرمانە، ئەگەر بەسەرماندا کەوت دەبآ ئەو شوێنە دیاری بکەین کە لێی کەوتووەتە خوارەوە، بۆئەوەی دوورکەوینەوە لەوشوێنەی کە ترپەی کەوتنەخوارەوەی لێوەهات. بۆئەوەی لەوەدا سەرکەوتووبین، دەبآ نەخەوین، حسێنی برادەرم هەرکە خەو بردیەوە پێوەی دا، بەدەنگی بەرز بانگی پاسەوانەکانمان کرد، بەڵام تا بەیانی نەهاتن، بەڵام هەرکە هاتن و ئەوەیان هێنا کە پێی دەڵێن قاوە،**

**(واکرین) لێیان پارا‌یەوە بۆئەوەی ڕێگای بدەن ژەهرەکە بمژێت، حسێن پلەی گەرمای بەرزەوەبوو، ئەو بەستەزمانە وڕێنەی دەکرد. پاشان (واکرین) کاتآ ژەهرەکەی دەتفاندەوە پێی وتین:**

**"گەرما چل وهەشت سەعات بەردەوام دەبێت، گرنگ ئەوەیە نەخەون" ..**

**-پێویستمان بە خەو نیە .**

**دەنگەکە وتی:**

**- شێتی چاوی تێبرپیووین..ئەویتر وتی:**

**چیرۆکی دووپشکەکان ئەمە پیلانێکە بۆ کوشتنمان.**

**دراوسێی دەستەڕاستم ئەوەی سەرنجدا..**

**- بەڵام ئەمە لەگەڵ ئارەزووی دەستەڵاتدا نیە، وامان لێبکەن کە بە مژی بچووک بمانکوژن.**

**وتم:**

**"- با دەسەڵات چی پێخۆشە وابکات، کاری خۆیەتی! تەنانەت دڵنیام جیهان سەرجەم لەبیری کردووین، ئەوەی حوکمی بەسەرا داین و تووڕی داینە ئەم چاڵەوە، کێشەکە ئێستا ئەوەیە لەپاسەوانەکان داوابکەین ڕووناکیمان بدەنآ، بۆئەوەی ئەو مۆرانە کوشندانە لە زیندانەکەمان دەرکەین، (غەربی) کە نازناوی ئوستادی هەبوو" .**

**بەدەنگێکی هێمنەوە ئەمەی وت.**

**"ڕووناکی چیە! ڕژێم سەرجەمی لەسەر تاریکی دامەزراوە، لەسەر ئەو تاریکیە ئەنگوستەچاوە، ئەو تاریکیەی کە ترس لە نەبینراو شین دەکات، ترس لە نادیاریی. مەرگ لەو ناوە دەسووڕایەوە، لەوآ بوو. بەڵام نابآ بزانین لەکوێوە دەستی خۆی دەوەشێنآ، نە چۆن و، نە بەچی چەکێک. دەبآ لەژێر ڕەحمەتی ئەو شتە بین کە نایبینین، ئەمە ئەشکەنجەیەو، هەوەسی تۆڵەیە. "چەند جار لەبەرخۆمەوە دەمووت:**

**"باشە، پیلانمان گێڕا بۆ کوشتنی، لە هەموو شوێنێکدا بۆی گەڕاین، لەنێو داواکارانی کوشتنەکەی و دۆڕانمان. ئێمە تەنها سەربازبووین، جگە لە دەرەجەدار هیچی دیکە نەبووین، لە یەخەی ئەو چارەنووسەمان گرت، فەرمانمان جێبەجآکرد، بۆچی یەکسەر نەیانکوشتین؟ تەنانەت لە وڵاتێکی وەکو فەرەنسادا، ئەو کەسەی تەقەی لە ئۆتۆمبیلەکەی ژەنرال (دیگۆڵ) کرد گوللەباران کرا. ئەمە مەسەلەیەکی سروشتیە، بۆچی لە دادگا دادگایی کراین و، بە دەساڵ زیندانی حوکم دراین، بۆئەوەی دواجار بەمەرگی هێواش حوکمان بدەن؟ بۆچی چارەنووسی ئەو ژەنراڵانەی نەخشەی کۆدەتا سەربازیەکەیان دانا، ڕووبەڕووی تیپەکانی مەرگ بوونەوە، دوای ئەوەی پلەکانیان لـآسەنرایەوە، لەکاتێکدا ئێمەی دەرەجەدارو مەشقدەری ئەفسەرە قوتابییەکان بووین، دەبآ هەتاهەتایە ئەشکەنجە بچێژین و، مەرگی لەسەرخۆ تاقی بکەینەوە، مەرگی فاسق، شاز، ئەو مەرگەی یاری بە مێشکمان دەکات و، یاری بەو تۆزە کەرامەتەی کە ماومانە دەکات؟ دووبارەبوونەوەی ئەم قسەیە سوودی چیە؟، ئێمە دەست وپێوەنی ئەوانە بووین هەڵیان کردبوو، ئەوانەی**

تاوانیان کردبوو: ئیدی بۆچی لەژیاندا ماوین، بۆچی زیندەبەچاڵمان ناکەن، تۆزێک هەناسەمان دەدەنآ بۆئەوەی بژیین، ئەشکەنجەبکێشین؟

"لەرۆژێکی داهاتوودا بەبآ رق دەبم، ئازادی خۆم دەگەڕێنمەوە ئاخیریەکەی و، ئەو دەردەسەریەی تووشی بووم دەیگێڕمەوە، ئەوەی چەشتوومە دەینووسم، یان دەیکەمە کتێبێک، نەک بە مەبەستی تۆڵەسەندنەوە، بەڵکو بۆئەوەی بیگەیەنم، لە فایلی چیرۆکەکەماندا هەڵیگۆزم، بەلآم ئێستا هەوڵدەدەم قسە بکەم، لەگەلڕ خۆمدا قسە بکەم، بۆئەوەی خەو نەمباتەوە، تا نەبمە نێچیرێکی لەبار بۆ دووپشکەکان. قسەبکەم، لەقە لەقە بکەم، سووک سووک سەری خۆم بکێشم بەدیوارەکەوە، دەپرسم دووپشکەکەی من لەکوآ خۆی مات داوە، دەشآ خۆی لەنێوان دوو بەردی سێیەم و چوارەم ، ئەو درزە خۆی شاردبێتەوە، کە کاتآ بە لێزمە باران دەبارآ بارانی لێوە دێتەژوورەوە. گوێم ئەو خەبەرەی دامآ، لەلایەکی دیکەوە بەچۆکدا هاتووم، ئەمە گرەوە. بڕوام بە حیدسی خۆم هەیە، هەرکە پێوەی دام (واکرین) خێرا فریادەکەوێت و ژەهرەکە دەمژێت، لەسەر مەسەلەکە راهاتبوو، خەریک بوو خەوم لێدەکەوت، هەناسەی خۆم دەگرم، هیچ جووڵەیەک نیە، وەکو یەک وایە، خەریک بوو بەرگریم نەدەکرد، بەچوارمشقی خۆم دایە دەستی خەوەوە"

ئێشێکی خەست لە پشتم بەئاگای هێنامەوە، پێوەدانی دووپشک نەبوو، ئازاری پشتم سەریهەڵدابووەوە، تۆ بڵێی نەخۆشی جومگە بآ؟ یان قۆڕیە؟ یان دەمارەکانم سەرمایان بووە؟ لەکوآ بزانم؟ تەنها بەردەوام دەبآ پشتت چەماوە بێت، مەسەلەکەیش تووشی تێکچوونی بڕبڕەی پشتت دەکات، سوودی چیە ئەگەر هۆیەکانی ئەم ئازارانەیش بزانیت؟ ئەو هەمووەی دەتوانی بەرامبەریان بیکەیت، ئەوەیە دەبآ بەرگەیان بگریت و، لەگەلێیان ژیان بگوزەرێنی و هەوڵدەدەیت لەبیریان کەیت، هەریەکێک لە ئێمە شوێنێک لەلەشی یان لە مێشکیدا تووشی تەلەف بووە. هەموو نەخۆشیەکانمان زۆر بوون و، هەموو ئێش و ئازارەکانمان، پزیشکێکیش نیە، ئەمەیە بنەماکە. هیچ پزیشکێک ئیشی بەمجۆرە شوێنە نیە، گەرچی رۆڵی پزیشک ئەوەیە ئەوەیە دژ بەنەخۆشی ململانآ بکات، تا ملی پآ کەچ بکات و، بەسەریدا زالڕ بێت. بەلآم لێرەدا مەسەلەکان بەپێچەوانەوە بەڕێوەدەچن، وەکو ویستیان وابن. ئەگەر نەخۆشی لەشوێنێکدا کەوتەوە، دەبآ رێگای پآبدرێت گەشەبکات و، بەهەموو لاشدا بلآوبێتەوەو، گواستنەوەی درمەکەی بۆ هەموو جەستە ساغەکان و، دەبآ کاری خۆی بکات، هەمو ئازارێک دەرخواردی جەستە بدات. کەس بۆی نیە خۆی تێوەردات، بەهەرحاڵێکیش بێت. کەس نەبوو قسەی لەگەڵدا بکەین. داخوازیەکانمانی بۆ بەرزکەینەوە، وەکو لە قونەیتەرە وەهابوو. لەوآ ئەفسەرێک هەبوو، قوماندار بوو بۆ جارێکیش چاومان پێی نەکەوتبووە، دەتووت تارماییە، سێبەرە، کەسێکەو دەبآ هەبێت، بآئەوەی ناچار بێت خۆی دەرخات، لەوانەیە دەنگێک بێت و زنجیرەیەک لە فەرمانی زۆردارانەو توندوتیژ دەرکات، لەڕێگەی دەنگی ریکۆردەوە، راستتر وایە دەنگی ئەکتەر بێت، کاتآ پاسەوانەکان بیانەوێت هەندآ لوتف بنوێنن، بەڵێنمان دەدەنآ کە مەسەلەکە بخەنە بەردەم قوماندار —وەکو ناویان لێی نابوو- بەلآم رۆژێک چیە وەلآمی یەک داواکاریمان دەست نەکەوت. بۆیە گەیشتینە ئەو ئەنجامە، کە قوماندار بوونی نیە. زیاتر ئەندێشەیەکی بیابان بەولاوە هیچی تر نیە، وەها هەڵس وکەوتمان دەکرد، وەک بڵێی لەوێدا هەیە، لە دووری سەدان مەتر لەدەرگای چاڵە داپۆشراوەکەمانەوە، ئایا دەکرێت ئەو زیندانیانە جیاوازانە بسپێردرێنە قوماندانێک ئێوارەیەک لە بارێک لە مەراکشدا یان لە دارولبەیزا دانیشتووە، بەدەم قسەوە رۆیشتووە لەژێر کاریگەریی مەی و هەستی پەشیمانی دان باسی ئەو زیندانە بچووکە دەکات، (تزمامارت) کە، لەسەر نەخشەی مەغریب دەکەوێتە نێوان رەشیدیەو ریشەوە، قوماندار، ئەفسەرێکی شاراوەیە، خۆی لەخۆیدا ترس بوو، پاسەوانەکان وەها باسیان دەکرد، وەک بڵێی پارچە ئاسنێکەو، نەرم نابێت، بنیادەم نیە، ئەم دەسەلآتەکانی لەدەستدایە، دەیانووتەوە: "قوماندار کابرایەکە لە ئاسن."

دواجار، مەبەستم دوای ماوەیەکی درێژ بەسەرچوو، بۆم ڕێکەوت ڕووبەڕوو قوماندار ببینم، یەکسەر هەستم کرد ئەو کابرایە لە کانزایەکی ڕەق هەڵکەنرابوو، وەکو برۆنز، یان جۆرە فلزێک لەدایک ببوو بۆ خزمەتکردن، هەموو فەرمانەکان جآبەجآ بکات، لەئاسانترینیانەوە بۆ ناشیرینتریان، شوێنەواری هیچ هەستێکی پێوە دیار نیە، فەرمانەکان وەردەگرێت و بەدەستێکی ئاسنین جآبەجێیان دەکات. پێش ئەوەی ئێمەی پی بسپێرن، مەشقی لەسەر سەربڕینی چەند بەدبەختێک کردبوو، ژمارەیەکی دیکەیشی زیندەبەچاڵ کردبوو، بەوردەکاریی شارەزایەکەوە ئۆپۆزسیۆسۆنەکانی ڕژێمی ریسواکردبوو، لەڕووداوی ئۆتۆمبیل چاوێکی لەدەستدابوو، دەیووت ئەوە ئیرادەی خودایەو هیچی تر.

لەنێوان ئەو هەشت پاسەوانەدا دووانیان زۆر دڵڕەق و خراپ بوون، (فەنتەس) پیاوە ددان ئاڵتوونیەکە، لاواز بوو، درێژ بوو، هەمیشە تفی دەکردو زۆر ناکەسبەچە بوو، هەرکە دەمی بکردایەتەوە تەنها قسەی ناشیرین و جنێوی دەداو، ئێمەیش خۆمان لێی دوور دەگرت و وەڵاممان نەدایەوە، لێی دەگەڕاین لە دڕندەیی خۆیدا پەلەقاژە بکات. پاشان پێمان گەیشت کە راپۆرتی لەسەر ئەو هاوڕێیانەی دەنووسی، کە بە مامەڵەکردن لەگەڵ ئێمەدا لەناکەسبەچەییدا لە هاوشانی ئەو نەبوون، بەلاوازیی تاوانباری دەکردن و، تەنانەت بە سۆزداری لەگەڵ (سەگ و خائینەکاندا.(

ڕۆژێکیان (فەنتس) دیارنەما، ماوەی دوو مانگ گوێمان لە دەنگە گڕو فیکەی تفەکەی نەبوو، هەرکە هاتەوە گۆڕابوو، دەرگای زیندانەکانی دەکردەوەو داوای لێبوردنی دەکرد و، بەهۆی ڕووناکی چراکەوە توانیم سەروچاوی ببینم، کە هەڵیگرتبوو و، دەیدا لەسەروچاوی خۆی، دەگریاو رستەی سەیری دەووتەوە:

"داوای لێبوردنت لـآدەکەم، بەدفەساڵ و بەشێوەیەکی ناشیرین ناکەسبەچە بووم، تفم دەکردە خواردنەکەتانەوەو، لەگەڵ لم تێکەڵم دەکرد، ڕقم لێتان دەبووەوە، چونکە فێری ڕقبوونەوە کرابووم و، ئاواتەخوازبووم مردنەکەتان هێواش و بەئازار بێت، شایانی ئاگری دۆزەخەم، لەبەرئەوەی لەبەرامبەرتان کردوومە. خودا سزای دام، هەردوو کوڕە نۆبەرەکەی لـێسەندمەوە، لەڕووداوی هاتووچۆو مردن، قەزای خودا جێبەجآ بوو، لێرە هیچم نەماوە بیکەم، منیش دەمرم، هەموو شتآ تەواو بوو، بەڵآ بە خۆشبوونتان یارمەتیم بدەن بڕۆم."

دوای چەند مانگێک (فەنتس) مرد، لەبەرئەوەی مانی لە نانخواردن گرتبوو. پاسەوانەکەی دیکە ناوی (حەمیدۆش) بوو، ئەویش زۆر ناکەسبەچە و دڕ بوو، دەشەلی، بەهۆی کەوتنەوە تووشی هاتبوو، هەرکە بینی (فەنتس)ی هاوڕێی چی بەسەرهات، ئەویش تۆقی و داوای لێخۆشبوونی دەکرد! بەڵام پاسەوانەکانی دیکە بەبآدەنگی فەرمانیان جێبەجآ دەکردو، کەمێک پەیوەندیان لەگەڵماندا هەبوو، لە چاکەی سەرۆکەکەیان دەترسان. هەرگیز واتای نەبوو ئەگەر بمانوتبایە:

"نەخۆشم، ئەم بەیانیە هەست دەکەم تەواو نیم، مەسەلەکان وەکو جاران نین" ..

درێژەدان بە بیرکردنەوە لەوە چ سوودێکی هەبوو، ئەگەر بیڵێین یان بەخۆمانی بڵێین؟ نەخۆشی حاڵەتی هەمیشەییمانە، چونکە دەبآ هەموو ڕۆژێک شتێک لە تەندروستیمان لەدەست بدەین، تا توانەوە، تا کۆتایی، ئەو هەمووەی هەمانبوو بریتی بوو لە لەش و مێشک. یەکسەر ئەوەم هەڵبژارد کە بەهەر ڕێگایەک بآ سەروهۆشی خۆم بپارێزم، دەستم کرد بە پاراستنیان، لەش بەهەرشێوەیەک بآ دووچارە، چونکە موڵکی ئەوانەو هەڵسوکەوتی پێدەکەن و ئەشکەنجەی دەدەن، تەنانەت بێئەوەی دەستیشی لێبدەن و، ئەندامێک یان دوو ئەندامی لێدەردەهێنن لەبەرئەوەی هیچ چارەسەرێک ناکرێن. دەبی بیرم دووربێت لێیان، دوورە دەستیان بێت، ئەو تاقە مانەوەمە بەڕاستی و، سەربەستی و داڵدەو

**هەڵاتنمەو، بۆئەوەی بەزیندوویی بیهێڵمەوە پێویستی بە راهێنانە، بە وەرزشەو، وەکو کردم بۆئەوەی دووری بخەمەوە، نەخێر بگرە ئەو بیرەوەریانەش بسڕمەوە کە بەرەو هەڵدێرم دەبەن، بڕیارمدا بیرکردنەوەم بخەمەکارو، بەشێوەیەکی موتڵەق و ترسناک ئاشکرایە. بەختی قوتاربوونم لەیەک لەسەدا تێپەڕناکات، گەرچی بەتەمای ئەو بەختەنەبووم، لەبەر خۆمەوە دەمووت:**

**"ئەگەر موعجیزەیەک رووبدات و سەرلەنوآ لەدایک ببمەوە، منداڵێک دەبم، لە تەمەنی چل یان پەنجا ساڵی، گەرچی بەتەمای موعجیزەیش نەبووم، هەرکە لە چاڵەکە دەرچووم، دەچم دەست بە بەردە ڕەشی کابەوە دەگرم لە مەکە، ئەو بەردە ڕەشەی کە شوێن پەنجەی ئیبراهیمی پاراستووە، کە بیری بە بیری جیهان تێکەڵ بووە، ئەو رزگاری کردم، هێشتا بڕوام بەوە هەیە، نازانم بۆچی بیرکردنەوەم لەسەر ئەو هێمایە جێگیر بوو. ئەمە خاڵی رآ پیشاندەرم بوون و، هەروەها لەودیوی شەوەوە پەنجەرەم بوو ، هەرکە دەیکەمەوە دەزانم رۆژهەڵات چیە، هەوڵدانم بۆ بیرکردنەوەیە، دەست بگرم بەسەر شێوەی هەناسەدانمدا و سووربوونم لەسەر بیرۆکەیەک، وێنەیەک لەسەر بەردە پیرۆزەکە کە هەزاران کیلۆمەترو سەدان سەدە لە زیندانەکەمەوە دوورە ، وایلێکردم جەستەی خۆم لەبیرکەم، هەستم پێی دەکرد، دەستی لێدەدەم، بەڵام بەرەبەرە لێم جیابووەوە، هێندە بیرم دەکردەوە دەتبینیم دانیشتووم، دڵنیام، پشتم چەمانۆتەوە، پەراسووەکانم دەرپەڕیون، وەکو دوو مێخسکە هەردوو ئەژنۆم نووشتانوەتەوە، هەرکە تێم رادەمێنآ، دەبمە رۆحێک لە دەوری چاڵەکە دەخولێمەوە، هەموو جارێک ئەمە رووی نەدەدان، هەمیشە تەقەلای تێڕامان ناتگەیەنآ بەم جۆرە ئازادیە، مەسەلەکەیش پەیوەندە بە ساردی و گەرمیەوە. هەستم دەکرد کە بارودۆخی مادی شیاو نیە بۆ ویستی ئازادبوونی فیکر لەو دۆزەخەدا. دۆزەخ شتێکی خواستراو نەبوو، وشەیەک نەبوو بۆ کڵپەکردنی بەدبەختی، بگرە دۆزەخ لەناومان و لە دەورمان بوو، تەنانەت بۆمان بەسوودیش بوو، چونکە رێمان دەداتآ قەبارەی هێزی خۆمان بپێوین و، وزەمان بۆ بەرگەگرتن و بۆ خەیاڵ کردنی جیهانێکی تر –نامادی- بمانگرێتە خۆی زەمەنی برینێکی زیاترو بۆ خوێنی وشکەوەبوو، بگرە بە برینێکی دیکە" .**

**لەو دۆزەخەدا رۆژان و شەوانمان هەبوون، رۆژانی برسیەتی و شەوانی نەخەوتن و، زۆرجایش هیچ شتێکی تر نەبووین. بۆیە ئەوانە بەجێیانهێشتین خراپ بوون لەگەڵ رۆژان و شەوانی خۆیاندا، وەهمێکی چەپەڵیان نەدەپاراست، یان ئەوەی بۆ خۆکوشتن بردنی جگە ژەهری وەهمەکان هیچی دیکە نەبوو، بۆیە درکم کرد کە کەرامەتیش ئەوەیە واز لە هیوا بهێنی، بۆئەوەی رزگارمان بێت، دەبی واز لە پاڕانەوەو خەسڵەتی قەناعەت بهێنین، چونکە بەهیچ شتێک ناچێت کە قەناعەت بەوە بهێنآ فرێی داینە ئەم چاڵەوە، بارمتەی نەخشەکەیان نەبوو، بگرە تەنها بەئیرادەی خۆمانەوە نەبێت، رەتی کردەوە کە بارمتەی خووی ئەو هیوایە تەلەف بووە بین. هیوا هەموو خەسڵەتەکانی نەفیکردنی تیا بوو، چۆن قەناعەت بەو پیاوانە بهێنین کە هەمووان وازیان لێیان هێنا، کە ئەو چاڵە تەنها نێوانێکە لەژیانیانداو، دەخرێتە ژێر تاقیکردنەوەیەک و لێی دەرباز دەبن، بەخاوەن شەوکەت و باشترین حاڵەت؟**

**هیوا درۆیەک بوو تێکەڵ بە چاکەی هێورکردنەوە، بۆئەوەی تێپەڕی کەین دەبووایە هەموو رۆژێک بۆ خراپتر خۆمان ئامادەکردبایە، ئەوەی درکی بەوە نەکردایە لە بآئومێدیەکی تووند نووقم دەبوو و ئەنجامیش دەمرد.**

(10)

زراوم شێت و هار بوو، تاڵاوی زۆر دەڕژاند، چالاک دەبێت و لەو شلە تاڵە نووقمم دەکات، من لە تاڵیدا نوقمم، هەرچیم هەیە تاڵی لـآدەچۆڕێ، دەمی قوڕینم، ورگم تاڵی کاوێژ دەکات، زمانم قورسەو، تفم خەستە، دەمبینی لە دیزەیەکی تاڵیدا نوقمم، بە دوو دەستی نامۆ بە زۆر تێدا مەلەدەکەم، سەرم پردەبآ لە بەڵغەمێکی سەوز، لووتم دەگرییێت، پاشان تەقەلا دەدەم بیڕژمم، تەقەلایەکی مەزن دەدەم بۆئەوەی هەرچییەک وڕەزم دەکات دەریکەم، بەڵام ماسوولکەکانم تووندن و جمگەکانم رەقن. وەک بڵێی یەکێک بە پەتێک شەکەتی داوون بۆئەوەی جووڵەنەکەن. بۆئەوەی بەبآکەڵکی بمێننەوە، دەستەکانم تۆقلەیان کردو پەنجەکانم بوونە دوومەلڕ، هەست دەکەم شلەکە لە هەموو جەستەمدا بەرزدەبێتەوەو دادەبەزێت، پێستەم ئازارم دەدات، بۆ ساتآ بیردەکەمەوە کە تاڵیەکە وشک بووەتەوەو لەگەدەمدا وەکو تیلماسکێکی دڕکاوی ڕێگەدەگرێتەبەرو ونجڕونجڕی دەکات. ئازارەکە بێگەردیەکی ناوازەم پآدەبەخشێت، ئازار دەچێژم، بەڵام دەزانم دەبآ چیبکەم بۆئەوەی ئەم پیلانە بوەستآ، دەبآ بڕژێمەوە، ئەو تاڵاوە هەڵبێنمەوە کە بەسەر هەموو ئەندامەکانمدا دەڕژێت و، بۆئەوەی ئەمە بکەم، دەبآ پەنجە بکەم بەدەممەوەو، زۆر لە گەرووم بکەم بۆئەوەی هەموو شتێک هەڵبێنمەوە. هەرکە یەکێکمان تەندروستی باشە دەبێ ئەم پرۆسەیەمان پآوایە یاری منداڵانە. بەڵام کاتێ جەستە تاڕادەی ڕەقبوون بە ئازارە، هەموو جووڵەیەک سەخت دەبآ. دادەنیشم و پشتم دەدەم بەدیوارەکەوە، دەستی راستم گۆجە، بەدیوارەکەوە نووساوە، وەک بڵێی بەکەلەبچە پێوەی بەستراوەتەوە. دەبآ لەسەرەخۆ رایکێشم و، بەجووڵانەوەیەکی بآهەست بەرزی کەمەوە بۆ دەمم. ئەمە بەدەم ئاسانە، بەڵام زۆر مەحاڵە ئەگەر هەوڵمدا، هۆشی خۆم ئاڕاستە دەکەم و تەنها لەباڵم بیردەکەمەوە، ئێستا بوونی هەموو جەستەم لەو باڵەدایە، من بە باڵێکم لەسەر زەوی دانیشتووم، دەبآ هەموو هێزێک بدەمە خۆم بۆئەوەی هەڵسم، هەرکە چاوی تێبرێم دەتوانم تامە تاڵەکەی ناودەمم لەبیربەرمەوە، هەست بە هیچ ناکەم، تەنها بە سووکە ئازارێکی جومگەکانم نەبآ، دەست لە ئازارەکە دەدەم. هەست دەکەم دووردەکەوێتەوە بآئەوەی بڕەوێتەوە. سەرم دادەنەوێنم بۆئەوەی لەدەستمی نزیک بکەمەوە، تاڵیەکە تێمدا هەڵدەکشێت، تا خەریکە هەست بە تاسان دەکەم. خێرا سەرم هەڵدەبڕم و دەیکێشم بەدیوارەکەوە. پاشان باش چەسپی دەکەم و پلانەکەم دەگۆڕم، ئەنجا دەست خۆی بەرزدەبێتەوە بۆ دەم نەک بەپێچەوانەوە، پرۆسەکە چەند سەعاتێک دەخایەنآ. دەستی چەپم دەکەمە پشتیوانم، لەهەموو کونەکانی جەستەمەوە ئارەقەم لـآدەتکآ. چەند دڵۆپەیەک دەتکێنە سەر دەستم، گرنگ ئەوەیە نەجووڵێمەوە، بیر لە هیچ نەکەمەوە جگە لەوەی کە دەستم هەڵبرم. هەست دەکەم کرێنێکی زۆر بچووک لە میچەکەوە دێتەخوارەوەو لەدەستم دەگرێت و، پاشان زۆر بەوریایی بەرزی دەکاتەوە بۆ دەمم، سەیری میچەکە دەکەم، هیچ نابینم، بێگومان لەتاریکیدا هیچ نابینم، بەڵام بەلانی کەمەوە خەملی شتەکان دەکەم.

زەمەن واتای خۆی لەدەستدابوو، دەمبینی زیادەڕۆیی دەکردو تەنها خەریکی دەست و باڵ گۆجکردنی من بوو، هەرکە دوای چەند سەعاتێکی زۆر بتوانم دەستم بخەمە دەممەوە، تۆزێک دەوەستم بۆئەوەی چێژ لەو سەرکەوتنە هیچ وپووچە وەربگرم. پاشان زۆر لە زمانم دەکەم، بەڵام تاڵیەکە یەکسەر لەزمانم دەرنایێتەدەرە، کاتآ یەکەم بڵقی دەست و قاچم تەڕدەکات، موچرکێکی فەرامۆشیم پیادێت، سەرلەنوآ جەخت لە خۆم دەکەم و بەهێزێکی گەورەترەوە دەڕژێمەوە. بووم بە کانی تاڵی، هەست دەکەم گەرووم دەخورێت و چاوەکانم زەق بوون و، فرمێسک بە روومەتمدا دێتەخوارەوە، ئەو ژەهرەی کە گەرووی دەسووتانەوە لەناوەوەم نەما، بەسووکی و پەرۆشە خۆم بۆ گەیشتن بەحاڵەتی وەجد، ئەو حاڵەتەی کە بە هیچم نابەستێتەوەو، پەیوەندی بە زینەوەرو شتەکانەوە ناکەم، لە هەموو شتێک دووردەکەومەوە، لە خۆم و لەوانەی ئەو دەردەسەریانە نازانن کە ئێستا پێوەیان دەتلێمەوە، خۆم لەتەنیاییەکی قەشەنگدا دەبینمەوە، ئەو تاکە شنەیەیە

**کە لەسەر بانیژەی تەنیاییەکەمەوە هەڵدەکات، دەگەمە شەیدایەکی دوای ماندووییەکی مەزن، لێرە، دەبمە دەست پێنەگەیشتوو، وەکو مەلێکی بەختەوەر دەفڕم، زۆر لەو شوێنە دوورناکەومەوە کە جەستەم لێی بەجآهێشتووە، لەترسی ئەوەی نەبا بێن و ببەن و بیخەنە چاڵەوە، جەستە، ئەمەیش راستە بەهێواشی هەناسەدەدات و، خۆی وەها نیشان دەدات مردووە، یان نووقمی لەخۆچوونە..**

**هەرکە بەئاگاهاتمەوە زیندانەکەم لە هەموو لایەکەوە بۆگەنی لێدەهات، هەستم کرد گەڕاومەتەوە بۆ جەستەی خۆم، حاڵەتی خۆشگوزەرانیم لـآڕەویەوە. بۆیە سەرلەنوآ خۆم ئامادەکرد بۆ رووبەڕووبونەوەی ناخۆشیە رۆتینیەکان. هەڵسام و ئەو ئاوەی لە زەوویەکە مابوو دەرمهێناو، ئەو شەوە بەپێیەوە نووستم، سەرما لە پەنجەی پێمەوە بۆ سەرم هەڵدەکشا، لەکوآ بیویستبایە لەوآ بۆ خۆی دەوەستا، هەندآ کات لەلای سکمەوە دەوەستا، لەو شوێنەی کە لاساری و رق و بێزکردنەوەی خۆی بەجێدەهێڵآ، سەرما بەلای منەوە سەروچاو و دوو دەستی هەیە، یان راستتر وایە دوو چڕنووکی هەیە، چزەی لە جووتە گونم هەڵدەسان و بەسەر خۆمدا دادەهاتمەوە، بۆئەوەی بەرگەی چزەکەی بگرم، وەکو هەورەتریشقە بەدرێژایی جەستەم دەهات و دەچوو، بە قاچم دەمکێشا بەزەویەکەوە، بۆئەوەی رێگەی نەدەم زاڵ بێت، دەستم دەکرد بە وەرزشەکەی خۆم و، لەترساندا رۆژەکانی رۆژم دەووتەوە، نوێژی پێنج فەرزە هەبوو هەموو پیاوچاکێکی موسڵمان لەسەریەتی جێبەجێیان کات.**

**لەشم پیس بوو، ئاوی پاک نەبوو دەسنوێژ بگرم، بۆیە بە کپی نوێژم دەکردو بەپشتی هێزێکی باڵا، هێزی دادپەروەری، خواو پێغەمبەرانی و ئاسمان و دەریاو شاخ و دەشت:**

**"رقم لە خۆم دووردەخستەوە، ئەو خەسڵەتە وێرانکەرە، ئەو ژەهرەی دڵ و جگەر کاول دەکات، وام لێنەکەیت تۆڵە بخەمە ماڵانی دیکەو ویژدانەکانی دیکەوە،تواناى لەبیرچوونەوەم بدەرآ، نارەزایی دەربڕم و ئەوە رەتبکەمەوە بە رق وەڵامی رق بدەمەوە، بمخەرە جێگایەکی دیکەوە، مەبەست بۆ ئەوەی واز بێنم لەم گیرۆدەییە کە رێگام لێدەگرێت. واتا لوتفە، لەسەرمە لەم جەستەیەی خۆم دەرچم کە بەخۆم ناچێت، چاو دەبڕمە بەردەکانی دیکە، ئەم تاریکیە شیاوی منە، چونکە ناوەوەم باشتر دەبینم و، روونتر ئەو شڵەژاویە دەبینم کە تێیدام، سەر بەم جیهانە نیم، هەرچەندآ پێیە تەزیوەکانم لەسەر زەویە ئیمەنتۆ شێدارەکەیە، هێندە پشتم چەمانەوە بڕبڕەی پشتم زۆر ئازارم دەدات، نەخێر، نەخێر هەست بە ئازار ناکەم، دڵنیام کە هەست بە ئازار ناکەم، هەست بە هیچ ناکەم، بەدەنگی نوێژەکانمەوە چووم، نەخۆش نیم، لێرە نەخۆشیی نازانم چیە ئەشکەنجەیش هەرجۆرێک بێت. خودایە، لەتۆوە فێربووم کە جەستەی تەندرووست ئاگاداری جوانی گەردوونمان دەکاتەوە، ئەوە دەنگدانەوەی ئەوکەسەیە جوانی دەنوێنآ، ژیان و رووناکی دادەهێنآ، ئەوە رووناکیە، رووناکی ژیانە، هەرکە لە ژیان دوورخرایەوەو، دوورەپەرێز کراو لە چاڵێکی تاریکدا زیندانی کرا، ئیدی ئەو دەنگدانەوەی هیچ شتێک نیەو، هیچ رەنگدانەوەیەکی تێدا نیە، بە ویستی خۆت ناکوژێمەوە تا بمێنم."**

(11)

دەبێ ئاسمانێکی تەسک هەبێت لەسەر ئەو کلاورۆژنەیە کە سەرقەپاغێکی کون کونی هەیە، ئەو کونە باخچە ناڕاستەوخۆیەی بای لێ دێتە ژوورەوە، نەک رووناکی. ئاسمانێک کە خەیاڵی بوونی دەکەم، بە وشە پڕی دەکەم. ئەستێرەم دەگواستەوە، تەرتیبەکانیان دەشێوێنم، بۆئەوەی بەو تیشکە رووناکیە بیگۆڕمەوە کە لەناو سنگمدا حەپس کراوە، هەستم پێی دەکرد کە چۆن هەست بە رووناکی دەکات؟ کاتێ رووناکیەکی باغەیی گەمە بە پێستەکەم دەکات و گەرمی دەکاتەوە، هەستم کرد کە سەردانیم بەرکەوت. ئەوەی کە نەمدەتوانی بیهێڵمەوە، لەجیاتی ئەوە بێدەنگیی بەرقەرارە، لەپڕێکا خۆی دەدا بە سەرچاوە کوێرەکانماندا، لەدەورمانەوە وەکو دەستێکی بەسۆز لەسەر شانەکانماندا دەنیشتەوە، تەنانەت کاتێ قورس دەبێت و، هێشتا پڕە لە تۆزو غوبار، ئاسوودەم دەکات و قورسایی ناخاتە سەرم، دەبێ لەوێ چەند جۆرێکی بێدەنگیی هەبێ:

بێدەنگی شەو، بۆ ئێمە پێویست بوو.

بێدەنگی ئەو هاوڕێیەی کە لەسەرخۆ بەجێمان دەهێڵن.

ئەو بێدەنگیەی کە نیشانەی تازێباریە.

بێدەنگیی خوێن کە لەسەرەخۆ رێدەکات

بێدەنگی کە بە ئاقاری رێڕەوی دووپشکەکان ئاگادارمان دەکاتەوە.

بآدەنگی ئەو وێنانەی کە جەخت لە زەینمان دەکەن.

بێدەنگی پاسەوانەکان کە واتای ماندووبوون و رۆتینە.

بێدەنگی سێبەر یادگاریە سووتاوەکان.

بێدەنگی ئاسمانێکی تاریک کە خەریکە نیشانەیەک چیە نامانداتێ.

بێدەنگیی نادیاری، نادیاری ژیانی قەشەنگ.

بەڵام ئەو بێدەنگیەی کە زۆر تووندوتیژو زۆریش سەختە، بآدەنگی رووناکیە، بێدەنگیەکی رۆچوو و فرە ژمارە، لەوێ بآدەنگیی شەو هەبوو، ئەو هەمیشە هەیەو نەگۆڕە، پاشان چەند ساتەوەختێکی بێدەنگی رووناکی هەیە، نادیاریەکەی بەردەوامە و کۆتایی نایەت، لەدەرەوەش، نەک تەنها لەسەر چاڵەکەی ئێمەدا بگرە زۆر دوورتریش لەوە، لەوێ ژیان هەبوو، هیچ سوودێکیشی نیە زۆر بیری لـآبکەیتەوە، جگەلەوەی کە من ئامادەم دەکردو بیرم ناکەوێتەوە، ژیان، ژیانی راستەقینەو، ئەمەیش پەرۆیەکی پیس و خۆڵاوی نیە، نەخێر، ژیان لە جوانیە بەتامەکەیدا، مەبەستم سادەیەکەیەتی، ئیبتیزالە قەشەنگەکەیەتی..

منداڵێک بزە دەیگرێت و دواجار دەگری، چاوەکانی دەترووکێنێ تا بیانداتە بەر تیشکێکی گەش؟ ژنێک جلێک پێوانە دەکات، پیاوێک لەسەر گژوگیا پاڵکەوتووە، ئەسپێک لە پێدەشت غار دەدات، پیاوێک هەوڵدەدات بە دو باڵی رەنگینەوە بفرێت. درەختێک دەچەمێتەوە بۆئەوەی سێبەرەکەی بخاتە سەر ژنێک کە لەسەر بەردێک دانیشتووە. خۆر دووردەکەوێتەوە، تەنانەت پەلکەزێڕینەش دەبینین. ژیان ئەوەیە کە بتوانین باڵمان هەڵبڕین بۆئەوەی لەپشتمانەوە

**ڕەتی کەین و هەست بە چێژ بکەین و، هەڵدەسین بۆئەوەی بەبێ مەبەست پیاسە بکەین، چاودێری خەڵکی دەکەین بپەڕێنەوە یان دەوەستن، ڕۆژنامە دەخوێنینەوە یان دەمێننەوە، بەئاسانی، لەودیوی پەنجەرەوە دانیشتووین، چونکە هیچمان نیە بیکەین، شتێکی جوانە کە هیچ نەکەین. پێم وابوو ژاوەژاوی ژیان لە هەموو جۆرە ڕەنگێکەو، لەنێوان درەختەکانەوە غەڵبەغەڵب دەنێتەوە، ئەو کرانەوەیەش چەند ساتەوەختێک بەردەوام دەبێت، تۆزێک خۆشی بۆئەوەی خۆم ئامادەکەم بۆ تەرکیزکردنێکی زۆرتر سەخت، تەنانەت کاتێکیش مردووم، یان باشتر وایە تەنانەت کاتێ لەلایەن خانەوادەکەمەوە بە مردوو لەقەڵەم دەدرێم، دەبوو ئەو ڕێگایەم بگرتایە بەر کە بۆ ماڵەوە دەچوو، بێ سۆزو بێهەست. چۆن دایکم دڵنیاکەم، چۆن پێی بڵێم کە من ململانێ دەکەم و بەرگری دەکەم؟ چۆن تێی بگەیەنم کە ئیرادەم ئەوەیە بە کەرامەتی خۆمەوە بوەستم، بگرە لەوەوە بۆم ماوەتەوە؟ بڕوام بە هەستی ئەو هەبوون بۆیە بە فکر قسەی لەگەڵدا دەکەم.**

**نامەیەک لەوانەیە ڕۆژێکیان بەقەڵەم لەسەر کاغەز نووسیبم، نامەیەک لەوانەیە ڕۆژێک لەلایەن ڤاسیدێکی پۆستەوە بگاتە دەستی ..**

**"دایکە بەنرخەکەم، دایکە خۆشەویستەکەم، دەستەکانت ماچ دەکەم و سەرم دەخەمە سەر شانت. نیگەران مەبە من تەندروستیم چاکە. پێم وایە دەتوانی شانازیم پێوەبکەیت، سەرت بەرزدەکەم، نەک تەنها بەرگری دەکەم، بگرە یارمەتی کەسانی دیکە دەدەم بەرگەی ئەوە بگرن کە لە بەرگەگرتن نایەت، پێت ناڵێم لێرە تووشی چی هاتووین، دەمەوێ لەبیری کەم. دەزانم کە تۆ بەدەستی کەمخەویەوە دەناڵێنی و، لەگەڵیدا سەردەکەویتە سەر شاخ و پاشان لێی دێتەخوارێ، ئاگات لە تەندروستی دڵت بێ، دەرمانەکەت پشتگوێ نەخەیت و، ئاگات لە هێمنی خۆت بێ، وروژانی مێشکی خۆت هیچ سوودێکی نیە. تونێلێکی درێژ دەبڕم، واز لە ڕۆیشتن ناهێنم، دڵنیام کە ڕۆژێک دەگەمە کۆتاییەکەی و، ڕووناکی بەچاو دەبینم و، دەبێ ڕووناکیەکی کز بێت، چونکە ڕووناکی گەش لەوانەیە کوێرم کات و، تۆیش لەوێ چاوەڕێم دەکەیت و، نانم بۆ دێنی کە بەدەستی خۆت کردوتە، نانی گەرمی چەورکراو بە ڕۆنی بەربەر. تا چەند ڕۆژێک لێی ناخۆم، تا گەدەم جگە نەشەویات شتی دیکەیش وەرگرێت، دێیت و سەرقەباغێکی سەیەفت هەڵگرتووە، تا وەکو منداڵی پێی داپۆشیت، هەروەکو لە منداڵیمدا ئاوهات دەکرد، کێشم سووک بووە، بە باوەش هەڵمدەگریت و مەتەڵی داپیرەم بۆ دەڵێیت. تا پێشکەوم بڕوام زیاتر دەبێت، نوێژ دەکەم، لە خوا دەپاڕێمەوە، خەون بە بەردە ڕەشەوە دەبینم، جاری وا هەیە لە جەستەی خۆم دێمە دەرەوەو تەماشای دۆخی خۆم دەکەم، دان بەوەدا دەنێم زەحمەتە بگەمە بێگەردی ئەوە، ئەمەیش لە تۆوە فێربووم. لەبیرتە، کاتێ باوکم ئازاری دەدایت، خەرجی ماڵەوە کە کۆت دەکردەوەو ئەویش تەخشان و پەخشانی دەکردەوەو، بێئەوەی بە خراپە باسی ئەو کابرایە بکەیت، هەر یەکێک لە ئێمە بەرپرسیاریەتیەک دەخەیتە ئەستۆی کە دەبێ بۆ خۆی ئەنجامی بدات، لەکاتی تووڕەیی و ستەمیدا نەکەی خراپە بکەیت، تۆ لەسەروی ئەو هەموووەوە بوویت و، زۆریش تۆم بەدڵ بوو، چونکە هەمیشە ئارامی مێشکی خۆت دەپارێزی، تاکە مەسەلەیەکیش کە وای لێدەکردیت لەدەستی بدەیت، ئەویش هەڵاتنی دوا هێشوو بوو، (جەرگە بچووکەکەت) لەماڵەوە بۆ ماوەیەکی کورت. پێت دەوتین" :**

**"ئێوە هەمووتان منداڵی منن، بەڵام، ئەو هەردوو چاو و هەناسەمە". ئەویش تۆی زۆر خۆش دەویست، لەبیرمە ڕۆژێکیان کە لە قوتابخانە هاتەوەو، جانتاکەی فڕێدا، پاشان وەکو عادەتی بوو، لە چێشتخانە بەدواتدا دەگەڕا، کارەکەرەکە ئاگاداری کردەوە کە تۆ ڕۆیشتووی بۆ (ڕەبات) بۆ جێبەجێکردنی مامەڵەیەکی کارگێڕانەو، چونکە ئەو بەرگەی نادیاریی تۆ ناگرێت، بۆیە لەو دۆڵابەی کە جلەکانی تۆی تیا هەڵواسراوە لەسەر خۆی داخست، بۆنی**

بۆنەکەتی دەکرد، ئەو بۆنەی کە جل وبەرگەکانت هەڵیانگرتبوو، لەبەرئەوەی زۆر گریاو ماوەیەکی درێژیش لە دۆلابەکەدا مایەوە، تووشی تا بوو، هەرکە ئێوارەیەکی درەنگ هاتیتەوە، یەکسەر چووی بۆ لای دۆلابەکەو بینیت تای لێهاتووە، بەدەم ئازارەوە پێچی دەخواردەوە، بەهۆی هەڵاوسانی گرآ کوێرەوە، ئەو شەوەت لە نەخۆشخانەی فریاگوزاری بردە سەرو، بۆ بەیانی چووی بۆ سەر ئیشەکەت، بۆئەوەی چاوت لێک نابێت، بەڵام منداڵەکەت عەمەلیاتیان بۆی کردو چاک بووەوە :

"دایکە، دەبێ دان بەوەدا بنێم کە چەند خۆڕاگر بوویت لە خواردن پێدان پێی. پارچە گۆشتت دەجووی و بەدەست دەت تەپانە دەمیەوە. بەڵام ئەو وەکو بێچوە مەلێک دەمی دەکردەوە بۆ خۆراک، پێدەکەنی و گاڵتەی پێدەکردین و، تۆیش دڵخۆش بوویت و، بێدەنگ بووی. ئێمەش گاڵتەمان بە هەردووکتان دەکرد، هەموو خۆشویستیەکم پێی دا، کە تۆ پێت نەدابوو، ئێمە جگە لە منداڵێ بەولاوە هیچی دیکە نەبووین و، هیچ شتێکمان لەوە نەدەزانی" ..

"باوکم چەند جارێک هەوڵی دابوو بتگەڕێنێتەوە، دەهاتی و خزمەتکارە پێشینەکانی خۆی لەتەختی پاشا کەلاوی خستبوونە پێش خۆی و، دیاری کوتاڵی نایابی لە ئەوروپا هاوردەو، سینی پڕ لە نانی بەشەکریان هەڵگرتبوو، دەهات و وەک بڵێی یەکەمجارە هاتووە بۆ مارەکردنت، لێت نزیک دەبووەوە، هەردوو دەستی خستبووە پشتی و، داوای لێبوردنی لێت دەکرد، تۆش دەرگات لێی نەدەکردەوە، لە کلاورۆژنەیەکی تۆزێک کراوەوە فەرمانت دەدا بەدەست وپێوەکان، ئەوانەی کە هێناویانە بیبەن بۆ ژنی دووەمی، ئەو بێئەوەی تۆ پێی بزانیت ژنی دووەمی هێنابوو، تۆیش رەنجت دەدا بە تاقی تەنیا بەبێ پشت و پەناو هیچ سەرچاوەی بژێویەک "..

سەرسوڕهێنەربووی، بە سووربوونەوە پیاوەکە دەردەکەیت، خۆشت بۆ رۆژێک نەدایە دەستەوە یان وردەت کز نەبوو، بەهێزی کەسایەتیت سەربەستیەکەت بوو و، ئارەزووت بۆ ژیانێکی بەخشندە وای لێدەکردیت جوانترو بەهێزتر بیت، نۆبەرەی منداڵەکانت بووم، هەرکە ئەگەر توانیم ماڵەکەم بەجێهێشت بۆئەوەی ئەرکت سووک بکەم، چوومە سوپاوە نەک لەبەرئەوەی حەزم لێی بوو، بەڵکو بۆئەوەی مووچەو تەهئیل و داڵدەو خواردن مسۆگەر بکەم، ئاگادارم لەوەش کە هەندآ لە مووچەکەم لەخۆمەوە بۆت رەوانە بکەم، دەزانم پێویستت بە پارە هەیەو، چونکە دەشتوانم بە هەندآ لە مووچەکە بژیم.

"تەنانەت باوکیشم بەوەی نەدەزانی کە چوومەتە ئەکادیمیای سەربازیەوە، لە بەلات سەرقاڵی ئەوە بوو کە ژیانی پاشا زیاتر خۆش کات و، بەڵاتیش ئەرکی ژنی دووەمی و منداڵەکانی و ماڵەکەیان لەئەستۆگرتووە. باوکم نەدەبینی تەنها لە تەلەفزیۆن نەبێت. هەرکە باسی چالاکی پاشایەتی دەکرێت، دەبینم لەپشتەوە وەستاوە، بأئۆقرەیە، بەویقارە، ئەم بەئەدەبە لەبەرچاوە، خاوەنی بیرێکی زۆر گەروە، بوو بە لێبوک، پاڵەوان، گاڵتەجاڕ، پیاوێکی بوێری لێهاتووە لە بێلات، پیاوێکی خاوەن گەورەترین دەسەڵاتە، خاوەن هەستێکی قۆشمە بوو، بەڵام ئێمەی نەدەهێنایە پێکەنین و، لەماڵەوە زۆر بەکەمی دەمانبینی، بەبیری تیژی و قسە پێشخەر ناوبانگی هەبوو، وەک بڵێی کتێبخانەیەکی گەڕۆکە، زۆرجار پێی سەرسام بووم، کاتآ شیعری بۆ برادەرەکانی دەوت، هەڵەی نەدەکرد، هەموو وردو درشتێکی لەبارەی زێرو خشڵە تەقلیدیەکانەوە دەزانی. بەڵام ئەم کابرایە مێردێکی خراپ و باوکێکی نادیار بوو، یان بەئاسانی، باوکێک بوو هەر خەریکی خۆی و، ئاشقی کچۆڵەی تەمەن لە بیست ساڵ کەمترو، شێتی رێکپۆشی و حەزی لە ئاهەنگ و خۆشی و بەزم بوو، مەسەلەکانی بەئاسانی وەردەگرت و رقی لەوەبوو بەتەنیا بآ"..

دایکە، هەست دەکەم خەمباریت، لەبەرخۆتەوە بڵێ کە من سەفەرم کردوە، ڕۆیشتووم بۆئەوەی جیهانێکی داخراو بدۆزمەوە، ئەوەتا خۆم دەدۆزمەوەو، هەست دەکەم، بەبەسەرچوونی هەموو ڕۆژێک و منت کرد بە چ جۆرێک، من مەمنونی ئەوەم، دەستەکانت ماچ دەکەم، لەدڵەوە بەداخەوە بۆ ئەو خراپەیەی کە تووشم کردیت، بەهۆی خۆتووشکردنم بەم کیشەیەوە، وەڵێ باش دەزانی، کە کەس گوێی لەخوێندکارو دەرەجەدارەکان نەگرت، گومانمان هەبوو کە مەسەلەکە نهێنی بێت، ئەوەی ئێمە کردمان دەبوو سەربازەکان بیکەن و، سەرکردەکانمان دوامان کەوتن، دەتوانم ئەمە بەتۆ بڵێم، دەزانم بڕوادەکەم بەوەی کە دەیڵێم: کەسم نەکووشتووە. یەک فیشەکم نەتەقاندوە، ترسابووم، ڕووی تفەنگەکەم لە خەڵکی دەکرد، بەدوای باوکمدا دەگەڕام. نازانم ئەوەم دەکرد بۆئەوەی ڕزگاری کەم یان تەقەی لێبکەم.

ئەم پرسیارە بووەتە خولیام و، لەسەرمدا بەزۆر دەنگ دەداتەوەو، ئەگەر ئەوەی لەمەوبەر ووتمە دووبارەی دەکەمەوە، چونکە دەبی لە دەوری خودی خۆمدا بخوولێمەوە.

"دایکە ئازیزەکەم دەبی بەجێت بهێڵم، گوێم لە هاواری ئازارە." ..

مستەفا، لە زیندانی ژمارە (8) بوو، دەیقیژاند، ئایا دووپشک پێوەی دابوو؟ ئازارەکەی زۆر سەخت بوو، بەدەم ئازارەوە دەتلایەوەو لەشوێنی خۆی هەڵدەبەزیەوە، پاشان بەهەموو قورساییەکی خۆی بەردەبووەوە سەر زەویە چیمەنتۆکەو، ئازارەکەی هێندەی دیکە سەخت دەبوو. نەشدەبوو پاسەوانەکان بانگ کەین، بۆئەوەی کەسی تایبەتی بانگ کەن بۆ مژینی ژەهرەکە، شەو بوو، کەریم کە بەدەم قیژەکەوە هەڵسابوو ئاگاداری کردینەوە کە سەعات چەندە:

"سەعات سێ و شانزە ولەکی بەرەبەیانی پێنج شەممەی 25 ی نیسانی 1979 یە."

مستەفا دەگریاو دەیقیژاند:

"دەمەوێ بمرم، بەڵام نەک بەم شێوەیە، نەک بە پێوەدانی دووپشکی ژەهراوی، نەخێر، ئەگەر دەبێ بمرم دەبێ بڕیاری خۆم بێت، نەخێر، ژەهری پێوەدان بۆگەنە، بەزەحمەت هەناسەدەدەم، دەخنکێم و، هەست بە سەرەگێژکە دەکەم، دەمرم، خودایە، بۆچی ئێستا؟ بۆ بەم نیوەشەوە؟."

واکرین داوای لێدەکات تا بەیانی خۆی ڕاگرێت، کاتێ پاسەوانەکان قاوە ئامادەدەکەن، ناچار دەبن ڕێگەی پێبدەن بۆئەوەی ڕزگاری کات. مستەفا هەوڵی دا خۆی ڕاگرێت، لەهۆش خۆی چوو، وامانزانی مرد، (غەربی) دەستی کرد بە قورئان خوێندن و لەگەڵیدا بەیەک دەنگ دەمانخوێند، مستەفا هاوارێکی بەرزی کرد، پاشان کپی باڵی کێشا.. هەرکە پاسەوانەکان هاتن، لەگەڵڕ بەیاندا، دەستمان کردەوە بە قورئان خوێندن، ڕێیان دا واکرین بچێت بۆ زیندانی ژمارە (8)، ئێڵنجی دا، هەموو دووپشکەکانی چاڵەکە لەسەر جەستەی مردووی مستەفا کۆبوبوونەوە. دەنگمان بەرزکردەوەو، بەلێدانی قاچ و دەستمان داوامانکرد قوماندار ئامادەبێت، بۆ ئەو چاڵە کە لەو مۆرانە کوشندانە پاک بکەنەوە.

واکرین نەیتوانی شتێک بکات بۆ مستەفای بەسەزمان و ڕزگاری کات، ئەو کوڕە لاوە ئازایە، کە ڕاهاتبووین لەگەڵی یاری کاغەز بکەین، یاریزانێکی نایاب بوو، ئەو تەنها لەناوماندا هەستی بەوەکردبوو کە ڕابواردن بەخەیاڵڕ تەنها دەکرێت، بێگومان، کاغەزی یاریمان لەلا نەبوو، بەڵام (بوراس) کە ژمارە (13) بوو کاغەزی وەهمی بەسەردا دابەش دەکردین، بە گروپی چوارقۆڵی کۆدەبووینەوەو یاریمان بە کاغەزی ئاشکرا دادەهێنا: ژمارەو جۆرەکانمان یەکدەخست و، بەگێڕانەوەی چیرۆک دڵی خۆمانمان دەدایەوە. قوماندار نەهات، بەڵام پاسەوانەکان دەستیان کرد بە ڕاونانی

دووپشکەکان و، ئێمەش خەریکی شۆردنی مردووەکە بووین لە زیندانەکەدا، هەرکە خەریک بوو تەرمەکە بەرینەدەرەوە، پاسەوانەکان گەیشتنەجی و پارچەیەک کوتاڵی رەشیان پآبوو:

"ناتوانن لێرە بچنەدەرەوە تەنها بە چاو بەستراوی نەبێت."

یەکێکمان ناڕازی بوو، گەڕانیانەوە بۆ زیندانەکەی و لەوی تیا بەند کرا. شەش مانگ بەسەر دوا کەس کە بەخاکمان سپاردبوو تێپەڕی بوو، زۆر بەزەحمەت رێمان دەکردن ، رووناکی ئاسمان لە پەڕۆ رەشەکەوە دەهاتەژوورەوە، هەستم بە چاوئێشە کرد، لە قژم و لە پێستەشمدا.. و هەموو جەستەم هاتبووە لەرزین. بەزەحمەت پێش دەکەوتین، (مووح) کە ژمارە (1) بوو، داچەمیەوەو لە زەوی شتێکی هەڵگرت و قووتی دا، یەکێک لە پاسەوانەکان هات و تفەنگەکەی ئاڕاستەکردو هەڕەشەی لـآکرد:

"ئەو مشتە گژوگیایە بگێڕەوە کە قوتت دا ئەگینا دەتکوژم."

بەڵام مەسەلەکە درەنگ کەوتبوو، چونکە بەندیەکە دەستی کرد بە پێکەنین و پاسەوانەکەی تووڕەکردو لەپشت ملی گرت و کێشای بەزەویدان، بەڵام پاسەوانێکی دیکە نەیهێشت تەقەی لێبکات. دوای ئەو رووداوە، رێگەی داین تا دە خولەک تەرمەکەی مستەفا بەخاک بسپێرین. هەرکە یەکێک لە پاسەوانەکان هات و سەتڵێک کلسی پآبوو، بۆئەوەی بیکاتە سەر تەرمەکەوە، (مووح) خۆی فڕێدایە گۆڕەکەوە، تەمەنای مەرگی دەکرد، ئێمە توانیمان دەریبهێنین و، کلسە سووتێنەرەکەی بەرنەکەوت جگە هەندآ بەر هەردوو قاچی کەوت.

چونکە سەرۆکی پاسەوانەکان ئاگاداربووەوەو، بەپەلە هات بۆ لامان دەنگی لە دوورەوە دەهاتە گوێمان، کە لەعنەتی لە ژیان و چارەنووس خۆی دەکرد کە ئەوی فڕێداوەتە ئەم ناوچە دوورانەوە:

"ئەوە دواجارە کە دەچنە دەرەوە، شتێک نیە ناوی بە خاکسپاردن بآ، تەواو، تەواو، لەمرۆ بەدواوە لە زیندانەکانتان ناچنە دەرەوە، لێی ناچنەدەرەوە، جگە بەچاوی کوژاوەوە نەبێت، پێیەکانتان لەپێش خۆتانەوەو، جەستەکانتان لە توورەکەیەکی لاستیک پێچراوەتەوە. بەبۆنەی ئێوەوە خەریک بوو بەند بکرێم، سەرکردایەتی لە (ربیات) زۆر ناڕازییە، دەرچوون لە زیندان ببڕای ببڕ قەدەغەیە. ئێوە مەحکومن بەوەی لە تاریکی هەتا هەتاییدا بژین، لەمرۆ بەدواوە رووناکی نابینن، فەرمانەکان راشکاوانەن: تاریکیی، ئاو، نانی وشک. دەی، دوورکەونەوە، خودایە، دەبآ چ گوناهێکم کردبآ تا بۆ ئەم دۆزەخە توورم بخەنەوە؟ گەرچی من بەردەوام نوێژدەکەم و، هەموو مانگی رەمەزان بەرۆژوم، زەکات دەدەم.. بۆچی منیان کردە ناو ئەم مێگەلە سەرلێشێواوە؟".

لەو رۆژەوە ئیدی (مووح) ئەقڵی لەدەست دابوو و، گوێمان لێبوو لەکاتی نانخواردنەکاندا لەگەڵ دایکیدا قسەی دەکرد:

"دایکە، ئەی دایکە، هەموو شتآ حازرە، دەی با نان بخۆین.. ئاە! ناتوانی بجوولێیتەوە، ئێستا خێرا دێم بۆلات، سینیەکەت بۆ دێنم، چێشتی (تەنجیە)(*)ت بۆ دەهێنم کە حەزت لێیەتی. ئیمڕۆ خۆت ناگریت، گۆشتەکە ناسکە، لەسەر خەڵووز کووڵاندومە، بەڕاستی تەنجیەی مەراکشیە: گۆشتی مەڕ بە زەیتی زەیتوون و بەهارات و خوآ و زەنجەفیل و لیمۆ بەسرکە، ئەگەر پێکەوە بکووڵێت بەتامە، رۆنی زۆر تیانیە، وەکو دەزانی، بەزەکەم لەگۆشتەکە کردوەتەوە، پێش ئەوەی بیخەمە تەنجیەکەوە، لێرەدا زۆر کەس جیاوازی ناکەن لەنێوان گۆشتی مەڕو گۆشتی بەرخدا. بەڵام ئەو گۆشتە لەسەداسەد مەڕە، تۆزێک نان، نەخێر، نان نا؟ ئای، شەکرە! بۆنە خۆشەکەی بۆندەکەیت؟ باشە، نە سەوزەو نە

نەشەویات: دەبێتە هۆی قەڵەوی. دایکە، دەمت بکەرەوە، خۆت عاجز مەکە، دەزانم، چاوت کز بووەو، هۆیەکەش، وەکو ئەوانی دیکە، شەکرە نەگریسەکەیە! ئەوەتا، پارچەیەکی زۆر ناسکم بۆت هەڵبژاردوە، بخۆ، لەسەرخۆ بیجووە، ئای، دەتەوآ ئاو بخۆیتەوە، دایکم تەنگەنەفەسی لەگەڵدایە، ئای لەم بەدبەختیە! دایکم تەنگەنەفەس بووە، برادەران چی بکەین؟ دایکم بەزەحمەت هەناسەدەدات، یارمەتیم بدەن، بگرە، بخۆرەوە، ئەوە ئاوی غازدارە، تۆ حەزت لێیەتی، ئۆف ئەو ئاوە بڵقی تیایە، تەنگەنەفەسیەکە رۆیشت، ئایا دایکە دەزانی تەنگەنەفەسیەکەت دەمتۆقێنآ، بەو مەرگە دەچێت کە لە دەرگا دەدات. باوکم مرد لەبەرئەوەی پاروو لە گەرووی گیر بوو، دەی پارووییەکی دیکە، ئاه! لیمۆکە زۆر سوێرە، با لیمۆکە لە خواردنەکە دەرکەین، ئاه، حەزت لە پارچەیەک باینجانە؟ بەڵام، دایکە، تەنجیەکە باینجانی تیانیە، لەبیرت چوو؟ تۆ، خۆت، فێری چۆن لێنانیت کردم، دەی، بخۆ، دەی، تۆزێک گۆشتەکە زیادکە، نا، دەمت بکەرەوە، ئەوەتا هاتم چەتاڵم هێناوە. ئەوەتا، تامی خۆشە، شەرمدەکەیت چونکە وەکو کیژێکی منداڵ خواردنت دەدەمآ و، بەڵام دایکە ئیفلیجیەکە بڵاوبووەتەوەو گەیشتوەتە هەردوو باڵت و، ناتوانی خۆت خواردن بخۆیت، خۆشبەختانە من لێرەم. ئەرکی سەرشانمە چاوم لێت بآ و خواردنت بدەمآ. کوڕان بۆئەوە خوڵقاوون. من منداڵترین کوڕەکانتم و لەهەموویان زیاتر ئاگاداریت دەکەم، بەڵام ئەوان، ئەوانیش، تا لەتوانایان هەبآ هەوڵدەدەن، من کاتم زۆرە، شتێکی دیکەم نیە بیکەم، هیچ ناکەم، لە مۆڵەتدام و، سوپا پێویستی بەئێمە نیە، ئێمە هەندێک کەسین دوور لە سەربازگاکانمانەوە مۆڵەتەکانمان بەسەردەبەین، کاتآ زۆرم بەدەستەوەیەو، بۆیە توانیم تەنجیەکە ئامادەکەم کە حەزت لێیەتی. تێربووی، باشە، دەتەوآ بۆ منیش تیایکەیت؟ نەخێر، برسیم نیە، دەمەوێ مەمک بخۆم، بەڵآ، ئەی دایکە، مەمکتم بدەرآ. چەند پێویستم بە مەمکت هەیە، لێمگەڕآ سەرم بخەمە سەر ئەو مەمکەو، پەنجەکانیشت یاری بە قژم بکەن. لێم ببوورە، دەستەکانت ناجووڵێنەوەو منیش قژم نەماوە، ئێستا لێت دەگەڕێم. وەڵآ بۆ ئێوارە خواردنێکی سووک ئامادە دەکەم: خەرشووف، دەزانی خەرشووفی بچووک لە ئاوا زوو دەکوڵێت و، جامێک ماست و سێوی لەگەڵدا بێت. دەبآ لە ئێوارە خواردن سووک بێت، ئەگەر شەو زرخەو دەبین، ئێستا دەچم بەلای قاپ وقاچاخ شوشتنەوە، بێگومان مەڕی مەغریبی زۆر چەورە، ئەمە دواجارە کە چێشتی تەنجیە لێدەنێم." !

لەگەڵ هەموو ژەمێکدا (مووح) ی بەسەزمان دەیخستینە پێکەنینەوە، لێدەگەڕاین قسەبکات، چی لە دڵیدا هەبوو بەتاڵی دەکردەوەو، قسەکەی هانی دەداین ئارەزوومان هەبێت، قسەکەی ترسناک بوو. ئەوەی کە دەبێ نەیکەین ئەوەبوو بیرمان لە خواردن دەکردەوە، دوای ئەوەی لەسەر خواردنی نەشەویاتی بآتام و نانی وشک راهاتین، بەڵام بە وشەکانی (مووح) کە ئاشپەزێکی نایاب بوو لە هرمومو، دەممان ئاوی دەکرد، چەند حەزم دەکرد بێدەنگی کەم و، بەڵام چۆن ئەم هەقە بەخۆم بدەم، (مووح) ئەقڵی خۆی لەدەست دەدا، خواردنی دەدایە دایکێکی خەیاڵکراو و خۆی نانی نەدەخوارد.

لەرۆژێکی دیکە:

"دایکە، دەزانی، ئەمڕۆ لە بازاڕ گۆشت و سەوزەم نەدۆزیەوە. بازاڕ نەماوە، گواستوویەتیەوە بۆ جێگایەکی دیکە. سواری پاسکیلەکەم بووم، بەڵام منداڵان تایەکەیان بۆ فشکردمەوە. هیچم نەدۆزیەوە جگە نەشەویات نەبێ و، فاسولیای سپی و، نۆک و، پاقلەی وشک، نانی وشک و، دەبآ لە ئاوا بخووسێن تا بخورێت. دەڵآ کە برسیت نیە. راستەکەی، منیش هەرگیز هەست بە برسیەتی ناکەم، حەزم بە ئامادەکردنی خواردن نیە، حەزت لە سەردینی برژاو بەمەعدەنووس و پیازەوەیە، بیرێکی دروستە، بەڵام دایکە خواردنێکی چەورە و، تووشی دڵەکزەت دەکات، نەخێر، پێشنیازی ماسی کوڵاو دەکەم لەگەڵ هەندآ پەتاتە. نا، کوڵاو نەبێت، بگرە کوتراو بێت لەگەڵ تەماتەو پیازو دۆشاوی کەموون و بیبەری

سوور، تۆزێک توون بێت و، لەگەڵ شوێت و هەندآ لەتە سیر، پاشان دەخرێتە سەر ئاگرێکی کز. باشە، دەچم بۆ بەندەرەکە بۆئەوەی لەو راوچییانەی ئێستا هاتوونەتەوە ماسی کاڵ بکڕم.

لەگەڵ عەبدولسەلامدا مەسەلەکە تەگبیر دەکەین، زاواکەمان راوچییە، بەڵی، ماسی مەرجان ناهێنم چونکە دڕکی زۆرە. تۆ راست دەکەیت، باوکم خەریک بوو بخنکێت چونکە دڕکێکی قووتدابوو، بەڵآ، راستە، بێگومان چونکە دڕکەکەی قووتدابوو، لەبیرم چوو، بمبوورە دایکە، باشە، دەبآ بڕۆم، جارێکی دیکە لێم مەپرسە بۆ کوێ دەڕۆم، خۆت دەزانی کە من رۆژی هەینی دەچم (کەسکەس)(*) دەبەم بۆ هەژاران لەبەردەم مزگەت و، ئەو هەژارانەی لەوآ چاوەڕێن کە بەتەئکید بەختەوەر نابن.. ناچم بۆ مزگەوت، لەماڵەوە نوێژدەکەم..؟" .

بە رەتبوونی کات بەرەبەرە دەنگی کز دەبوو، ورتەورتی بوو، غەرغەرەی بوو، گوێمان لە جیرەی ددانەکانی بوو، پاشان هەنسکی قووڵی دەدا، قاپە نەشەویات لە زیندانەکەی کەڵەکە ببوون و بۆگەن ببوون، وازی لە خۆشۆرین هێنابوو ، بە نینۆکەکانی کە درێژ ببوون چڕنووکی لە دیوارەکە دەگرت. هێزی نەماو دەنگی کز بوو. خۆی بۆ مەرگ دابووە دەستەوە، چونکە ماوەیەک بوو لە نانخواردن وەستابوو، هەروەها لە خواردن پێدانی دایکیشی وەستابوو، مەسەلەکە چەند هەفتەیەکی خایاند بەرلەوەی بمرێت.

(12)

پێکەنین! هەوڵمان دەدا لەرێگای هەندآ نوکتەی کۆنەوە پێبکەنین. زۆرجاریش پێکەنینی دەستکردمان دەکرد، وەک بڵێی شتێکەی بە تووڕەییەوە بۆمان دەهات. پێکەنینی بێئومێدی رەنگ و بۆنی خۆی هەیەو، پێکەنینی ئێمەیش بەدبەختیمان زیاد دەکات. مستەفا لەگاڵتە رانەدەوەستاو، یاریکردن بە وشەو داهێنانی نازناو بۆهەریەکێکمان. ئەمەیش هەندآجار خۆش بوو. بەڵام ئەوەی بەڕاستی پێویستمان پێی بوو، قاقای پێکەنین بوو، بە حیلکەبآ، بە تاسەو ئاشکرا بێت، پێکەنینی ژیان و لەزەت و ساخڵەمی و دڵنیایی بآ. لەگەڵ ئەوەشدا دەمانتوانی بگەینە ئەو پێکەنینە، ئەگەر هەوڵی زیاترمان دابایە بۆ گۆڕانی مەرجەکانی ژیانمان، وەلآ نە هیچمان ئەو هەمان توانایەمان هەبوو، نە هەمان ئیرادەی بەرگریکردن. پێکەنینی بەرز، کە لەڕادەی خۆی دەردەچێت و دڵ دەتەزێنآ، ئەو پێکەنینەیە کە قوماندار دەیوروژێنآ. ئەو قومانداری کە کەسمان لەمەوبەر چاومان پێی نەکەوتبوو و لە تاریکیەکانماندا ئامادەبوو بەپێی پێویستی ئامادەگی، پاسەوانەکان ئارەزوو و فەرمانەکانی ئەویان پآ رادەگەیاندین، رۆژێکیان (موفازڵ) بۆ ئەو بینیایەتە هاتە ژوورەوەو جنێوی دەداو نەفرەتی لە رەگەزی هەموو ئاژەل دەکردو بەتایبەتی نەوەی سەگ:

"نەفرەتی خودا لە ئایینی سەگ و ئایینی ئەو کەسانە بێت حەزیان لە سەگە، بەخێویان دەکەن و لە نوێنەکانی خۆیاندا دەیانخەوێنن، بۆئەوەی خوا لە نەوەی سەگ و دواتری رزگارمان کات، هەموویان بخاتە مەنجەڵێکی مەعدەنی گەورەوە بۆئەوەی رچەڵەکیان لەناو ببات، بۆئەوەی لە کونە دوورەکەی وڵاتە خۆشەویستەکەمان چیتر بێزارمان نەکەن! دەی، پێشکەوە، بۆ ئەو چارەنووسەی تووشی ئەوانە هات کە پیلانیان کرد دژ بە ژیانی ئاغاکەمان! دەی، ئەی ناکەسبەچە، دەتۆپیت و تووشی هاریی دەبیت و ئەوسایش بەم دوو دەستەی خۆم تووڕت دەدەمە ئاوی کوڵاوە، بەڵام

**ئێستا ملکەچی فەرمانی قوماندار دەبم و وەکو ئەوانی دیکە زیندانیت دەکەم. حەپس دەکرێت و هیچ ناخۆیت جگە رۆژی یەکجار نەبێت، قاپێکی هەویری بە ئاو کولاو! ". حەپەساین.**

**سەگێک پێنج ساڵ زیندانی بکرێت! ئەمەیش بەلای سەگەوە زیندانی هەتاهەتاییە، دەشآ گازی لە ژەنراڵێک گرتبێت کاتآ هاتووە بۆ پشکنینی سەربازەگەی دراوسێکەی گرتووخانەکە. لەوکاتەوە پێکەنینمان بۆ هاتەوە، رۆژەکانمان هەندآ تاسەی تێکەوت، هەندێکمان هەستی بە ریسوایی دەکرد، چونکە بەتەنیشت سەگەوە بەندکراوە، هەندێکیشمان لەلایەکی ئەهوەنتری مەسەلەکەوە تەماشای دەکردو، بڕیارماندا ناوێکی لێبنێن و لەم بارەیەوە رێکنەکەوتین:**

**"من ناوی دەنێم قوماندان!**

**نەخێر، لەوباوەڕەم ئەم سەگە زۆر مرۆڤانە ترە لە قوماندان.**

**کەواتا با ناوی بنێن تۆنی!**

**بۆ تۆنی؟ ئەم ناوی پیاوە.**

**هەروا، چونکە ریتمێکی ئیتالیانەی هەیەو سروشتی مەدەنیەت دەدات. پاشان لەسەر وەزنی (بۆبی)یە."**

**نەخێر، ناوی دەنێین سەگ، سەگ یان تووتەڵە، وەکو فەرەنسیەکان پێی دەڵێن.**

**بۆ ناوی نەنێین (کیف، کیف)؟**

**مەبەست ئەو لە ئێمە دەچێت؟**

**بەڵآ و نەخێر، لامان جیاوازی نیە!**

**با (کیف، کیف) بێت، ئایا دەنگ بدەین؟**

**باشە، با دەنگ بدەین..**

**بەوجۆرە ناوی سەگەکەیان نا (کیف کیف) بووە یەکێک لە گرووپەکەمان و حیسابی بۆ دەکرا. راهاتین لەسەر بوونی لەنێوانماندا، رۆژێک نەمانبینی مۆرە بکات. وەلآ گوێمان لآبوو هەندآ جار لە زیندانەکەیدا بەدەوری خۆیدا دەسووڕایەوە، بە کلکی دەیدا لە دەرگاکە، برسیەتی و تینوویەتی بەدرەفتاریان کردبوو، نەدەوەڕی بگرە دەتووت بریندارە دەنووزایەوە، بێگومان چۆن بۆی رێکەوتایە پیسایی دەکرد، پیساییەکەی کۆببووەوەو بۆگەنەکەی زۆری بۆ دەهێنایین، دەبووایە چارەیەکیان بۆی دۆزیبایەتەوە، ئەوەتا یان دووریان خستبایەتەوە، یان لە دارستانێکدا بیانبەستایەتەوە، یان بەجیا بەندیان کردبایەو (موفازلڕ) هاوڕای ئێمە بوو، وەلآ ناتوانآ قسە لەبارەی مەسەلەکەوە لەگەلڕ قوماندارda بکات، دوای مانگێک (کیف کیف) شێت و هار بوو، چونکە نەخۆشی هاری گرتبوو، وەڕینەکەی زۆر ناخۆش بوو، هیچ پاسەوانێک نەیدەوێرا دەرگای زیندانەکەی بکاتەوە بۆئەوەی خواردنی بۆ بەرێت، لەبەر برسیەتی و ماندوویی تۆپی و، لاشەکەی بۆگەنی کرد، ئیدی ئارەزووی گاڵتەوگەپمان نەما. بۆئەوەی بەرگری بکەین دەبآ بیربکەینەوە، بەبآ هۆش، بەبیرکردنەوە هیچ رێگایەک نیە بۆ بەرگریکردن، ئەنجامیش لەبەر توندوتیژی قوماندار ئارەزوی پێکەنینیشمان نەما، (کیف کیف)یان بە عەرەبانەیەک گواستەوە، هەستمان بە ئاسوودەیی کرد، دەبووایە**

زیندانەکەی پاکرابایەتەوەو تەعقیم بکرابایە، بەڵام پاسەوانەکان هەفتەیەکی تەواو خەمسارد بوون و، هەندآ وەڕز بوون، چونکە (موفازلڕ) لەنێوان دوو قیژەدا پێی وتیم: "فەرمانی قوماندارە."

دوای کۆتایی ئەو دیمەنە کە زیاتر بەسەیرو سەمەرە باس دەکرا لەوەی بە کۆمیدی، بۆیە گەڕامەوە سەر نوێژکردن و تێڕامان لە کش و ماتی شەودا، ناوی خودام بە هەمو ناوەکانی دەوتەوە، لە زیندانەکە دەچوومە دەرەوەو هەستم بە پێیەکانم نەدەکردو زەویان دەشێلا، لە هەموو شتآ دووردەکەوتمەوە بۆئەوەی جەستەی خۆم نەبینم، جگە پێستە تەنکەکەی نەبێت. رووت دەبم، دایناپۆشم و نە دەردەکەوێت لەسایەی ئەو تاریکیانەی کە بەڕاستی بە روناکیە گەشەکەی بۆ دیاردەکەوێت. هیچ نیم، دەنکە گەنمێک لە ئاستێکی زەبەلاحدایەو لەسەرەخۆ دەسووڕێتەوەو، یەک لەدوای یەک دەمانهاڕێت. سوورەتی (ئەلنوور)م بیردەکەوێتەوەو گوێم لێیە ئایەتەکە دەڵێەوە: "ڤلمات بعچها فوق بعچ اڑا اخرج یدە لم یکد یراها ومن لم یجعل الله له نورا فما له من نور."

تێڕامام و هەستم کرد پۆشاکی یەک لەدوای یەک دەکەوتەخوارەوە کزە رووناکیەک بەدی بکەم، لەوانەیە ئەوەم دەخوڵقاند، یان خەیاڵم دەکرد. بەڵام قەناعەتم بەخۆم دەهێنا کە دەبینم، بێدەنگی کۆڵانێک بوو، ڕێگایەک بوو دەمگرتەبەر بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆ خودی خۆم.

بێدەنگی بووم، هەناسەم و ترپەی دڵم بوونە بێدەنگی. رووتبوونەوەی ناوەوەم نهێنیم بوو، پێویستیشم بەوە نەبوو دەریبخەم یان پێی دڵخۆش بم لە دوورەپەرێزیە تەنگەی کە بۆنی بۆگەنی و میزی لێدێت. دوای چەند ساتەوەختێکی بێگەردی تەواو، سەرلەنوێ دەکەومە نێو ئەو ئاستەی کە لەسەرخۆ دەگەڕێت.

( 13 )

پلەی یاریدەدەری هەبوو، تەنها یاریدەدەر، جگەی لە ئەفسەرێکی خاوەن دەسەڵاتێکی فراوان لە هرمومو چیدی نەبوو، باڵابەرز، بەهێزبوو، جووتآ چاوی تیژ، نیگا درژ، لە جەنگی هیندی چینی بەشداری کردبوو، لە قوماندانی (ڕ)ەوە نزیک بوو و ناوی (عەتا) بوو، پیاوێکی بەربەر بوو، دەشتەکی بوو، کەسایەتیەک لە ناشوێنەوە، ژنی هێنابوو، بێگومان منداڵیش هەبوو. بەڵام لە رواڵەت یان رەوشتدا هیچ نەبوو، دۆخی خێزانی روونکاتەوە، هەموو شتآ لەلای ئەوەی دەگەیاند کە خێزانی نیە، برادەری نیە، دیسپلین و توونددوتیژی ئاسنینە، لایەنی ترسناک و بەرێز، کەمدوو بوو، بەهێزترین دەنگ بوو لە سەربازگاکە. سەری تاشرابوون، شێوەیەکی بە (کوجاک)ی پشکێنەر دەچوو. دەمانزانی کە دەسەڵاتی لەسەرووی دەسەڵاتی هەموو ئەفسەرەکانی خوێندنگاکەوە بوو، شێوە پەیمانێک لەنێوان خۆی و قوماندانددا هەبوو، پەیوەندیەکی نهێنی بوو. شتێک بوو هەستمان پێی نەدەکردو هەوڵیشمان نەدەدا کە هەستی پێبکەین. ئەو بۆ کۆشک سەرکردەمان بوو. قوماندان بە ماوەیەکی کەم پێشمان کەوتبوون بەرچاومان نەدەکەوت، (عەتا) بەبآ سیم پەیوەندی پێوەدەکرد. دوای کوشتارەکەی (سخیرات) ونبوو. زۆربەی ئەفسەرەکان دەسبەجآ کوژران، وەلآ ئەو توانی هەڵبێت و، دەیانووت یەکێک دیویەتی لەناو کۆشکەکەدا رایدەکرد. دوای دەروچونم لەو کونە زانیم چی روویداوە،

**لەراستیدا (عەتا) خۆی کردبووە یەکێک لە ژوورەکانی کۆشکەوە، نەک بۆ گەڕان بەدوای پاشاوە، بگرە بەدوای دوو هاوڕێی خۆمان لە خوێندکارانی دەریایی، بەپێشنیازی ئەوان چووبوونە ئەودیوی حەوزەکانی مەلەکردنەوەو، لە ژوورەکەدا دۆزرابوونەوە، دەشبێ یەکێک بێ لە ژوورەکانی نووستنی شاهانە، خەریکی تۆقاندنی ئە و ژنە بوو، کە لەسەر زەویەکە کەوتبوو. یەکێکیان گەڵی ژنەکەی کردبووەو ئەوی دیکە خەریک بو لوولەی تفەنگەکەی دەخستە عەورەتیەوە. ئەمەی دیکە چاوی سوورهەڵگەڕابوو، هاواری دەکردو دەیووت:**

**"ئا لێرە کەسێکی دیکە ئامێرەکەی تێدەخات منیش تفەنگەکەمی تێدەخەم"**

**)عەتا) لەدواوە گەیشت و هاواری کردو وتی: "نەکەن" !**

**هەردوو خوێندکارەکە رەپ راوەستان، پاشان فەرمانی پێدان کۆشکەکە جێبهێڵن و داوای لێبوردنی لە ژنەکە کرد کە نیوە لەهۆشچوونێک لەهۆش خۆی چووبوو، پاشان لە چێشتخانەوە کە دەیڕوانیە سەر رۆخەکە بۆی دەرچوو، دوو خوێندکاری دەریایی لەبەردەرگای یاریگایی گۆڵفدا دەستگیرکران، وەلێ (عەتا) دەستگیرنەکرا، تەنها دوای چەند رۆژێک نەبێت. لە گرتووخانەدا تێکەڵی ئێمە نەکران چەند مانگێکی بەبێ ئەوەی نقەی لێوەبێت لەوێ بەسەربرد، لەوەشدا هەڵسوکەوتی روون بوو، وەک بڵێی دەیووت: "دۆڕانم و ئەوەتاش نرخەکەی دەدەم" .**

**رۆژێکیان پاسەوانەکان هاتن بۆئەوەی بیبەن و دوایان کەوت و، بەرلەوەی چاڵەکە بەجێبهێڵی بەفەرەنسی پێی وتین:**

**"ماڵئاوا"**

**"ماڵئاوا" بەیەک دەنگ وەڵاممان دایەوە..**

**لەلای خۆمانەوە هەستمان کرد ئەجەلی تەواو بووە، لەسێدارەدانی بێدادگاییکردن، ئەشکەنجەدانی بەردەوام، نەماندەزانی کام ئەگەریان راستە، لەبەرامبەریشدا پێمانوابوو دەمانکوژن یەک لەدوای یەک، ئەو یەکەم کەس بوو بەرەو مەرگ دەڕۆیشت. وەلێ، دواجار، لە زمانی شایەتحاڵێکەوە پێم دەکات، کە چیرۆکەکەی زۆر ئاڵۆزە، چاویان بەستەوەو بۆ ماڵی دەبەنەوەو فەرمانی پێدەدەن لەوێ سەروچاوی بشۆرێت و ریشی بتاشێت و، ئەو جل وبەرگە خاوێنە لەبەرکات کە بۆیان هێناوە. لەئێوارەدا خواردنێکی راستەقینەیان پێدا، وەلێ هیچی لێ تام نەکرد جگە نان نەبێت، ئەو دەیزانی دوای ئەو مانگە لەخواردنی نەشەویات بەسەری بردوە، چاکتر وایە زۆر نەخوات و، قەرەوێڵەیەکیان پێی دا، وەلێ پێی باش بوو لەسەر زەوی بخەوێت. لە بەیانی رۆژی دواتردا داوای کرد نوێژەکەی بکات، پاشان جل وبەرگەکەی لەبەرکردو وتی:**

**"ئامادەم بۆ گەیشتن بەخودا."**

**گوێی لە هیچ وەڵامێک نەبوو، گرووپێکی دیکە لەسەربازەکان مەسەلەکەیان گرتەئەستۆ بەسەرکردایەتی نەقیبێکی لاو، سەرلەنوێ بردیانەوە بۆ (سخیرات) دەستیان لەدواوە کەلەبچە کردبوو و، سەرودەم و چاویان بەتوورەکەیەکی کەتانی رەش داپۆشی و دەوریان دابوو دەتووت لە مەترسیەکی هێرشبەر پاسەوانی دەکەن، لەنێوانیاندا بەبێ دوودڵی دەڕۆیشت، سەربەرز، وریا بوو بۆئەوەی روودەدات، وەلێ وریابوونەکەی خۆی تاکۆتایی شاردەوە:**

**لەدەستی پاسەوانەکاندا بوو، لە کۆشکەکەوە بردیان تا گەیشتنە ئەو ژوورەی کە ژنەکەی لەدەستدرێژی سێکسی رزگارکردبوو، هیچی تیا نەگۆڕابوو، هەمان دیکۆر بوو، هەمان فەرش، هەمان قەنەفەی چەرمی رەش، بەدرێژایی رۆژ لەوێ بەپێوە مایەوە، تورەکە رەشەکەی لەسەری کردەوەو چاویان بەستەوە، لەئێوارەدا خواردنیان بۆ هێنا، داوای کرد لە پاسەوانەکان دەستی لەبەردەمەوە کەلەبچەکە، نەک لەپشتەوە، دوای قسەکردن لەگەڵ نەقیبەکەدا، چی ویست بۆی بوون تەنها بۆئەوەی ئیسراحەت بکاو، بتوانێ خواردن بۆ دەمی بەرێت، تەنها نان و ئاوی خواردەوە، پاشان لەسەر فەرشەکە راکشا، پاسەوانەکانیش چاودێریان دەکرد، لەوکاتەدا داوای کرد دەستی لەپشتەوە کەلەبچە بکەنەوە، راوێژکردنێکی نوێ و پاشان رازی بوون بە راستی نەخەوتبوو لە سەعات دووی بەرەبەیاندا نەقیبەکە هات و بردی، پاسەوانەکان دەوریان گرت و پێوەی نووسابوون، ژوورەکەیان بەجێهێشت، پاشان فەرمانی پێچەوانە درا، گەڕانەوە بۆ ژوورکە، کاتێ چووە ژوورەکەوە نەقیبەکە چاوی کردەوەو کۆتەکانی لەدەستی کردەوە، خۆی بەرامبەر پاشا بینی، سەڵاوێکی بۆی کرد، نێوان خۆی و پاشا. دە مەتر بوو، پاشا فەرمانی پێی نەدا کە دانیشێت. بەپێوە راوەستا، عەتا بەبێ جووڵە بەپێوە راوەستا.**

**"دەزانی بۆ فەرمانم دا ئامادەبیت؟"**

**نەخێر، خاوەن شکۆ.**

**لەبیرتە چی لەم ژوورە کە روویدا؟**

**وا خۆی نیشاندا کە تۆزێک بیردەکاتەوە.**

**بەڵێ، خاوەن شکۆ.**

**دەمەوێ بزانم ئەو دوو فاسقە کێن؟**

**عەتا نقەی نەکرد، بێدەنگ بوو، نەقیبەکە خۆی تێهەڵقورتاندو وتی:وەڵامی پرسیارەکەی خاوەن شکۆ بدەرەوە.**

**بآدەنگ بوو.**

**ناوی ئەو دوو کەسەم بدەرێ، ئەم ئێوارەیە دەچێتە ناو ماڵ و منداڵی خۆت و ئەمەیش وەعدی شەرەفە.**

**ببورە خاوەن شکۆ، بەڵام نازانم.**

**ئایا تۆ لەوە دڵنیایت؟**

**بەڵی خاوەن شکۆ.**

**تۆ ناتەوێ خۆت رزگارکەیت، تاوانی خۆتە..**

**پاشا لێیداو رۆیشت و دەست وپێوەنەکانی دوای کەوتن. پاسەوانەکان دەوری (عەتا)یان دا، نەقیبەکە چاوی بەستەوەو، پەڕۆکەی بەتووندی بەست، وەک بڵێی بەوە تووڕەیی خۆی دەردەبڕێت و، سەرلەنوێ بەتوورەکە رەشەکە سەرو**

دەم وچاوی پۆشی. عەتا هیچ کاردانەوەیەکی نەبوو، رەپ راوەستاو ئامادەبوو چونکە بەرەو سێدارە یان گرتووخانە دەبرا. نەقیبەکە چرپاندی بە گوێیەوەو وتی:

بۆ دەتەوآ ئەو دووفاسقە بپاریزآ؟

لەنیوەشەودا بردیان، وتیان ئەنجامی هەوڵدان بۆ راکردن کوژراوە، هەمو ئەوەی ئەمرۆ دەیزانین، ئەو نەگەڕاوەتەوە بۆ تزمامارت.. مردوە.

( 14 )

ئەگەر (غەربی) بەدەنگی بەرز قورئانی دەخوێند لە هەندآ بۆنەداو، ئەگەریش کەریم بۆماوەیەک کرا بە پاسەوان و ناویان لـآنابوو رۆژژمێر، یان بەندولی قسە کەرن (واکرین)یش ئیشی مژینی ژەهری دووپشک بوو، منیش چیرۆک گێرەرەوە بووم، هەڵیانبژاردبووم بە تێکڕای دەنگ بە چیرۆک بێژ، لەوانەیە هەندێکیان دەیانزانی کە باوکم چیرۆکگێڕەرەوەو مەتەڵبێژ بووە، یان لەوانەیە بەئاسانی لێیان بیستبووم کە شیعرەکانی میری شاعیران ئەحمەد شەوقیم لەبەر دەووتەوە، یان لە غەیبەوە (گوڵە بەدەکان)و (میری بچکۆلانە)م لەبەربوو، بەڵام دەیانویست (هەزارو یەک شەوە) ببیستن، وەلـآ نەمخوێندبووەوە، لەو کتێبە هیچ نازانم جگە هەندآ چیرۆک نەبی درابوونە پالڕ (جوحا)، بێهوودە هەوڵمدەدا کە بۆیان باسکەم ئەو کتێبەم نەخوێندوەتەوە، هێندەی دیکە زۆریان لـآدەکردم هەندآ حیکایەتیان بۆ بگێڕمەوە. تەنانەت (عەبدولقادر) کە ژمارە (2) بوو کابرایەکی شەرمن و کپ و کورتەبالآ بوو، زۆرجار بە چپە قسەی دەکرد، پێی وتم:

"حیکایەتێکم بۆ بگێڕەوە ئەگینا دەمرم."

نەخێر عەبدولقادر، ئەوە حیکایەت نیە دەیگێڕمەوە، کە توانای ژیانت دەداتآ و تەحەمولی ئەو ئازارە بکەیت کە پێوەی دەتلێیتەوە..

بەڵآ، رێک ئەمە ئەوەیە کە دەمەوآ، خەون دەبینم بەوەی گوێم لە وشە بێت، کە بیخەمە مێشکمەوەو بە وێنە دایپۆشم و، وای لێبکەم وەکو چەرخ و فەلەکی شاری یاریەکان بسوڕێتەوەو، هەرکە هەستم بە ئازار کرد یادی بکەمەوە، بە ئازارکرد یادی بکەمەوە، کاتآ ترس لە شێت بوون زۆرم بۆ دەهێنآ، دەی، بەخیل مەبە، حیکایەت بلآ، ئەگەر ویستت خۆت دروستی بکە، بەلآم تۆزێک لە خەیاڵی خۆتمان بدەرآ.

چەند پەشیمان بووم کە (هەزارویەک شەوە)م نەخوێندبووەوە، ئەویش مەسەلەی رێکەوتەو هیچی تر، یەکێک لە ئێمە لەبەرخۆیەوە دەڵآ: وەختی زۆرم بەبەرەوەیە، با هەندآ کتێب بخەینەلاوەو پاشان خوێندنەوەی پشتگوآ دەخەین، باوکم کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو، بەشێکیان گاڵتەی پێنەدەکرا، تایبەت بوو رەشنووسە عەرەبییەکان کە حەزی لە کۆکردنەوەیان بوو، بەلآم بەشەکەی دیکە تایبەت بوو بە بەرهەمەکان بە هەردوو زمانی فەرەنسی و ئینگلیزی، ئەگەر

چیش هەموویانی نەخوێندبووەوە، ئارەزووی کتێب کڕین و ریزکردنیانی هەبوو لەسەر رەفەکان و، هەمووشیانی جزوبەند دەکردو، بەپێی بابەتەکانیان پۆلینی دەکردن. دایکم گەرچی زۆر ئاخ وداخی بوو لەوەی دەیکرد، چونکە دایکم پارەی ئەوەی نەبوو کتێبی قوتابخانەمان بۆ بکرێت، کەچی باوکم زۆربەی کاتی خۆی لەلای کتێبفرۆشەکان بەسەردەبردو، بەدوای رەشنووسێکەوە دەگەڕا کە پارەیەکی زۆری تیا دەچوو، گەرچی پەروەردەبوونمان لەناو کتێبدا کارتێکردنێکی کەمی نەبوو لەسەر پەروەردەبوونمان. خوشک و براکانم عاشقی کتێب و خوێندنەوە بوون. دوای خواردنی نیوەڕۆ – مەبەستم خواردنی نەشەویاتە لە نیوەڕۆ- بێدەنگی باڵ دەکێشاّ، وا هەست دەکەم کە هەموو چاوەڕوانن، دەکەومە دەریای حیکایەتەوە بەرلەوەی هەست بکەم کەچی دەگێڕمەوە، یان کۆتاییەکەی چۆن دەبآ..

"هەبوو، نەبوو، کابرایەکی دەوڵەمەند هەبوو، هێندەی دەوڵەمەندبوو رادەی نەدەزانی، بەڵام پیسکە بوو، پیسکەو رەزیل بوو، ژمارەیەک ژنی هێنابوو، بەڵام هیچ کامیان منداڵی نەدەبوو."

لەلایەکی دیکەی بینایەتیەکەوە دەنگێک بەرزدەبێتەوە:

"لەسەرەخۆ، وەسفی ژنمان بۆ بکە، دەمەوآ بزانم ئەسمەر بن، یان قژزەرد بن، یان گۆشتن یان باریکەلە بن، سۆزانی بن یان ژنی چاک بن؟"

ئەوانە چۆن حەزت لێیانە ئاوهان، جوان بن، وروژێنەر بن، نەرم و مەکرباز بن، حەیشەری و بآئابڕوبن، زۆرزان و سادە بن، نەرم وشل بن، زۆردار بن ئەگەر وازیان لێیان هێنا، هەمیشە ئاڵۆز بن، بۆیە برادەر، بۆیە ژنەکانی ئەو پیاوە زۆر دەوڵەمەندە هەموو سیفەتێکی چاکیان تیایە، بەڵام لەهەمان کاتدا دەتوانن مەکربازیش بن، یەکێکیان ئەسمەرێکی گۆشتن و قژدرێژ تا ئەژنۆ بوو، مەمک گەورە، تەنانەت پڕ بە هەردوو چنگت گۆشتیان لـآزیاد بوو، ئەگەر پاڵبکەوتایە لەسەر پشت بەملاوبەولادا دەکەوتن و، دوو چاوی رەشی هەبوو وەکو دوو بەرە گێلاسی گەییوو، نیگایەکی ترسناکی هەبوو، ئەگەر ویستبای، ئەگەر باڵندەیەکی بپێکایە دەیکوشت، ژنێکی دیکە سپیکەڵەی لاواز بوو، پێستە نیتک نیتکەکەی پتر خەڵکی لەخشتەدەبرد، نە مەمک گەورەو نە کەمەر تەنگ بوو، حەزی لێبوو لەشی ئاغاکەی بە رۆنی زەیت چەورکات بەرلەوەی سواری بێت، چاوەکانی بەپێی وەرزو روناکی رەنگیان دەگۆڕا. هەندآ جار دەتبینین سەوزو بەنەوشەیی بوون و هەندآ جاری دیکەیش هەنگوینی بوون. ئایا بۆم هەیە بەردەوام بم؟ کەواتە، دەموت برادەرەکەمان تووشی گرفتێک ببوو، نەزۆک بوو، چووبووە لای هەموو پزیشکەکانی دنیا، بەڵام بێهوودە بوو، هەمووشیان گەیشتبوونە یەک ئەنجام. نەزۆکی. کات دەڕۆیشت، سەرەڕای کەڵەکەبوونی ئاڵتوون و زیو، وەرزبوو، ئەو هەستەی کە منداڵی نابی خەریک بوو ئەقڵی لەدەست دەداو تووشی سەراسێمەی زۆری کردبوو، پێی وابوو یەکێک لە ژنە یەکەمەکانی جادوی لـآکردبوو.

عەبدولقادر قسەی پێبڕیم و داوای لێکردم کە بەوردی وەسفی کۆشکەکانی پیاوە دەوڵەمەندەکەی بۆ بکەم، مەسەلەکە زۆر ئاسان بوو، درێژەم دا بە گێڕانەوەی وردەکاریەکان و دروستکردنی جیهانێک لە خەیاڵ بەدر بوو.

"ئایا دەزانی کە کۆشکەکە پێش هەموو شتآ، شوێنێکە تیا هەست بە ئاسوودەیی دەکەیت، لەو شوێنەی جەستە و رۆحت هاوئاهەنگن، لەوشوێنەی کە رۆحسووکی و رەوشت پاکی بەڕاستی سامانە، وەلـآ ئەوانی دیکە تەنها دیکۆرن، شوێنەکە رێکدەخرێت بەگوێرەی نیگات بۆ خۆشگوزەرانی، بێگومان، خۆشگوزەرانیەکی دڵگیر، وەلـآ بۆ زانینت، خۆشگوزەرانی خۆشگوزەرانیەکی دڵنیایە، نەک فەرشێکی فارسی بآ یان چینی، نەک کریستاڵی بۆهیمی یان روخامی ئیتاڵی بآ، هەر

**ئەوە جوانی و بەختەوەریت پێدەبەخشێت، با بڵێین، ئەگەر بتەوآ، کە برادەرە دەوڵەمەندەکەمان بۆ خۆی کۆشکێکی نایابی دروست کردو، هەمو ئاماژەیەکی سامانی تیا خستبووەروو، بەڵام سەرەڕای ئاوریشم و کریستاڵەکان، سەرەڕای باخچەو حەوزەکان، سەرەڕای خزمەتکارو بەردەستەکان، بەختەوەر نەبوون هەموو شتێکی هەبوو، جگە هەموو شتێک کە ملیۆنەها ئادەمیزاد هەیانبوو، ئەویش تواناى سک پڕکردنی ژنی نەبوو."**

**پاشان دەستم کرد بە گەڕاندنەوەی ناوەڕۆکی ئەم مەتەڵە کە دوای سآ رۆژ بەم ئامۆژگاریەی خوارەوە تەواوم کرد:**

**"پیسکە ئەو کەسەیە دامێن گیری هەموو شتێک بێت: پارە، کات، هەست و نەست، هەڵچوونەکان، هیچ نابەخشێت، بۆیە ناتوانێت تووخم ببەخشێتە ژنەکەی، کە لەوەوە ژیان دەست پآدەکات."**

**دوای ئەوەی بووم بە حیکایەتخوان، دەستم کرد بە گەڕان بەنێو هونەرەکانی گێڕانەوە لەنێوان چیرۆک و شیعردا، رۆژێکیان لەسەروی سنووری ماقووڵەوە خەیاڵی حیکایەتێکم کرد، زیادەڕۆ لەئەنجامی رووداوەکان و، مەبەستم لەوەش ئەوەیە گوێبیستەکانم نەگەڕێنمەوە بۆ ئەو ژیانەی کە لەدوای خۆیانەوە بەجێیانهێشتووە، گرنگ بەلامەوە کە شوێن و مێژووەکان دیاری نەکەم، چونکە زۆرجار حیکایەتەکە لەزەمەنێکی ئاڵۆزی رۆژهەڵاتێکی خورافی بەرێوەدەچێت، کە زۆر ئاڵۆزترو دوورتریشە. لە رۆژی دوایی دەستم دەکرد بە خوێندنەوەی شیعر، چونکە من، منیش بیرێکی زامنم هەیە، رۆژێک ئەو توانایەم نەبوو کە لە هاوشانی باوکم بآ لەم بوارەدا. بەڵام خۆم لە هاوشانی خوشکە نۆبەرەکەم دەدەم، زۆرجار لەگەڵیدا دەکەوتمە پێشبڕکآ لەگەڵیدا لە شیعر خوێندنەوەدا، هەندآ جار بەعەرەبی و، هەندێجاریش بە فەرەنسی، لەکاتی خوێندنەوەی یەکەم بڕگەکانی (شیعری پێکەوە)ی پۆل ئێلوار، ئەو بڕگەیە شڵەژاندمی چونکە شێوەی حەرفی هەندآ لە دەستەواژەکانم لـآ ون بوو:**

**"ئەمڕۆ رووناکیەکی دەگمەنە**

**ئەمڕۆ (.. ژ یان.. نا) هەموو منداڵیی**

**ژیانی دەکاتەوە رووناکی**

**بەبآ رابردوو، بەبآ سبەی**

**ئەمڕۆ خەونی شەوانە**

**لە رۆژی رووناکدا هەموو شتآ (.. شی دەبێتەوە.. نا(..**

**سەرفراز دەبآ،**

**ئەمڕۆ من بەردەوام". ئەو دەستەواژەیەم هەر دووبارە دەکردەوەی، وەکبڵێی ناوهێنانی رووناکی کە لێی بەش بووین بێهۆشی کردم، هەموو بەیتە شیعرێکم وەکو مامۆستایەکی پیر وروژابآ و خەریکە بیرکردنەوەی لەدەست بدات دەووتەوە (sans passé sans lendeuain)ئەوانی دیکەش لەدوای منەوە دەیانووتەوەو، هەندێکیان بەعەرەبی دەیانووتەوە.**

**"بآ رابردوو، بآ سبەی"**

بەمەش وەکو یەکێک موچڕکی سۆز زۆری بۆ بهێنآ، لەبەرئەوەی هێندە ئەو وشانە دەیگرتینەوە کە کردمان بە موڵکی خۆمان، بۆئەوەی بڕوامان پێ بهێنن کە لەپێناوی ئێمەدا نووسراوە، تۆزێک گەڕامە دواوەو دەستم کردەوە بە خوێندنەوەی شیعرەکە بەم سەرەتایە:

"هیچ شتآ ناتوانآ قامەتی رووناکی بشێوێنآ

لەو شوێنەی جگە خۆم کەسی دیکە نیەو

چیم خۆشە دەوآ.."،دەنگەکە قیژاندی:

"ئەمە هەڵەیە! وێرایان قامەتی رووناکی بشێوێنن و بیشکێننەوە، لەلای ئێمە، کەس رێز نە لە رووناکی و نە رۆژ و نە شەو و نە منداڵ و نە ژن و لە دایکە کلۆڵەکەیشم ناگرێت، کە بەتەئکید مردو چاوەڕێی هاتنەوەی کوڕە ونبووەکەی دەکرد.. نا، رووناکی پلیشێنرایەوە...بۆئەوەی سنوورێک دانآ بۆ ئەو دۆخە شڵەژاوەی کە باڵی کێشاوە، (غەربی) داوای نوێژکردنی دەکرد، بینایەتەکە بێدەنگ بووەوە، بەوشێوەیە من و پاسەوانی کاتەکە، کەریم، یادی بەخێر بێت بۆی دەچم و، سەرڤاڵترین کەس بووین لەنێو زیندانیەکاندا، کاتی خۆم بەدوای چیرۆکەوە بەسەردەبردو، چەند هەوڵم دا ئەو چیرۆکانەم بیرکەوێتەوە، کە لە منداڵی بۆیان گێڕاومەتەوە، تەنانەت ئەگەریش بیرم کەوتنایەتەوە دەبووایە پەرەیان پێبدەم و، رووداوی زیاتریان بۆ داهێنم و، ماوەکەیان بە درێژدادڕی درێژبکەمەوە، هەندآ جاریش بوەستم بۆئەوەی هەندآ پرسیار لە بیسەران بکەم، پیشەیەکی سەخت و سەرڤاڵیەکی وروژێنەرە.

دوای حیکایەتەکان و شیعر روومکردە سینەما. دەستم کرد بە گێڕانەوەی چیرۆکی ئەو فیلمانەی کە لە مەراکش دیومن و، کاتی خۆی رۆژی جارێک دەچووم بۆ سینەماو، پەرۆشیم بۆ ئەم هونەرە وای لێکردم هەندآ کات سووربم لەسەرئەوەی ببمە دەرهێنەری سینەماو، فیلمی حەزی خۆم هەبوون و، ئەوانەی بەتایبەتی ئاشقیان بووم، وەکو فیلمە ئەمریکیەکانی چلەکان و پەنجاکان، دەمبینی رەش و سپی تاڕادەیەک هێزو درامای دەبەخشە ئەو چیرۆکانە، مایەی ئەوەبوون کە لە سستی واقیع و سادەیەکەی دوورمان خاتەوە".

برادەرەکانم، تکام وایە سەرنجم بدەنآ و بەتەواوی بێدەنگ بن، چونکە دەتانبەم بۆ ئەمریکای پەنجاکان، وێنەکە بە رەش وسپی یەو، فیلمەکەیش ناوی: (گالیسکەیەک ناوی ئارەزووە)، گالیسکەیەکەو گەنجە ژنێک لێی دەخوڕێت، ناوی (بلانش دوبوا)یە، هەرکە دەگاتە (نیو ئۆرلیانز) بۆ سەردانی ستێلای خوشکی، ژنی مارلۆن براندۆیە کە رۆڵی ستانلی دەبینآ، کرێکارێکی بە رەگەز پۆڵەندیە، وەکو دەزانن ئەمریکا وڵاتێکە گەلەکەی رەوەندن و لەهەموو شوێنێکی جیهانەوە بۆی هاتوون.

حاڵی ستێلا چۆنە؟

ژنێکی گەنج و ساغ و سەلامەت و بەختەوەرە. لەگەڵ مێردەکەیدا ژیانێکی مەتەوازیع دەژی لە گەڕەکێک لە گەڕەکە هەژارەکانی نیو ئۆرلیانز. بەڵام بلانش حاڵی باش نیە، چونکە کاتێکی زۆر بەسەر خۆکوشتنی مێردەکەیدا تێنەپەڕی بوو.

بۆ؟

یەکێکیان وتی:

گوێبگرە، پەندەکە لێرە نیە، پەندەکە لەوەیە کە ژنەکە نیشتەجآی ماڵی خوشکەکەیەتی و ئیشی نانەوەی دووبەرەکیە، بەهۆی کەسایەتیە شڵەژاوەکەیەتی ئەنجامیش لەدەستدانی کوت وپڕی مێردەکەیەتی.

حاڵی مارلۆن براندۆ چۆنە؟

گەنجێکی قۆزەو تیشێرتێکی سپی لەبەردەکاو، زۆرجاریش میزاجی تێکچووەو، بەتایبەتی هەرکە خوشکی ژنەکەی دێت، بەڵام دەمەوآ لێرە وردەکاریەکی بچووکتان پیشاندەدەم: دوای ئەوەی بلانش سواری ئەو گالیسکە دەبآ کە ناوی (گۆڕستان)ە و، لە وێستگەیەک دادەبەزێت پێی دەڵێن (شانزیلیزآ.(

ئایا براندۆ هەوڵدەدات خوشکی ژنەکە فریوبدات؟

نەخێر، چونکە بلانش ژنێکی لەرزۆکەو چەندین تەنگژەی دەروونی هەیە، دەڵی گوایە گیروگرفتی پارەی هەیەو ناچاری دەکات خانووی خێزانەکەیان بفرۆشێت، درۆ دەکات، شتی دەڵآ دواجار پێچەوانەکەی دەڵآ.

مەبەستت "قسە دەردەپەڕێنێت و دەریدەکات؟."

رێک وایە، ئاگای لەخۆی نیە چی دەڵآ. ستانلی بۆی ئاشکرا بوو کە لە جانتاکەیدا پارەو خشڵێکی زۆری تیایەو زۆر لەتوانای ئاسایی ژنە مامۆستایەک لەسەرووترە. بۆیە داوا دەکات لە کەسێک بەدواداچوون بکات بۆ رابردووی بلانش بەرلەوەی بیێتە میوانیان.

بەتەئکید سۆزانیە!

پەلەمەکەن لە حوکمدان، ئێستا خەیاڵی مێزێک بکەن کە ستانلی و برادەرەکانی لەسەری دانیشتوون و، لەنێوانیاندا – میچە- یە یاری کاغەزێن دەکەن و جگەرە دەکێشن و بیرە دەخۆنەوەو، پێدەکەنن و بەیەکتری گاڵتە دەکەنن بلانشی شۆخ بە جلێکی سپیەوە دەچێتە لایان.. (میچ) ئاوڕێکی لێدەداتەوەو یاری پۆکەرەکەی لـآتێکدەچآ.

کامیراکە شوێنی نیگاکەی دەکەوێت، بلانش، بە لەنجەولار دێت و دەڕوا. خۆشەویستی لەیەکەم نیگادایە. کامێرا دەچێتەوە سەر مارلۆن براندۆ، تووڕە دیارەو، مۆزیکا هاوشانی روخساری تووڕەبوونەکەی. یاریەکە تەواو دەبی و پیاوەکان هەڵدەسن، بەڵام ستانلی تووڕەیە، مەست دەبێت و دەبێتە کەسێکی شەڕەنگێزە. (تی شێرتەکەی) بە ئارەقە تەڕ ببوو، گرتەیەکی نزیکە لەسەر ناوشانی پانی براندۆی گەنج، بەرەو لاوی بلانش دەڕوا، ژنەکە خۆی تێدەخات و مێردەکەی لێی دەدات و پاشان لەگەلڕ (میچ) بەشەڕدێت. هەردوو ژنەکە پەنا دەبەنە بەر ماڵی ژنێکی دۆستیان.

لێرەدا دیمەنێکی سینەمایی جوانمان بەرچاو دەکەوێت. براندۆ لە شەقامێکی چۆڵدایە، جل وبەرگەکەی دڕاوە، هاوار دەکات و بانگی ژنەکەی دەکات، ستێلا دێت بۆ لای، لەوکاتەدا لەبەردەم ئەژنۆکانی ژنەکەیدا بەچۆکدا دەکەوێت و باوەشی پیا دەکات و دەگرت و سەروچاوی لە تەنوورەکەیدا نووقم دەکات.

ها، ئەمە راست نیە، پیاو، بەڕاستی پیاو بآ، لەبەردەم سەلیم پێی ژنەکەی ناکەوێت.. تۆ ئەم هەمووە دروست دەکەیت.

**نەخێر، من هیچ دروست ناکەم. ئەمە سیناریۆیەکە لە شانۆ لە شانۆنامەیەکی تنسی ولیامزەوە وەرگیراوە.**

**نازانم ئەمە کێیە؟ بەڵام لای ئێمە ژن مافی ئەوەی نیە کە ماڵەی خۆی بەجێبهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆی، بێگومان مێردەکەی لەبەر پێیدا ناکەوێت!**

**باشە، ئەمە لە ئەمریکا دەبێت، رازیت؟ دەتوانم بەردەوام بم؟ لەبیرم چوو کە پێتان بڵێم ستێلا سکی پڕە، کارێکی زۆر ئاساییە کە مێرد هەندێ نەرم بێت بەرامبەر بە ژنەکەی، بەتایبەتی دوای هەڵسوکەوتە توندوتیژەکەی.**

**ئەی پشکنین سەبارەت بە بلانش؟ ئەو سۆزانیە وا نیە؟**

**پشکنینەکان ئەوە دەردەخەن کە مێردەکەی بەگەنجی مردوە، هەندێ پەیوەندی سەرپێی ئەنجامداوە.**

**لەوانەیە بەشێوەیەکی راگوزاری سۆزانی بووبێت، بەڵام، بەهەرحاڵ، ژنێکی نەخۆشە، شەیدای درۆکردنە.**

**چیە؟**

**بەدرێژایی وەخت درۆ دەکات و بڕوای پێدەکەی. وەکو (عەشار) پێی وابوو پانزە چینی کوشتووە لە هیندی چینی دا!**

**مەسەلەکە بەتەواوی جیاوازە، دواجار هیندە چینیەکان، ڤێتنامیەکانن، باشە، با بگەڕێینەوە بۆ نیوئۆرلیانز. ستانلی —میچ-ی برادەری لە راستیەکان ئاگاداردەکاتەوەو، ستێلا دەگوێزرێتەوە بۆ نەخۆشخانە تا منداڵی ببێت، ستانکی وبلانش رووبەڕوو خۆیان لەگەڵ یەکدا بەتەنیا دەبیننەوە، دیمەنێکی زۆر جوانە. براندۆ هەموو راستیەکان بۆ بلانشی کلۆڵ ئاشکرا دەکات. بلانش شێت و هار دەبێ، دەقیژێنێ، وڕێنە دەکات. پزیشکێک و پەرستارێکی دێن و دەیبەن ستێلا منداڵەکەی بوو، دەگریا. ستانلی دەڵی لەمڕۆ بەدواوە دەستی لێناکەوێت. لەگەڵ منداڵەکەی پەنا دەبەنە بەر ماڵی یەکێک لە ژنە دراوسێکانی. ستانلی بانگی دەکات. لە ژوورەکەیدا دەنگی تا ناکۆتا دەنگ دەداتەوە، بلانش لە نەخۆشخانە دەستبەسەرکرا، میچ وەهمەکانی لەدەستدا. بەڵام گالیسکەکە بەردەوام بوو لە خەڵکە بریندارەکە لەناو شارەوە.**

**ئەمە هەموو شتێکە؟**

**بەڵێ، ئەمە هەموو شتێکە.**

**بەڵام، براندۆ نەیویست دەستدرێژی سێکسی بکاتە سەر ژن خوشکەکەی؟**

**"چونکە ئەو سووڕوگووڕی دەداو تووڕەیی دەوروژاند، دەستدرێژی سێکسی گوزارشتە لە تێکچوون".**

**لەگەڵ بەسەرچوونی کات و لەگەڵ خراپبوونی بەردەوام و، لەسەرخۆی توانا لەشی و زەینیەکانمدا، دەسەپاچە بووم لەوەی بتوانم گوێبیستەکانم سەرنج راکێشم و بیانوروژێنم، ئێسقانەکانم ئازاریان دەدام، هەروەها بڕبڕەی پشتیشم، چونکە بەچەماندنەوە دەخەوم و خۆم بەسەر چوارپەلمدا دەنووشتێنمەوە. ئەو ئێشەی کە سەرکەوتوو بوو لێی دەرباز بێت دوای تەقەلایەکی دووروودرێژ لە تێرامان و سەرفرازی، ئەوەندەی پێناچێت سەرلەنوێ بەسەرمدا زاڵ دەبێ کاتێ لەگەڵ کەسانی دیکەدا قسەدەکەم. وەکو بڵێی لەوەدا دابڕانێک هەیە لەو سیاقەی کە ڕێگام دەدات لەجێگایەکی دیکە بم و، بەوشێوەیە بوومە گێڕەرەوەیەک زۆر هەڵەم دەکردو، نەمدەتوانی ڕۆڵی خۆم جێبەجێی بکەم. پێویستم بە**

هەستکردنی خودی خۆم هەبوو، بۆ هەندآ دوورەپەرێزی، گەرچی هەموومان لەدوورەپەرێزیەکی تەواوەتی دەژیاین و، دووچاری جۆرەها نەخۆشی و بێئومێد بووبووین، هەموو رۆژێک عەبدولقادر داوای لێدەکردم مەتەڵێکی بۆ بگێڕمەوەو دەپاڕایەوە:

" سەلیم، برادەر، ئەی ئەدیبەکەمان ئەی خاوەن خەیاڵی جوان، تینوویەتیم بشکێنە، بەنسیبەت منەوە، هەر گوزارشتێک کوپێکی ئاوی شیرین و سازگارە، دەتوانم واز لەو لەگەنە نەشەویاتانە بهێنم و، دەتوانم بەشە ئاوەکەی خۆمت لەگەڵدا بکەمە دوو بەشەوەو، بەڵام تکام وایە، مەتەڵێکم بۆ بگێڕەوەن مەتەڵێکی درێژو شێتانە، پێویستم پێیەتی، ئەمە مەسەلەیەکی ژیانیە بەلای منەوە، داخوازی و تەواو ئازادی منە. سەلیم، کە هەموو شتێکی خوێندبووەوەو، هەموو بەیتە شیعرەکانی لەبەرکردبوو، بە خاڵبەندی و وردەکاریەکانیەوە، کە جیهانێکی دیکە دووبارە دەخوڵقێنێتەوە، لەو شوێنەی هەموو شتآ دەشآ، ئەم سەلیمە نایەڵی بەتەنیا بم، تکات لـآدەکەم مەمخەرە نێو بیرکردنەوەوە، نەخۆشیەکەم بە وشەو وێنە نەبآ چاکنابێتەوە، بەبۆنەی تۆوە چەند ساتەوەختێک توانیم ببم بە مارلۆن براندۆ، لەخەیاڵی خۆمدا رێدەکەم وەکو لە فیلمەکاندا رێدەکات، لە خەیاڵی خۆمدا ژنان دەبینم وەکو چۆن لە ژیانی راستەقینەدا گرەو دەکات. دیاریەکت بەدیاری دامآ. هەرکە گێڕانەوەکەت دەوەستآ بە مارلۆن براندۆیی نامێنمەوە، حەزم لە گێڕانەوەکەتە، ئاشقی گاڵتەجاریەکەتە، وام لێدەکەیت سەفەر بکە م و برینەکانی جەستەم لەبیربکەم، دەفڕم، رێدەکەم، ئەستێرەکان دەبینم و، ئازارم لەبیردەچێتەوە کە گورچیلەم دەهاڕآ و قەوارەم وێران دەکات، بیرم دەچێتەوە من کێم و لەکوێم؟ پێتوایە هۆشە دەکەم، ئەم هەمووە دەڵێم بۆئەوەی بفەلسەفێنم، دەسکەوتی زانیارم زۆر متەوازیعەو، چەند حەزم لـێبوو منیش هونەرمەند بوومایە، وەلـآ تواناکانم رێگای ئەوەم نادەن، هەرکە دەستم کرد بە گێڕانەوەی هەزارو یەک شەوە، مانەوە لێرەدا ئاسانترە بۆ من لەمەوبەر، بەتەمای ئەوە نەبووم رۆژێک بآ و ئاشقی گوێگرتنی چیرۆک بم، وەکو ئێستا وەها دەکەم، لە (هرمۆمۆ)دا چاوەڕێی گەڕانەوەت بووم لە مۆڵەتەکەت بگەڕێیتەوەو، سەرنجم دەدا هەرکە دەهاتیەوە کۆمەڵە کتێبیت پآبوو. بەڵام من کە دەهاتمەوە کێکم پێبوو کە دایکم دروستی کردبوو، لەگەڵڕ کاغەزی یاریدا. بەخیلیم پێدەبردیت، بیرمە، رۆژێکیان داوام لـآکردیت کتێبێکم بدەیتآ، دیوانە شیعرێکت دامآ، هەوڵمدا تێی بگەم، بەڵام زوو وازمهێنا لەو هەوڵدانە، جارێکی دیکە رۆمانێکی پۆلیسیت دامآ، بەدڵم بوو، بەڵام رووداوەکانی لە ئەمریکا روودەدەن. چیرۆکێکم دەویست رووداوەکانی لای خۆمان بووایە، لە وڵاتی خۆماندا، لە شارەکەمدا، لە رەشیدیە. ئەم هەمووە دەڵێم بۆ ئەوەی دەبی سەرلەنوی گەشتمان پآبکەیت بە چیرۆکەکانت، نەک بۆ کات بەسەربردن، بگرە نەک بۆ ئەوەی تیابچین. بەڵآ، هەست دەکەم لێرە تیادەچم ئەگەر سەرلەنوی گوێم لە چیرۆکەکانت نەبآ. دەزانم هێزت لەبەر بڕاوەو، دەنگیشت لەبەر سەرما کەرخ بووەو، ئەم هەفتەیەش دانێکی دیکەت کەوت، بەڵام لێت دەپاڕێمەوە، بگەڕێرەوە وەکو جاران."

بەزەییم بەم جۆرە داواکاریەدا هاتەوەو، بەڵێنم دایآ کە دوای شۆربای ئێوارە، چیرۆکی ئەو دوو کچە جمگە جوانەی بۆ دەگێڕمەوە کە مێرد دەکەن بە دوو برای کورتەباڵا، بەڵام بۆ بەدبەختی تایەکی توندم لێهات و هەڵسام و لە سووچەکەی خۆم دانیشتم و، سەرم خستە سەر دیوارە ساردەکە، بێتاقەت بووم نەمدەتوانی قسە بکەم، نەمدەتوانی هەڵسم، لە حاڵەتێکی ناسروشتی بووم، دەنگەکان دەهاتنەگوێم و بەڵام هەستم نەئەکرد چی لە دەورم روودەدات و، لەماوەی چەند رۆژێکدا، حەپەسام کە هەستکردن بە واقیعم لەدەست دا بوو، نەمدەزانی لەکوێم و لەو چاڵەدا چی دەکەم، وڕێنەم دەکردو، تایەکەم تا دەهات توند دەبوو.

**پاشان، بەیانیەکیان، دوای هەفتەیەک بآئاگایی، بەئاگابوومەوە، شەکەت بوم، هەستم بە سەرەگێژکە دەکرد، یەکەم ناو کە ناویم هێنا ناوی عەبدولقادر بوو. حسێن ئاگاداری کردمەوە کە دوێنی شەو هاتن و هەڵیانگرت و، خستیانە توورەکەیەکی پلاستیکیەوەو، تا دەرگا تەرمەکەیان راکێشا، هەرکە رۆیشتن، ئوستاد دەستی کرد بە قورئان خوێندن. خۆی دایە دەستی مەرگەوە. خۆکوشتن بوو، چونکە خوێنی هەڵدەهێنایەوە، دیارە ئامێرێکی تیژی قووت دابوو، هەرگیز بەڕاستی چی روویداو، وتم لەبەرخۆمەوە ئەو دەمرد تەنانەت ئەگەر تاقەتی چیرۆک گێڕانەوەشم هەبووایە بۆ ئەو.**

**ئەو داوێنگیری ئەو وشانەیش بوو کە لەجیاتی دواخواستی ئەو بوون. زۆرجار ئەوەی دووپات دەکردەوە کە برادەرمەو ئاواتەخوازە رۆژێک بآ ئەو شوێنە جێبهێڵآ، بۆئەوەی دەرفەت هەبآ ئەم برادەریە لە هەوای سەرفرازیدا بژێت. لەوجۆرە ئادەمیزادە بوو کە هەموو شتێک دابەشدەکەن و، هەموو شتی دەبەخشن، رۆژێکیان پێی وتم:**

**"دەتوانم هەموو شتآ کە خوا پێی داوم لەگەڵتدا بەشی بکەم، هەموو شتآ، تەنانەت کفنەکەیشم."**

**بەتەئکید کە بەبآ کفن نراوەتە گۆڕ. بەبی شوشتن، بەڕووتی فڕێیاندایە نێو خۆڵەوەو بە گەچ دایانپۆشی. دواجار یەکێک لە پاسەوانەکان ئەمەی بۆ گێڕامەوە.**

(15)

**بێگومان یەقینێکی چەسپاوە، لە دڵەڕاوکێی مندا نیشتەجآ بوو، بێگومان لەمەوبەر کەسی وەهام نەناسیووە. دەزانم دایکم لە بڕیارێک پەشیمان نابێتەوە کە دابێتی. کاتآ باوکمی لەماڵ دەرکردو شت ومەکەکانی تووڕ دایە سەرجادە، چەند جارێک هەوڵیدا مامە حەمەیی بۆبکات بە نامە نووسین و چەپکەگوڵ و ئاوریشم، بی سود بوو، چونکە خستبوویە دەرەوەی ژیانی و دەرەوەی ماڵەکەیشی، کەڵلەڕەقیەکەی مایەی نەخۆشی بوو، دیار بوو ئەو کەڵلەڕەقیەی لەدایکیەوە بۆ مابوەوە، دایکی نازناوی (ژەنراڵە) بوو، ژنێک بوو کەسایەتیەکی دیکتاتۆرانەی هەبوو، تووندو رەق بوو بەرامبەر بە پیاوان، زۆریش نەرم بوو لەگەڵ کوڕەکانیدا، هەستی بەڕاستی مەسەلەکان کردبوو، جیهانی بە بێ وەهەمەکان دەبینی و، دایکم بە نموونەی دادەناز بیرم لەو دوو ژنە دەکردەوە کاتآ دڵنیابووم کە رزگار دەبم، هەستم لەوەدا بەهێزبوو، روون بوو، پێچ و پەنای تیا نەبوو، لە مانگەکانی یەکەمدا لە ساڵانی یەکەمدا، هیچ هەستێکم نەبوو، لە خواست و توانای رەچاوکردنی مەسەلەکاندا بەتاڵ بووم، مەرگی عەبدولقادر کاریگەریی بە جەختی لەسەرم هەبوو، لەوانەیە**

**لەبەرئەوەی زۆر لەبەرخۆمەوە دەمووت، لەوانەیە بتوانم یارمەتی بدەم و، ئەگەر ئەوەم کردبایە لەوانەبوو چەند مانگێکی دیکە ژیابایە! دەمزانی ئەو نەخۆشە، خەمبار بووم چونکە نەخۆشی نەیهێشت بەشداربم لەوکاتەی گیانی دایە دەستەوە. پێم وایە بانگی کردووم لەو دوا ساتانەی دا کە هێزی بدەمآ، لەوانەیە زانیبێتی کە بێهۆشم و لە تایەکی تووندا گینگلڕ دەدەم!**

**چەند حەزم دەکرد چیرۆکێکی بۆ بگێرمەوە، لەسەر باڵی باڵندەیەکی قەشەنگ بفڕین و گەشتێکی پی بکەم بۆ بەهەشت و بەدڵنیایی: ئەو هەرچەنآ بگاتە بڕوای ئەو هاوڕێیانە بە ئێش و خەمەوە لەناوچوون ئەوانە شایانی بەهەشتن، دووچاری تۆڵەسەندنەوەیەکی رادەبەدەری تووندوتیژی بوون، ئەگەریش تاوانیان کردبآ، ئەگەریش خراپ هەڵسوکەوتیان کردبآ، گەچی ئەو ئەشکەنجەیەی لەو چاڵەی ژێر زەوی تووشیان هات ناشرینترین شێوەی بەربەریەت بوو.**

**هەر لەو ساتەوە کە بەم جۆرە قسەیە خۆم دەدواند، لەبەرخۆمەوە دڵنیابووم، ئەوانە ناتوانن زەفەرم پێبەرن، تەنانەت هەندێجار هەستم دەکرد لەگەڵڕ بەندیەکانی دیکە نامۆم، شەرم لە خۆم دەکەم و، نوێژدەکەم بۆ رزگاربوونم و رزگاربوونی ئەوان رۆدەچووم بێدەنگی جەستەو ئارامیەوە، بەقووڵی هەناسە هەڵدەمژم، داوای رووناکیەکی بەرز دەکەم، کە لەدڵی دایکمدایەو لەدڵی پیاوچاکان و ژنانی چاک دایەو، لە رۆحی پێغەمبەران و پیرۆزمەندان و شەهیدەکاندایە، لە رۆحی ئەو کەسانەدایە کە بەرگریان کردو تەنها بە هێزی رۆح کوڵیان بە دەردەسەری داو، نوێژێکی نەرم و نیان، ئەو نوێژەی کە هیچ مەبەستێکی تیا نیەو، هەڵدەگرێت بۆ ناوەندی قورسایی هۆشی تایبەتی خۆت. ئەو رووناکیەی، رۆح پێی نیشاندام، ئامادە بووم جەستەی خۆمیان بۆ بەجێبهێڵم، بەمەرجآ دەست بەسەر خودی خۆم و رۆحم و ئیرادەمدا نەگرن. لەمەشدا سەربوردەی سۆفیە موسڵمانەکان دەگەڕێنمەوە، ئەوانەی دوورەپەرێز دەبن و واز لە هەموو شتێک دەهێنن، لەبەر خۆشەویستیەک بۆ خودا بآکۆتا. هەندێکیان لەسەر ئازار راهاتبوون، ئازاری ماڵی دەکردو دەیکردە هاوپەیمانی و، ئازار بۆ لای خودای خۆی هەڵیدەگرێت تا لەناوبچآ و ئاگای لەخۆی نەمێنآ. بەوجۆرە بەشدارییەکی گیانی بەگیانی دەردەسەری دەکات و تا ئەوپەڕی مۆرەکانی دڵی خۆی دەخاتە سەر پشت. وەڵآ من، ناوەناوە هەندآ لە دەرگاکانی ئاسمانم لێدەکاتەوە، هێشتا نەگەیشتبوومە ئەو پایە سەرسوورهێنەرەی کە وەها لە جەستە دەکات تووشی بەلاچەی رووناکی بآ، تا لەتوانایدا هەبآ بۆ پەلەکردن لەکاتی بەیەکگەیشتنی یەکلاکەرەوەو، لەپاشان لە تاراوگەی لم دا ون دەبآ.**

**وریا بوو لەوەی کە بەئاگاداری بمێنمەوە، زاڵڕ بم بەسەر ئەو تۆزەی کە هێشتا موڵکی خۆمە، هەناسەی شەهیدم نەبوو، بەتەئکید، ئەوەی بەخەیاڵمدا دەهات، ئارەزووی حەلاڵکردنی خوێنم و بەهەدەر دەڕوات و، قاچم دەکێشا بەزەویدا، وەک بڵێی باسی شێتیەکی بەرچاو دەکەم و نابم بە نێچیری ئازاری جومگەکانم هەموو جوڵانەوەیەکی دەکردە ئەشکەنجە، ئەگەر توانای جووڵانەوە هەبووایە، بەجۆرێک دادەنیشتم کە ئازاری کەمتر بووایە، سەرما لە چیمەنۆتکەداوە دەهاتە دەرەوەو، بۆ چەند سەعاتێک هەستکردنی ئەوەشم نەماو هەستم بە پێستەم نەدەکرد، وەکو بڵێی رۆیشتووم، وەک بڵێی سەفەرەم کردوە، مێشکم ساف دەبوو، ئاسان و راستەوخۆ، بە ئاسودەیی و بەبی نارەزایی خۆم دەدایە دەستیەوەو، نووقمی کردەوە بیرۆکە دەبووم، تا بووە بیرۆکەی خۆی و، هەرکە دەگەیشتمە ئەو حاڵەتە، هەموو شتێکم ئاسان دەهاتەبەرچاو، بەوجۆرە، بەشەو خۆم دەبینیەوە بەتەنیا لەکابەیەکی چۆڵڕ وهۆڵدام، بەرامبەر بەردە رەشەکە.**

**لەسەرەخۆ لێی نزیک بوومەوەو، دەستم لێی دەدان هەستم دەکرد چەند سەدەیەک گەڕاومەتە دواوەو، لەهەمان کاتدا تووڕدراومەتە ئایندەیەکی پرشنگدارەوە، هەتا بەرەبەیان شەو لە کابە بەسەردەبەم، یەکەم کاتی نوێژکردن، خەڵکی دەسنوێژیان دەگرت و نوێژیان دەکردو منیان نەدەبینی، تەنک بووم، بەتەنها رۆحم لەوێ بوو.**

**ئەم جۆرە ئازادیە دووبارەنابێتەوە، نەمدەتوانی بچمە پێچ وپەناکانیەوە، دەبی بگەڕێمەوە ناو چاڵەکە. بۆ جەستەم و ئازارەکانم. ئەو (با)یەی رۆحی هەڵگرتم بۆ رۆژهەڵات کپ بوو، هیچ شتآ دیار نەبوو، جوڵەیەکیش بە گەڵای لقێکدا رەت نەدەبوو، ئەمە نیشانەی گەڕانەوەو کۆتایی گەشتەکە بوو و، دەژیم لەپێناوی گەشتێکی دیکەداو، گوێم وا بەلای تۆری کلاورۆژنەکەوە، زۆر بەئاگام بۆ هەڵکردنی با، ئەو (با)یەی کە لەژیاندا دەمانهێڵێتەوەو، کە بەتێپەڕبوونی لەوێوە هەواڵی جیهانمان بۆ هەڵدەگرێت و، کە بەجێمانیش دەهێڵی بێدەنگی و شکەتی و بۆنی ئەو پیاوانەی تەڕەشووعی خەستی گرتووخانەی سەرەمەرگ رەقی هەڵهێناون، لەو جێگایەی دەبی بەپێوەبین.**

(16)

**لەبەر ئەوەی لەبیرم چووبووەوە کە باوکم هەیە، بۆیە بیرم لێی نەکردەوە، لە نێو ئەو وێنانەیش نەبوو کە دەهاتنە بەرچاوم. رۆژێکیان هاتە خەوم، ئەو کە رێکپۆشی وپەرداخ ناسرابوون ، قیت دەرۆیشت و نیگای بەفیز بوو، لە حەوشەی مزگەوتی فەنا لە مەراکش هاتە بەرچاو وکەوایەکی چڵکنی پیناوی لەبەربوو، ریشی هاتبوو، رووخساری ماندوو بوو، هەناسەساردیەکی زۆر لە چاوەکانیدا بوو، رۆڵی حیکایەتخانی دەبین بە تەنیشت دیوارێکەوە و گوێگری نەبوو، خەڵکی بەلایدا رەت دەبوون، تەماشەکیان دەکردو ملی رێگایان دەگرت، لێی دەگەڕان چیرۆکی عەنتەری ئازا و عەبلەی شۆخ کە ئاغاکەی ژەهرالو کرد بە تەنیا بگێرێتەوە، ببوە مایەی بەزەیی، پیاوێک بوو لە لێواری کۆتایی بوو، ریسوا، زەمانە گەیاندبوویە بن تەتەکی زەوی، لێرەدا من گوێم لێی دەگرت، سەیری کردم و وتی:**

**"تۆ کوڕی ئەو پیرە بەشکۆو زانا ودۆستی شاعیرانی وشاهیت. بەلام چێدەکەی لێرە؟ ئەی تۆ نەمردیت؟ باوکت دەمێکە تۆی بەخاک سپاردوە، لە جەنازەکەت ئامادەبووم، بۆ ئەوەی پەشیمان بێت لەوەی کە منداڵێکی زۆڵی خستووەتەوە ، داوەتی بنەماڵەو دەسەلات و تەنانەت بانگی رۆژئاوانیشی کرد، نەفرەتی لێکردیت و دواجاریش بەخاکی سپاردیت،**

تەنانەت تابووتێکی هێنا و هەموو شت و مەکەکانتی خستە ناویەوە، هەموو کتێبەکانت ، هەموو ئەو وێنانەی کە تیایاندا دەرکەوتوویت و، ئینجا وتارێکی دا، بەڵام من تەکلیف کرابووم بۆ ئەوەی قورئان لەسەر تەرمە درۆزنانەکەت بخوێنم، کەواتە، تۆ نەمردیت ! وەرە ، لێم نزیکبەرەوە، مەترسە، تەماشاکە ، ئاوم نیە خۆم بشۆرم، لەشم لاواز بووە، قاپە نەشەوییات دەخۆم کە ماوە ماوە ، خاوەن چایخانەکەی سەر کۆڵانەکە پێشکەشم دەکات. دەمەوێ بە حیکایەت گێڕانەوە هەندی کات بەسەربەرم، بۆ ئەوەی هەندێ درهەمم دەسکەوێت بۆ ئەووەی دیشداشەیکی خوری بە ئاورێشم چنراوی پێ بکڕم، بە کردنم داوە، بەوردی حیسابم کردوە: ئەگەر لە رۆژێکدا دە درهەمم دەسکەوێت ، ئەوا دەتوانم لە ماوەی سەد رۆژدا لەبەریکەم، دەبینی، هەرکە دەستم دەکەوێت دەبمە کەسێکی دیکە، دەبمە ئەوەی کە جاران بووم، پیاوی رووناکبیر هاودەمی سوڵتان". بینینی باوکمم لە خەوندا بە دڵ بوو کاتێک هەڵوێستەکە پێچەوانە بوو. کاتێک بینیم نەناسراو بوو، دەبوو بە یاوەری شا بێت و لە ئۆغریدا بوو بۆ خەمڕوێنی، لەوانەیە یاری کاغزێنی لەگەڵدا دەکرد ، بەگاڵتەو گەپی پڕ قسەی نەستەق وسێکسیەکانی بۆ رووژاندنی پێکەنینی شا. لە دیدی ئەودا نەک نەمردوم بگرە رۆژێکیش پەکم نەکەوتووە. تەنانەت ئەو چاوی بەکەسێکیش نەکەوتووە تا پێی بڵێ کوڕەکەت لە بەندیخانەیە، دایکم نایەوێ بیبینێ، براو خوشکەکانیشم ئەنجامی ئەم کێشەیە زۆر دەردەسەریان دیوە، کەچی ئەو خۆی لەکۆشکدا دەژی، لە ئۆغری شادایە. دواجار پێمگەیشت کە ئەو زۆر یارمەتی برا و خوشکەکانمی داوە وەرگرتنی مۆڵەتی خوێندن بۆیان. یان کارو فرمان لە بەرێوەبەرایەتی گشتیدا، بە مەرجێک ناوی من لەبەردەمیدا نەهێنن. رووخساری پیاوێکی دانا وبەئاماژەیە لەبەر خۆرسکی، جار ناجار دەهاتە بەرچاوم، هەمیشە دەمبینی دیشداشە سپییەکەی لەبەر بوو، بەشکۆ بوو، وەکوبڵێی لەسەردەمێکی دیکەوە هاتووە، لەسەدەیەکی دیکەوە، رقم لێی نەبوو، رۆژێک چیە رقم لێی نەبووە، مایەی بەدڵبوونیشم نەبووە، هەروەها بەلای هەندێ لە براکانیشمەوە، مایەی رق لێبوونیشم نەبووە، بێگومان قەت گوێم پێی نەدەدا، بەڵام وەکو ئەویش لە خەونەکەدا، لە ژیانی خۆم دوورم خستبووەوە، لەراستیدا ئەو خۆی رۆیشتبوو بێئەوەی بەراستی بروات، ژنێکی دیکەی هێنابوو، ژیانێکی دووسەرە دەژیا، ماوە ناماوەیەک دەهاتەوە بۆماڵ، وریا بوو لەوەی کە دایکم لە ماڵ نەبێت ولەکارەکەی بێت، هەندێ دیشداشەی خاوێنی هەڵدەبژارد و دەرۆیشت، دایکم بەمەی زانی و ئیدی بەدەرکردنی دەرگای بۆ یەکجاری لە رووی داخست، چوو بۆلای قازی و داوای تەڵاقی کرد، ئەودەمە تەمەنم دە ساڵان بوو، لە دیدی مندا ئەو کابرایە کە زۆر کەم دەمبینی تاکێکی خێزانەکەی ئێمە نەبوو، لە سایەی دایکمەوە هیچ هەستێکم نەبوو بەرامبەری، نەبەچاک نە بەخراپ. گەرچی دایکم بە چاکی باسی دەکرد، دەیووت ئەو خێزانێکی دکەی هەیە و خاراپەی بۆ ناخوازێت، ئەو دۆخ و یەکسانەی پێ باشتر بوو، دەبێ دەردیسەری زۆر دیبێ و بێئەوەی لە هەڵسوکەتەکانیدا دەرکەوون. لەبەرخۆمەوە و لە بێدەنگی چاڵەکەدا دەمووت:

دەبوو چی کردبایە؟ من خراپم کرد و گەرچی نەخشەم بۆ هیچ شتێکیش نەکێشابوو، سەرپێچی فەرمانەکانم نەکردبوو، چوومە ناو کۆشکەکەوە بێئەوەی لەخۆم پرسیار بکەم، بەمەیش شاە و ئەو متمانەیەی کە باوکم پێی دابووم ریسوا دەکرد. دەبێ من لەوێ بوومایە بۆ جێ بەجێکردنی فەرمانی سەرۆکەکانم، دەمتوانی پەیوەندیکردن بەوانی ترەوە رەتبکەمەوە، کە بە دەسرێژێک کۆتاییم پیدەهات، یان دەبوو لایەنگری بەرەکەی دیکە بم و بەرگری لە پاشایەتی بکەم، بەڵام بیرم لەم هەڵبژاردنە نەکردبووەوە، لەوانەیە دیمەنی قەسابخانەکە ئیفلیجی کردبم، لە شوێنەکەی خۆم وشک بووم، چاوو زەق ببوو، قوڕگم وشک بوو، سەرم قورس ببوو، تیشکی خۆرەکە کوێری کردبووم، تەنها وێنەی خێرا دەهاتە بەرچاووم و دەسەڵاتی هیچ بزووتنێکم نەبوو، ئەوەبوو بە دە ساڵ زیندانی حوکمێکی سەخت دراین، بەڵام ئاسان دیاربوو لە چاوی ئەو ئەشکەنجە هێواشەی کە لە گرتووخانەی مەرگدا دەمانچێژت. ئایا باوکم دەیتوانی دەست

**لەکار بکێشێتەوە؟ نەخێر، کاتێک پیاو لەخزمەتی پاشادا بێت بۆی نیە دەست لە کار بکێشێتەوە، بگرە ملکەچ و سەرشۆڕدەبێ و هەمیشە دەڵێ: "بەڵێ گەورەم" خۆی زۆر بچووک دەکاتەوە، تەنانەت شا پێویست بە دووبارەکردنەوەی قسەکەی ئەگەریش بەباشی گوێی لە فەرمانەکەی نەبووبێت، دەڵێ (بەڵێ) گەورەم) باتەگبیری خۆی بکات بەخەملاندنی ئەوەی کە ووتویەتی. باوکم لەمجۆرە کەشەدا دەژیا، شانازی پێوەدەکرد و بەختەوەر بوو، دواجار باسی کوڕی کەسایەتیەتی دەسرۆم بۆ دەکات، کەسایەتی (نوێنەری خاوەن شکۆ)ی هەبوو، ئەم کورە یەکێک بوو لە چالاکوانانی چەپی تووندڕەو، بە پانزە ساڵ زیندانی حوکمدرا بە توومەتی پیلانگێڕیی دژ بە دەوڵەت. ئەمەیش لەو ماوەیەدا روویدا کە گومان سەرجەم ولاتی گرتبووەوە، خوێندکارەکان دەستگیرکران ، زۆربەیان قوتابی زیرەک بوون، تووەمەتیان ئەوە بوو کە رای خۆیان دەربڕی بوو، ئەو سەردەمەیش بوو کە ژەنراڵ (ئۆفەقیر) کاتێ وەزیری ناوخۆ بوو، بڕیارێکی دەرکردبوو، لە رادیۆ خوێندرایەوە، کە دەبێ لەماوەی چەند مانگێدا وانەکانی فەلسەفە بکرێن بەعەرەبی، بەمەبەست بژارەکردنی پرۆگرامەکانی خوێندن لە هەندێ دەق کە مایەی نیگەرانین، گوایە ئەوانە هانی خوێندکاران دەدەن بۆ خۆپیشاندن، پێیانووتم کە شا باوکمی بانگ کردوە و، بەزمانێکی زبر سەرزەنشتی کردوە، چونکە خەمساردیی کردوە لە پەروەردەکردنی کوڕەکەیدا، بۆیە ئەو پیاوە بەرێزە، خاوەنی سەرراستیەکی رەوشتی و سیاسی بەرز بوو، تووشی سەکتەی دڵ بوو چەند ساڵێ بێهۆش بووە. باوکم ئامادە نەبوو لە پێناوی هیچ کەسێکدا بێهۆش بکەوێت، هەرکەسێک بووایە. ئەو لەو جۆرە پیاوانە نەبوو کە هەست بە بەرپرسیارێتی بکەن بەرامبەر بە رۆڵەکانیان، کەواتە چی پێویست دەکات بەم پرسیارە؟ وەکو پێمگەیشت ئەو وتویەتی (من کوڕم نیە)، یان وتویە( ئەوە کوڕی من نیە). منیش لەلای خۆمەوە نەمووتوە باوکم هەیە یان (ئەو پیاوە باوکم نیە)، گەرچی ئەوەی من هەمبوو ئەو نەیبوو لە هۆی بیرکردنەوە بەو شێوەیە، بە ئاشکرا بیڵێم . دەمزانی مەسەلەکە ئاسان نیە، تێدەکۆشام تا بتوانم تا خۆم لەناوبەرم. لەسەرەتای نشتەجیبوونمان لە گرتووخانەدا _رشدی- برادەرە فاسیەکەم ئەو سەرنجەی پێڕاگەیاندم: " پێتوایە کە باوکت لە کۆشکەوە نزیکە دەتوانێت لێرە دەرمانبهێنێت؟."**

- **مەحاڵە، وەڵامم دایەوە: ئەو نازانێ، کەس نازانێ، مەبەست لە بەندکردبشمان ئەمەیە. خێزانەکەم وادەزانن لە بەندیخانەی قونەیتەرەین و سەردانکردن قەدەغەیە، باوکیشم تەنها بۆ رابواردن چاوی بە شا دەکەوێت، نەک بۆ سکاڵاکردن، تکام وایە راستی مەسەلەکە تێگەیشتبی. باشتر وایە لەبیریکەیت کە باوکم هەیە. بەتایبەتی کە ئەو باوکێکی خاوەن دەسەڵاتە.**

- **کاتێ زینانی ئاسایی بووین، روشدی پێیووتم ، باوکم هەوڵی دابوو لەلای یەکێک لەو ئەفسەرانەی کە هاوخوێندنی بوون واسیتە بکات، ئەویش پێی ووتبوو کە دەبێ پەنابەرێتەبەر کەسێکی لەو پلە بەرزتر، وەکوبڵێی شێوەیەکی بە ئەدەبانەی بۆ رەتکردنەوەی داواکەی، بەڵام ئەنجام تۆ راستیش دەکەیت کەس ناتوانێ هیچمان بۆ ناکات، دەبێ خۆمان تەگبیری خۆمان بکەین، واتا بە تەنیا بمرین، ئێمە نین ، مردووین، من دڵنیام کە ناوەکانمان لە تۆماری باری کەسایەتی سڕاوونەتەوە، کەواتە سوودی چیە سەری خۆمان پڕکەین لە هیوای درۆزنانە؟ من قسەدەکەم، زۆر قسەدەکەم بۆ ئەوەی هەست بکەم کە هەم، بگرە پێی هەست دەکەم کە بەرگری دەکەم، جگە لەوەی کە ئێمە دروستکراوی لەبیرچوونەوەین. بگرە ئیمە خۆمان خودی لەبیرچوونەوەین، هەندێجار وام لێدێت بەجدی بیردەکەمەوە کە مردووم و، لەودنیاین و لە دۆزەخداین، بە تووندیش بڕوا بەوە دەکەم تەنانەت دەست بەگریان دەکەم. بە تۆ و بەوانەش دەڵێم کە گوێیان لێمە: وام لێدێت وەکو منداڵێکی کۆرپە دەست بەگریان دەکەم. تەماشاکە؟ کوڕی خانەوادەیەکی گەورە، سوپا پێستی زبرکردبێ، جڵەو بۆ فرمێسکی شل دەدات تا بە رووەمەتەکانیدا بێتەخوارێ. هیچ**

عەیبێکم نیە، ئەمەیش تاکە بەڵگەیە کە نەمردووم، پێم بڵێ، تۆ خوێنەوارێکی باشی، پێتوایە دوای ئەوەی لەم چاڵە دەرچووین و بۆ ژیان گەڕاینەوە و هەزم نەکردن و یان بە رووداوی ئۆتۆمبیل مردین تۆ بڵێی بچینە بەهەشتەوە؟

- خوا دەیزانێ، ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە، دەبێ نوێژبکەین بەبێ بەرامبەر، ئەمەیش هێزی ئیمانە.

- سلیم مەبەستت چیە؟

- "من زۆر نوێژدەکەم ، نوێژ بۆ خوادەکەم بۆ ئەوەی خۆم لە دنیا دوور بخەمەوە. بەڵام وەکو دەزانی، جیهان بە مشتێ زۆر شتی بچووک کورتدەبێتەوە، من دژ بەجیهان تێناکۆشم بگرە دژ بە بە هەستانەی کە لەدەوروبەرمانە، بۆ ئەوەی بەرەو بیری رق وکینە رامانکێشێت. بۆ خۆم نوێژناکەم و دواوای هیچیش ناکەم... بگرە بۆ بەڵاگێڕ و مانەوە. بۆ دوورخستنەوەی بێزاریی نوێژدەکەم کە خەریکە لەناومان دەبات ، رشدی بەوشێوەیەی، نوێژکردن خۆڕاییەکی موتڵەقە". وێنەیەکی زۆر بەمێشکمدا دەهات، تێکەڵ دەبن، دەلەرزێن، بەردەبنەوە سەرزەوی، یان بەرەو ئاسۆیەکی خۆڵەمێشی دەڕۆن، وێنەی رەش و سپی، سەرم ئەوەی رەتدەکردەوە وێنەیەک وەربگرێت. زۆرجار دەمبینی باوکم بە پشتی چەماوەوە ڕێیدەکرد، دەچەمایەوە وەکوبڵێی شتێکی گرانبا هەڵگرێتەوە، شا لەپێشەوەی بوو: بە رێوروێشتنێکی دڵنیاوە، جارناجارێک ئاوڕدەداتەوە و لەسەرەخۆ ئاماژەی بۆدەکات، باوکم پێ هەڵدەگرێت وهەوڵدەدات ماوەی مەترێک لە دوای شاوە بێت. دیاربوو ئەمە ببووە رێسایەک، ترسی باوکم هێوەر نابوەوە، دەبێ رێ بە دۆزینەوەی گاڵتەو گەپ و ئاماژەی شەهوانی بەرێت، بازاڕیش نەبێت. دەشبێ بۆ قسەکەی بە هەلی گونجاوەوە بگەرێت، دەبێ گاڵتەجاڕ و سیحرباز و زانایەکی دەروونی زیرەک و، فاڵچی و سەرناس و ئامادەو دڵنیا بێت. ئەمە ئیشی باوکم بوو، دەبوو پێشبین بێت و هەستکەر بێت ودەستپێشخەری بکات. ئەمەیش لە پیشەیەک زیاتر بوو، ئەمە بەهرە بوو. دەبێ بەردەوام مێشک بەئاگا بێت، نە ماندووبوون، نە بێهێز بوون و نەگومان. پێچەکانی مێشکی و بیری شل و شاوی نازانن. ئەمەیش بواری ئەوەی نادات بیر لەکوڕەکەی بکاتەوە، ئایا دەیزانی کە بۆ چی دۆزەخێک نەفی کرابووم بە خواستی ئاغاکەی؟ ئەگەریش بیزانێ چی بۆ دەکرێت؟ هیچ. بەلای منەوە مەسەلەیەکی گەوهەریە کە ئەم وێنانە دەرکەم، بە جووڵەیەکی دەستم هەمووم لادەبرد، بەڵام بە زۆر دەگەڕانەوە، نزیکتر و روونتر، هەرگیز سەروچاوی باوکم لە نزیکەوە نەبینیبوو وەکو لەم دواییەدا دەمبینی. ووروژێنەر بوو، شوێنەواری نەخۆشیەکە بە سەروچاویەوە بوو کە لەمنداڵی تووشی هاتبوو. وەکو ژن بە بۆدرە دەیشاردەوە، باوکم وەکو ژنێکی رێکپۆش بایەخی بە سەروچاوی خۆی دەدا، وێنەکەی دیکە وێنەی شا بوو، هێندە ووشکبوو رێی چوونە ناوەوەی نەبوو، لەدوورەوە سەیری شتێکی دەکرد، لەوانەی لەودیوی ئەو نیگا ئاڵۆزەوە بیرۆکەیە هەبوو سەبارەت بە ئێمە بوو؟ مەبەستم جورئەتی ئەوەم دەکرد پێموابێ کە بیری لە ئێمە دەکردەوە، تەنانەت رۆژێکیان پرسیم: ئایا دەزانی کە چی روودەدات؟ ئایا دەزانێ ئێمە لە ژێر زەویین؟ بێگومان ئەگەر کەسێک تووشی سەربازیە کۆدەتاچیەکان بوویێت ناکرێت ئەو یاخیبووانەی لەبیر بچێتەوە، چی، ووتت یاخیبووەکان؟. من لە هیچ هاووڵاتیەکی مەغریبی کە بێزارە لە گەندەڵی وئەو کەشی ناڕەزاییەی کە کردوویانەتە زمان حاڵی هەموو میللەت، یاخیتر نیم. وەلێ من سەرباز بووم، دەرەجەدارێکی چەکدار و فەرمانەکان جێبەجێدەکات. بۆچی لە بەندیخانەی قونەیتەرەوە بۆ ئێرەیان هێناین و فڕێیان داینە ئەم چاڵەوە؟ مەبەست لەمە چیە؟ ئای لەو دڵۆپە ئاوە بچووکە کە دەکەوێتە سەر سەرێکی تاشراو، ئای لەو شێوە ئەشکەنجەدانە چینیەی کە لەسەر رێبازی مەغریبی پراکتیزە دەکرێت، بە دڕندانە و لە ونبوونیشدا نقووم دەبێت !

**ئای لەو تۆبەیەی کە ئەنجامی ئەشکەنجەیەکی بەردەوامی لەسەرخۆیە! ئەم هەمووە بێهوودەیە، تەنها درِندایەتیە، سزایەک بە درێژایی زەمان و، لەسەر هەموو جەستە. ئەم گوزارشتانەم دەووتەوە، لە خەونێکی سەیردا کە وێنەی شام تیا بینی وگوێم لێ بوو دەیووت: " هەڵسە! دەزانم کە ناتوانی خۆت بە پێیەوە بگریت. ئەگەریش وابکەیت سەرت دەکێشی بە میچەکەوە، کەواتە دانیشە و بەچاکی گوێم لێبگرە: لەبەر خۆتەوە سەرلەنوێ مەپرسە ، ئەگەر بیر لە ئێوە بکەمەوە، من شتی یکەم هەیە بیکەم نەک بیرکردنەوە لە برێک لە خائین و یاخی بوو. تۆ دەستت لە شاهی خۆت بەرزکردەوە، دەزانم کە چەکی خۆت بەکارنەهێناوە، دەبێ تا ماویت لەم کردەوەیەت پەشیمان بیت. بەئاسانی فێر بیت کە چۆن پەشیمان بیتەوە، لەم چاڵەدا و تا رۆژی قیامەت. ئەمەیش وادەبێت. باوکت بە خراپی پەروەردەی کرویت، بەڵام من وادەکەم ، نەکەی جارێکی دیکە وێنەکەم ئامادەکەیت بۆ ئەم چاڵە بۆگەنە. من نایەڵم بیر لە من بکەیتەوە، یان ئەوەتا وێنەم جوانکە و لەگەڵ وێنەکانی دیکە."!**

**واقم وورِما، بڵێی بە راستی دەنگی ئەو بێت؟ دان بەوەدا دەنێم کە لەبیرم چوو، شا بۆی نیە بە تەوازوعەوە لە گەڵ دەرەجەدارێک بەدبەختدا قسە بکات کە ناتوانێ بە پێوە بوەستێت .**

(17)

**ژمارە (6) ناوی ماجید بوو، بەردەوام پرسیاری سەعاتی دەکرد لە کەریم، وەک بڵێی پەیوەست بوو بە ژوانێکەوە یان چاوەڕێی هاتنی شەممەندۆفێری دەکرد، لە دوای ئەوەوە دەیووت سەعات، پاشان هەڵیدەدایی و دەیووت: "کارێکی باشە، بگرە زۆریش باشە، ئەوەتا ئێمە لە ئامانج نزیکدەبینەوە، بابزانی، مەسەلەکە تەنها پەیوەند نیە بە سەعاتەوە، بگرە بەرۆژیشەوە هەیە، کەریم بە یارمەتی بە یارمەتیت پێمبڵێ، ئێمە لە چی رۆژێکداین؟"**

**-شەممە.**

**-بمبورە بەڵام لەحیسابی ئەمرۆ هەڵە بووم، مەبدەئیەن ئەگەریش هات دەبێتە رۆژی هەینی، رێک دوای نوێژی هەینی .**

**-بەڵام لەبارەی کێیەوە قسەدەکەیت.**

**-چی ؟ ئایا نازانی، تۆ بە وردبینی ئەهریمەنانەوە کاتەکان دەزانیت.**

**-بە تەواوی مەبەستم ئەمەیە، چونکە خەریک بوونم بە مەسلەی کاتەوە، رێگەم نادات بچم بەلای مەسەلەکانی دیکەوە.**

**" -تۆ مووحا دەناسی، ئەو پیاوەی هەمیشە هەقبێژە، چونکە هیچی نیە بیدۆڕێنێت. من ئەقڵم لەدەست نەداوە. لەرێگەی فیکرەوە پەیوەندم پێوەی. قسەدەکەین، زۆرجار رێنماییم دەکات پشووم هەبێت. منیش وەڵامیدەدەمەوە کە کاڵای پشوو لە بازاڕدا نەماوە. وەڵامەکەم دەیخاتە پێکەنین، ئۆە پشوو، راستە هەموو ئەوەی پێمان ماوە. من لەلای خۆمەوە، ئەوەندەم لێوەرگرتووە بۆ ئەوەی هەر ئارزوومەندێک بۆ هاورێتیم دەتوانێ هاوبەشیم بکات. کاتێ مووحا دێت**

**نەبینراوە، بەڵام نیشانەی هاتنی عەتری بەهەشتە. بەچاکی لووتتان ئامادەبکەن، ئەم هەلە لەدەستی خۆتان مەدەن".هیچ یەکێک لە ئێمە ئەوەی دەیووت سەرمان نەدەخستەسەری، لە بەربەرەکانی ئەغادیر بوو، کورتەباڵا، لاواز، نیگای رادەبەدەر تیژبوو، بە بۆنەی جگەرەوە ئەقڵی لەدەست دابوو، لە قوتابخانە رۆژی دوو پاکەتە جگەرەی دەکێشا، زۆرجار لە نیوەشەودا بە ئاگادەهاتەوە بۆئەوەی جگەرەی بکێشێ. بە زستان هێندە دەکۆکی تا خوێنی هەڵدەهێنایەوە، جگەرە دەردی بوون و ئارەزوو مەبەستی بوو، حەزی لەو جگەرەیە نەبوو، تایبەت بوو بۆ سوپا، پێیخۆش بوو هەرچی هەیە لە جگەرەی ئەمریکی خەرجیکات. تەنانەت دوای ئەوەی دە ساڵی لە بەندیخانە بەسەربردبوو، جگەرەی لەبیر نەچوو بوو، کۆکەکەی خراپ دەبوو، لەوانەیە پێویستی بە هەندێ نیکۆتین هەبوو بۆ ئەوەی دۆخەکەی هێورکاتەوە. لەگەڵ وەختدا وازی لە داواکردنی جگەرە هێنا، لەقسەکردندا درێژادڕیی دەکرد و لە بابەتێکەوە بازی دەدا بۆ بابەتێکی دیکە، پاشان ئەم کەسایەتیە زۆربلێی لە سایەی خواداوەندەوە داهێنا کە لێی دانەدەبڕا، مووحا توانای ئەوەی هەبوو شوێن و ساڵەکان تێپەڕکات، بە نەبینراوەیی دەڕۆیشت، ماجد دەیووت ئەو گوێی لێیەتی، سەرەتا وایزانی کە ئەویش تەقەلایەکی رووحانی دەدات بۆئەوەی لە جەستە ئەشکەنجەدراوەکەی کە پێویستی بە نیکۆتین بوو رابکات. بەڵام هەر زوو نائومێد بووم، ئیدی ماجید یەکێک نەبوو لە ئێمە، ئەقڵی نەمابوو، ناوی مووحای نەدەهێنا، بگرە ناوی ئەو کەسانەی دەهێنا کە لەناوچوو بوون و لەگۆڕنرابوون " ئەوانەی کە ئێوە لەگۆڕتاننان یەقینم هەیە کە نەمردوون، تەنها من دەزانم، بۆیە ئاگادارتان دەکەمەوە کە ئەوان خۆیان وانیشان دەدەن کە مردوون، ئامادەبن کە بچنە ریزیانەوە، ئەوان لە پێچێکی دیکەی گردەکە چاوەڕێمان دەکەن. ئەوان هەموویان لەوێن، لەعەرەبی، عەبدلقادر، مستەفا، ئیدریس، روشدی، حەمید.. ئەوان خۆیان وادەردەخەن کە مردوون، بۆ ئەوەی پاسەوەانەکان بخەڵەتێنن. ئەوان بۆ هەلێکی لەبار دەگەڕێن بۆ راکردن، ئەو کلسە گەرمەی کە دەیکەن بەسەر جەستەیاندا گەرمایان دەداتآ و وریایان دەکاتەوە. تەنها راناکەن بگرە بۆ هەل دەگەڕێن بۆ ئەوەی پاسەوانەکان فڕێدەنە گۆڕەوە. بۆیە دەبینی هەندآ لە پاسەوانەکان دەشەلن. بەم نزیکانە هەڵاتنە مەزنەکە ئەنجامدەدرێت و ئەنجام ئازادیمان دەگەڕێتەوە و ئەوسا هەرچی جگەرەی دنیا هەیە دەیکێشین."**

**کەریمی برادەری هەوڵیدەدا هێوریکاتەوە، ماجیدیش خۆی وانیشاندەدا کە گوێی لیگرتووە، تەنانەت بە رایەکەیشی رازیە، دواجار دەگەرایەوە سەر ورێنە بەردەوامەکەی و سووربوو لەسەر ئەوەی کە مردووەکان نەمردوون و لەدەرەوە خۆیان ئامادەکردوە بۆ راکردن، ئەو ووڕێنەیشی لۆژیک و سیاقی دەگمەنی خۆی هەبوو:( کەریم گوێم لێبگرە ، تۆ باش دەزانی کە تاکە رێبازێک هەیە بۆ دەرچوون لەم شوێنە، ئەوەیە بە هەڵگرتن دەرچێتە دەرەوە، یەکەمجار قاچەکانت، کەواتە، ئەوەانەی بەجێیانهێشتین هەستیان بەوەکردبوو کە دەبێ خۆیان بکەنە مردوو، بۆ ئەوەی خیرا لەگۆڕین بنێن، پاشان هەڵدەسنەوە لە ژێر گەچە گەرمەکەوە و دەچنە ژوورەکەی تەنیشت بۆئەوەی بگەرێنەوە و چەکدارن تا رزگارمان بکەن. سوێندت بۆ دەخۆم ئەوەی کە دەیڵێم تورەهات نیە، تەنانەت لە قورئانیش باسکراوە، مامۆستا غەربییش ئەمەت بۆ دووپات دەکاتەوە، ئەوانەی بە ستەم و دوژمنایەتی دەکوژرێن لەلای خوای خۆیان زیندوون رزقیان هەیە). غەربی قسەکەی پێبڕی و بۆی راستکردەوە:**

**)ئەمە پەیوەندە بە شەهیدانەوە ، ئیدی نازانم ئەم پێناسەی خوایە ئێمەیش دەگرێتەوە ). ئەوە بوو دەمەتەقێیەکی ئایینی و سیاسی لە نێوانماندا روویدا، ئێمە کێین؟ سیفەتی ئێمە چیە؟ ئایا ئێمە سەربازی یاخیبووین؟ زیندانی سیاسین؟ قوربانی دەستی ستەمبین؟ سزادراین دوای ئەوەی پێنجێکی ئەو حوکمەی بەسەرماندا سەپێنرابوو بەسەربردبوو. لە قونەیتەرە ئێمەیان رفاند و فرێیاندباینە ئەم چاڵەوە. دادپەروەری دادپەروەری ئەوانە، ئەوەی کە خستیانە**

بەرچاوی میدیاکان، لەبەردەم چاوە حەپەساوەکانمان و سەرە تاشراوەکانمان و کراسە خاوێنەکانمادا ، هەڵخەڵەتاین، سەرباز بووین و ئەفسەرەکان بە ئەنقەست سەریان لێ تێکداین، چەکداریانکردین، بە چەند دەقیقەیەک بەرلەوەی بگەینە سخێرات ، پێیانوتین( شا لە مەترسیدایە، بابچین رزگاریکەین، دوژمنەکان بەرگی داوەتکراوو یاریزانی گۆڵفیان لەبەرکردووە). ئەوسا ئێمە: ئەفسەری قوتابی هەڵخەڵەتاو بووین یان خائینی یاخیبوو؟ چۆن بزانرێت چی لە مێشکی ئەفسەرێکی قوتابی دەخولێەوە کاتێ ئەو رووناکیەکی پرشنگدار تیشکی لەچاوی قۆستوەتەوە، دراوەتە دەستی چارەنووسی خۆی و رەشاشێکی بەدەستەوەیە، پاشان فەرمانی پێدەکرێت کە تەقە بکات؟ بۆ ساتێک فرشی گژوگیای یاریگای گۆڵفەکە سەرنجی راکێشام، زۆر بە رێکوپێکی برابوو، وەکو یەک ، دەدرەوشایەوە، زۆر کەسک بوو، جوان بوو، بێ غەلەغەش بوو. لەسەر ئەو گژوگیایە کە وەکو رایەخێکی دروشاوە رێمدەکرد، کاتێ کابرایەک هاواری لێکردم، پێموابوو بیانی بوو، ووتی ( نا،نا بەو پێڵاوەت، ئەو گژوگیایە پاندەکەیتەوە.نا، دوور لێی برۆ، پێڵاوەکەت داکەنە).لەوکاتەدا گوللە لە هەموو لایەکەوە گیزەی دەهات، خەڵکەکە رێکپۆش و قژیان داهێنابوو، وەکو مێش بەر دەبوونەوە، لە دەوری سەوزایەکە رۆیشتم، بێ ئەوەی هەست بەترسناکی ئەوە بکەم کە روودەدات. تەنانەت هەموو وڕایی و ترسێکم لەبیرچووەوە کە بە بێدەنگی من و روشدی دایگرتبوو. هەر لەوساتەوە بە تایبەتی، مەسەلەکە لەلام تێکەڵ بوو، شا کوژرا! بەڵام بۆ بەرژەوەندی کێ؟ بۆ ئەوەی بیگۆڕنەوە بە گروپێکی سەربازیی؟ ژەنراڵەکان و کۆلۆنێلەکان دەسەلاَت و سامانی وڵات دابەشکەن؟ بە بەسەرچوونی کات زۆر بیرم کردەوە: خۆشبەختانە شکستمان هێنا، یان ، خۆشبەختانە ئەوان شکستیان هێنا! کێ دەیزانی چ تاڵاوێکمان دەچێشت لە دەستی دیکتاتۆریەتی سەربازی کە قوماندان یان عەتای یاریدەرەی دەستە باڵاکانی دەبوون ، باشیان دەناسم. باش دەزانم چی دەڵێم. بەڵام، ئایا کەسێک لەم چاڵەدا گوێی لێمە؟. ماجید وەک بڵێی بیری دەخوێندمەوە ووتی ( تۆ لەسەر هەقیت. مووحا لەگەڵ رای تۆیە. چاوەڕوانی چیمان لەو سەربازانە بێت کە لە دادپەروەریی زیاتر برِوایان بە هێزە؟ ئەگەر لێرەین لەم ژێرخانە، بە هۆی ئەوانەوەیە. کەس رای ئێمەی وەرنەگرت، بەهەرحاڵ، بیروباوەڕی سەربازیی لەوەدانیە هەوڵبدەیت بزانی چی لە مێشکی ئەفسەرە قوتابیەکان دەسوورێتەوە. بۆیە دەبێ رابکەین، تەنها مەبەستمان هەڵخەڵەتاندنی مەرگە، زیندووەکان ناتوانن فریامانکەون. بەڵام ، ئێمەیش مردووین. لە دۆزەخدا نشتەجێین، ئەمەیش هەڵەیەکی داوەری بەداخە. بەڵگەیش ئەوەیە خۆمان وادەردەخەین کە زیندووین و ئەوانەیش بەمردوو بزانین، خۆیان وادەردەخەن کە مردوون و چاوەڕێمانن بۆ ئەوەی وڵات بەجێبهێڵین.(

بۆیە بڕیارمدا هەرچی دەڵێ سەر نەخەمە سەری. چ سوودێکی هەیە؟ مانەوەیشی پەیوەند بوو بەو داوایەوە. دەڵێ ئەو چاوەڕێی مووحا دەکات. هەر پرسیاری سەعاتیش دەکات، چونکە کەریمیش لە وەڵامدانەوەی سەعات بێزاربوو پێی ووت کە کاتژمێرەکەی وەستاوە، ئەویش دەگری. دەبوو یەکێمان بەهەر شێوەیەک بووایە خۆی تیا هەڵقورتاندایە و قسەی لەگەڵ کردبایە بۆ ئەوەی هێوری کاتەوە و پێش شێتبوونەکەی کەوتبایە. خۆم واپیشاندا کە مووحام و لەگەڵیدا قسەمکرد. زەحمەتیش نەبوو کە وەکو ئەو کەسە قسە بکەم کە ماجید لە گەرمەی بائومێدییدا ئاماژەی پێکردبوو. بە شێوەو ریتم و توانای قەناعەت پێکردن قسەم دەکرد: ( دەزانی هەی بێ سەبر. هەمیشە سووتاوی کاتی، کێ نایەوێ شەوی قیرپین هەڵیدەلووشێت. برِوام بەوە هەیە کە مردووەکان ئەکتەرن و لەسەر تەختەی پڕ لە سێبەرو تارمایی دەور دەبینن. لە نیگەرانی ئەودا تاریکایی مەزن دەبێ. دەزانم من تەنها هەواڵێکی باووم. ئاگرێک کە لە رووناکیدا خۆی شاردۆتەوە. گوفتار لە هەناوتەوە دێتەدەرێ و پاشان بۆ نێو بیر بەردەبێتەوە. دەنگم باکان هەڵیدەگرن، تەنانەت ئەگەریش بایەکان پرِبن لە قووم و سەر لێشێوێنەربن. تەنها خۆت دەتوانی خۆت لەم تونێلە دەربێنی. بۆ ئەوەی ئەمە بکەیت، پێویستت بە ئیرادەیەکی توند و توانایەکی زەینی بەهێزترە لە خەون. پرشنگدارتر لە رووناکی نوێژ. من

**نیشتەجێی درەخت نیم، بگرە نشتەجێی بیرۆکە بەئێشەکانم، کە پێستەم شەق دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ سەرەوەی چیا و دارستانە خەوتووکان بەرزم دەکاتەوە. من دەڕۆم، ئێستا دووركەوتمەوە، من دەتگەڕێنمەوە بۆ خودی خۆت. بۆ تەناییەکەت، بۆ ئەقڵی خۆت!). بێدەنگیەکی تەواو دوای ئەو گوزارشتانە بەرپابوو، تەنها دەنگی کەریم شەڵەقاندی کە سەعاتی راگەیاند. ماجید بێدەنگ بوو، دوای ئەوە بە چەند رۆژێک هەستمکرد لە زیندانەکەی شەڵەژاوە، بانگم لێبکرد : وەڵامی نەدایەوە، دوای شۆربای ئێوارە، گوێمان لە غەڵبەی جەستەیەکی گینگڵ خواردوو بوو. تەنها ماجید توانی لەو گرتووخانەیە خۆی بخنکێنێ. هەموو جلەکانی بەستەوە تابتوانێ بیکاتە پەتێک و لە ملی خۆی بئاڵێنێ وبە هەموو هێزێکیەوە رایکێشێت، پاشان چمکی کراسەکە هەڵواسی بە کوونی باکێشەکەوەو لەسەر زەوی راکشا و و هەردوو پێی تووندکرد لە دەرگاکە، کە بووە هۆی خنکاندنی. بە تەواویی رووت و قووت. جەستەی سووتابوو، وەک بڵێی قوونکە جگەرەیان لەسەر پێستی کوژاندوەتەوە، سووک بوو، هەردوو چاوی زەق وسوورهەڵگەڕابوون. مەرگی فێڵ نەبوو، یان دەمامکێک بو لەسە سەروچاوی. بە داخەوە، خۆی وادەرنەدەخست کە مردووە .**

(18)

**وەکو نیشانەیەک یان هەڵەیەک ، کۆترێک ، یان بابڵێین کۆترەباریکەیەک، لە ئاسمانەوە هاتەخوارەوە، خۆی خزاندە نێو کونە باچکەیەکی ناوەندوەوەو، بەسەر بێدەنگیە تاریک و تتکەکەماندا کەوت. مامۆستا (لەعەرەبی) هیچ گومانێکی نەبوو(ئەمەکۆترە باریکەیە)، من لەم جۆرە مەسەلانە شارەزام). کەس نەیتوانی بەدرۆی بخاتەوە، بەلای ئێمەوە رووداوێک بوو، لە ئاسمانەوە بۆمان هاتبوو، نەمردوو ناشتن بوو نە نۆرە ئازارێک، بگرە مەسەلەیەک بوو بە سەرماندا هاتبوو و کەسیش رچاوی نەکردبوو، کۆترەباریکەکە هەڵفڕی و خۆی دەکێشا بە دیوارەکانەوە، مامۆستا بانگی کردو لاسایی گمەی کۆتری کردەوە، کۆترەکە لە زیندانەکە نزیک بوەوە، دەلاقەیەکی نەدۆزیەوە لێی رەت بێ، دیاربوو چووە قوژبنێک و لێی خەوت، هەرکە پاسەوانەکان هاتن خۆی کرد بەیەکەم زینداندا کە دەرگاکەی کرایەوە، بەو جۆرە بووە میوانی(محەمەد) ، پاسەوانەکان ئاگایان لە بوونی نەبوو، ، ئەوان عادەتیان وابوو لەگەنە شۆرباکان دابنێن و خێرا بڕۆن . (محەمەد) وەکو منداڵ دڵی خۆش بوو، قسەی بۆ کۆترەکە دەکرد، پێی دەووتین ئەوە نیشانەی قەدەرە ودەبێ بایەخی پێبدەین و بیکەین بەنامەبەر: (بەخێوی دەکەین و ناوێکی لێ دەنێین. دەبێتە هاورێمان، مەشقی پێدەکەین بە جۆرێک کە بتوانێ نامەکانمان بۆ بەرێتەدەرەوە، بۆ خیزانەکانمان، لەوانەیشە بۆ چالاکوانانی مافی مرۆڤیش). مامۆستا وەڵامیدایەوەو ووتی: (لەوانەیە باشتر وایە وازی لێ بێنی فێری زیکری خوای بکەم ، هەموو کۆترەباریکەکان**

**خواناسن). —بوورا◌ِس- ژمارە (13)ە بوو ئاسایی بێدەنگ بوو، حەماسەتێکی بێوێنەی نووااند بەرامبەر بەو بەخششە ئاسمانیە (ناوی دەنێین ئازادی) محەمەد کاتێ خواردنی دەدایێ و پێی دەووت: (ئازادی ، ئەی ئازادیەکەمان، هاتی بۆ لامان و نامەت بۆ هێناین. من دڵنیام کە نیشتنەوەی تۆ لەم شوێنە رێکەوت نیە، دەبێ کێ تۆی ناردبێت؟ هەردوو قاچەکانت نە بازنگ و نە نامەیان پێوەنیە ، کەواتە خوا خۆی تۆی فرێداوەتە ئەم چاڵەوە). بەڵام فەلاحی دراوسێی کە ژمارە (14) بوو ، زۆرتر مەیلی گۆرانی ووتنی هەبوو :(ئەی کۆترەکەم ، ئەی سونبولی ئاشتی و خۆشی ، ئەگەرچی ئەمرۆ لێرەیت لەبەر ئەوەی خوا بەزەیی پیاهاتینەوە، چونکە لێبوردنێکی شاهانە ئێمەی گرتووەتەوە ، ئێمەیش ئەنجامەکەی بەرپرسیاری کردەوەیەک نین، کە کەسانێکی دیکە کردوویانە). پەندۆلە قسەکەرەکەمان تێهەڵچوو ، بەسووربوونەوە وتی: (داب و نەریتی بیلاَت وانیە پەنابەرێتەبەر کۆتر بۆ نامەبردن، ئەگەر هاتوو رۆژێک بەر لێبوردن کەوتین، یەکسەر دەزانین ، چونکە ئەو کاتە خواردنی باشمان دەدەنێ و پزیشک دێت بۆ تەماشاکردنمان، چونکە لەو شوێنە دەردەچین و دەبێ تەندروست بین، بەڵام سەرەرای ئەم هەموو شتەیش، ئەم کۆترە لوتفێکە لە خواوە بۆ ئێمەی هاتووە بۆ دڵدانەوەمان). محەمەد رازی نەبوو لەوەی کە وتی: (بۆ دڵدانەوە؟ نەخێر ، بگرە ئەمە رووداوێکە، چونکە ئێستا کەی قسەی لەگەڵدا نەکردوین بۆ لای خۆم گلی دەدەمەوە، بۆ هاودەمی تەنیایەکم). دەنگی نارەزایی بەرزبووەوە: (ئازادیی، کاتێک ئازادیت دەگەرێتەوە، کاتێک دەچێتە بەر رووناکی و بەرەو ئاسمان دەفرێت، تۆزێک لە بانیژەی خانووەکە بوەستە، کە خانووەکەی منە، ئەو شوێنەی کە لێی لە دایک بووم و دایکمی لێدەژێت، لە مەراکشە، لەشارە ، دواجار دەیناسی: (بانیژەیەکە بە رەنگی شین بۆیاغ کراوە، بەڵام ئەوانی دیکە هەموویان بە سوور بۆیاغ کراون. هەمیشە دەرگاکەی کراوەیە، دادەبەزیت و دەچیتە حەوشەکە، لەناوەراستیدا دار سێوێەک و جۆگەلەیەکی لێیە، دایکم ئاشقی ئەو شوێنەیە و، بۆ ئیسراحەتی خۆی تەختی کردوە، لێی نزیک دەبیتەوە و لە سەر شانی دەنشیتەوە و بەتەئکید هەست دەکات کە تۆ لەلای منەوە هاتووی بۆلای ، بەسە تەنها سەیری بکەیت و لە چاوەکانتدا نامەکەی من دەخوێنێتەوە: ( دایکە بەنرخەکەم ، من زیندوم ، خۆشم دەوێی ، لەبەر من نیگەران مەبە، بە یارمەتی خوا و یارمەتی ئیمانی ئەو رزگارم دەبێت. زۆرجار بیرت لێدەکەمەوە و چەند رقم لە خۆم دەبێتەوە کە بەهۆی ئەو کردەوەمەوە خۆت دەیزانی ئازارم داویت، ئاگات لەخۆت بێ، ئەمەیان گرنگە، بەبرا بچووکەکەم بڵێ هەمیشە بیری لێدەکەمەوە، بە (ماهی)یش بڵێ لێرە فێری یاری کاغەز بووم، هەرکە لێرە دەرچووم بۆی دەسەلمێنم کە ئیتر من نادۆرێم. خوا بۆ هەمووانت بهێڵێ، تاجی سەر سەرمان و سەرچاوەی نازو نیعمەت و رووناکی). هەریەکێک لەوانیتریش دەیویست وەکو من بکات، نامەیەکی دەدایە کۆترەکە ، کە شایەتی مەرگەساتەکانمان بێت. بە وریایەکی زۆرەوە لەسەر رانم دامدەنا، لە کاتێکدا دەنگی بیستراو لە زیندانەکانی دیکدا بە گوزارشتی زۆرەوە بەرزدەبوونەوە: ( بەباوکم بڵێ عەبدلسەلامی کورِی هێشتا زیندووەو، لەلای تەنیشت پاسەوانەکەوەیە. بە زوێێدەی دەزگیرانم بڵێ چاوەرێم کات ، بەم زوانە بەردەبم. سەردانی گۆڕی دایک و باوکم بکە لە (تازا) و نوێژ بۆ رۆحیان بکە. برۆ بۆ (سخێرات) و سەلام بکە لە (خزەبیر) لە یاریگای گۆڵفەکە. بە فاتیمەی خوشکم بڵێ با شووبکات بە کورە مامەکەم. زەماوەندکەیان نابینم. رێکخراوی لێبوردنی نێو دەوڵەتی لە باری گوزەرانمان ئاگادار بکەرەوە لێرە.**

**-بفرە ، بە ئازادی بفرە ..ئازادیەکەت پیرۆز بێت.**

**-لە بیرت نەچێ بچی بۆ مزگەوت تا چەند جارێک نوێژی غایبمان بۆ بکەن بۆ ئەوانەی ئێمە لێرە لەناچوون.**

**-ئەگەر چووی بۆ مزگەوتی فەنا لە مەراکش، بۆلای راهێنەری کۆتر برۆ ، ئەو کەسەی رایاندەهێنێ بۆ ئەوەی نمایشی شانۆ بکەن، هەرکە دەتبینێ دەزانێ لە کوێوە هاتووی و نامەکەیش چیە کە هەڵتگرتووە..**

-بەلام من هیچ شتێکت پێ راناسپێرم ، هیچ نامەیەکم نیە کە بە تۆیدا بینێرم ، یان بە بارێکی دیکە، کەسم نیە تا نامەی بۆ بنێرم ، بۆیە برۆ بۆ کوێ دەرۆی و کوێت بوێ و بە کۆترەکانی دیکە بلێ ئێمە چاوەڕوانی هاتنی ئەوانیشین.(

چالەکە وەکو بازاری رۆژی مەزاد وابوو، هەموو قسەیان بۆ ئەو کۆترە بەدبەختە دەکرد، وەک بلێی دەیتوانی ئەم هەموو نامانە هەلگرێت ، بۆم نەبوو باسی گەمژەیی هەلسوکەوتیان بکەم، چونکە خۆم یەکەم دەسپێشخەر بووم ، بۆ ساتێک ، وادیاربوو کە زریانێکی شێتی هەلیکرد بەسەر گرتووخانەکەدا. وڕێنە، ژاوەژاو و گوزارشتی هەلەت و پەلەت و وێنەی بێهوودەیی.کۆترەکە ئیدی بالندە نەبوو، بگرە بووە کەسێک و هاتبوو نامەکان کۆکاتەوە، کە بەرەو هەموو ئاقارێک و ناوچەیەک رەوانە دەکران. بۆیە رۆژی دواتر ، هەرکە دەرگای زیندانەکە کرایەوە ، بەرەلام کرد، لەترساندا سووڕی خوارد پاشان پاسەوانێک گرتیەوە و بەرەو دەرگاکە تووڕیدا. بیرماندەکرد، هەرکە بیرمان کەوتایەتەوە بزەمان دەهاتێ، دلنیا بووین کە مەینەتیەکان مەزنن.

(19)

مردن لەبەر قەبزی ، مەسەلەیک بوو بە بیری کەسدا نەهاتبوو. عادەتیش وابوو دەووترا (مردن لەبەر خۆشەویستی) یان (مردن لەبرسان و تینووان‌دا)، (بووڕاس) لەبەر ئەوەی نەیتوانی پیسایی بکات، چونکە دەیهێشتەوە ، یان بە واتایەکی دیکە، هێزێک لە ناوەوەی هەبوو، رێگری بوو کە پیسایی بکات، رۆژ بە رۆژ پیساییەکە دەمایەوە ، تا وەکو کۆنکریت رەق بوو، (بووڕاس)ی بەستەزمان جورئەتی ئەوەی نەبوو دەردەسەری خۆی باس کات، ئیدی خواردنی نەدەخوارد ، پێیوابوو کە بەوە رزگاری دەبێت ، لەوەی کە لە گەدەیدا کۆمەڵ بووە، تا مەسەلەکە لە دەرەقەتی ئەودا نەما، ئەوەبوو دەنووزایەوەو بە هەردوو قاچی دەیدا لە دیوارەکە. پاشان تا رۆژێکیان نالەیەکی دوورو درێژ و بە گرمەی لێ هەلسا، تا وایلێهات پاسەوانەکان بە دەنگەوە هاتن ، هیچیان نەکرد، تەماشای حالەتەکەیان دەکرد و کەوتنە حیلکە حیلک، هەرچەندێک پێکەنینکەیان بەرزبووایەوە، بووڕاس یش بە توندی دەیقیژاند: (خەریکە بە گووەکەی خۆم دەخنکێم ، ئیدی برستم لێبڕاوە، دەرمانێکم بدەنێ ، تکاتان لێدەکەم، هەر شتێک بێ بمدەنێ بۆ جوولاندنی ئەم تۆپەلە چیمەنتۆیە). وەلام نەبوو، رۆیشتن و لە دوای خۆیانەوە دەرگاکەیان داخست، هێشتا پێکەنینەکانیان و توانج و نوکتەکانیان دەبیستران: (بێزاری کردوین چونکە گووی نایەت!(

-لەسەری ئەوەیشەوە داوای یارمەتیمان لێدەکات! تەماشاکە وەرە خەریکی گوو دەرهێنانی ئەو بین و بە کەوچک لە قوونیەوە، تفوو!

-بەسە وازبێنە قسەکەت تووشی ئێلنجم دەکات..

-ئەگەریش بە ئەنجامی ئەوە بمرێت، خەیالی ئەوە دەکەیت کە قوماندار راپۆرتێک بنووسێت و ئاراستەی سەرکردایەتی ئەرکانی بکات و باسی ئەو بکات کە کەسی ژمارە (13) مرد لەبەر ئەوەی نەیتوانی گووبکات.

-بە راستی ئەمەیان دۆخێکی گوواویە!..

حسێن توانی لە کلکی گسکەکە کەوچکێک دروست بکات ، کە لەلای خۆی هەڵیگرتبوو، (بیگرە، ئەوەتا خۆت بریندار نەکەیت . گرنگتر ئەوەی هێمن بیت.(

هەمووەمان لە حاڵەتی چاوەڕوانیدا بووین، بیرمان دەکردەوەلە سایەی ئەو بێدەنگیە زۆرەدا، لەو کابرایەی کە ریخۆڵەکانی گیرابوون، گەرچیش چارەسەری تەنها پێویستی بە هەڵگرتنێک هەبوو، یان تۆزێک رۆنی گەچەک ، بەڵام لە کرۆکی ژیاندا نەبووین ، بگرە لە چاڵێکدا بووین بۆ ئەوەی لەناوبچین. هەر یەکێک لە ئێمە بەدبەختی خۆی هەبوو، کێ دەیووت ئەو کابرا بەهێزو شاخاوی و بتەوە، رۆژێکیان سکی وەکو تۆپ هەڵدەزەپێت ؟ گوێم لێی بوو ، خەیاڵی دۆخەکەیم دەکرد و ترسم لێدەنیشت، ئەمەیان تووشی هەریەکێکمان دەبێت. بەڵام دەتوانین ئاگامان لە خۆ بێت، هەموو رۆژێک نەشەویاتی بێ تام و لەزەت بخۆین. بۆیە لەو رۆژەوە بریارمدا بە پێی توانا بە رێک و پێکی تۆزێک وەرزش بکەم ، مەوداکە رێگەی ئەوەی نەدەدام کە زۆر بجووڵێمەوە، بەڵام بە دانیشتنەوە یان بە چینچکەوە هەوڵمدەدا قاچ ودەستم بجووڵێنم و لە شوێنەکەی خۆمدا بجوولێمەوە، سەرەڕای هەندێ راهێنانی ئاسایی و بەسوود، بکەومە سەرپشتم و قاچم بخەمە سەر دیوارەکە، پاشان نزیکیان بکەمەوە لەسەرەخۆ ، ئەژنۆکانم دەنووشتانەوەبەرەو ناوتەنگام. پاشان چوارمشقی دەرۆیشتم ، وەکو قاز ، لەم دیوارەوە بۆ دیوارەکەی بەرامبەر ، گرنگ ئەوەبوو ماسوولکەکانم بجووڵێنم ، بووڕاس، قوونی خۆی دڕیبوو چونکە بە توندی پارچە دارەکەی جوولاندبووەوە، ئەوەبوو خوێنی بەربوو، کەچی لە پیسایییەکەی رزگاری نەبوو. لە ساتەوەختێکدا تووشی نووزەیەکی تووڕەیی بوو ناڵەیەکی بەقیژەی بۆ کرد و، بەربووەوە سەر زەویەکە، دەبێ لەبەر ماندوویی لە هۆش خۆی چووبێت و بۆ رۆژی دوایی مرد، لەگەڵ مردندا قوونی شل بووەوەو هەرچی لە لەشیدا هەبوو هاتە دەرەوە، بۆگەنیەکی تاسێنەر دەهاتەدەرەوە لە خوێنە تێکەڵ بە پیساییەکەیەوە، کاتێ پاسەوانەکان بەو حاڵەتەوە چاویان پێکەوت وازیان لە پێکەنین هێنا، دەم و لووتی خۆیان گرت ، بە هەندێ پەشیمانیەوە پێیانووتین: (دەتوانرا رزگاری بکەن ، بەڵام وامانزانی ئەمە فێڵێکە لە فێڵەکانی ئەو. خۆتان دەزانن بووڕاس بە گاڵتەو گەپەکانی ناسرابوو، لە کوێ بزانین کە قەبزی لە ناوی دەبات؟ بەهەرحاڵ، دەبێ ئەم هەمووە پاک بکرێتەوە، یان ئەگەر قوماندار ویستی کە ئێوەیش شایستەی ئەم گووە بن .(

ئایا ئەم هۆیە ئاگادارکردنەوە بوو یان بەزەیی بوو؟ لە دەمی یەکێک لە پاسەوانەکانەوە پێمانگەیشت ، کە ئیتر لەمەودوا خواردنەکە لەگەڵ دەرمانێک تێکەڵ دەکرێت ، ئیدی دوای ئەوە رووداوێکی قەبزی کوشندە رووینەدا. سەیریی هەندێ لە هەڵوێستەکان وایلێکردین کە هەست بەخەم نەکەین ، لەراستیدا خەم هەستێکی باو نەبوو لەلای ئێمە، هەستمان نە بەخەم دەکرد و نە هەناسە ساردی لەلای ئێمە جێگای نابووەوە، ئەگەر یەکێکمان خۆی بدایەتە دەستی تەڵەی ناسۆریەوە، لەناو دەچوو. چونکە کەسی خەمبار هەمیشە بۆی دەرەخسێت کە لەناوجەرگەی ژیاندا بێت. چونکە خەم ساتێکە لە ژیانی و حاڵەتێکی هەمیشەیی نیە. تەنانەت ئەگەریش تووشی مەرگەسات بوو، هەمیشە لێرەدا کاتێک هەیە کە لەبیرچوونەوە شوێنی خەم بگرێتەوە. بەڵام ئێمە توانای ئەمەمان نەبوو. چونکە خەم کەمترین ناخۆشی بوو بۆ ئێمە، هەر کۆسپێکی بچووک هەندێک بە مەی لێی دەرباز دەبێت ، لێرەدا مافی گریانمان نەبوو. چونکە کەس گوێی نەدەدا بە گریانەکەی تۆ و ، کەسیش فرمێسکی تۆی نەدەسریەوە، هەر کەسێک خۆی دابایە دەستی گریان، دەیزانی کە رۆژانێکی کەمی ماوە، فرمێسک سەروچاوی ئەوی دەشوشتەوە، کە بەم نزیکانە مەرگ دەیلێسێتەوە. ئەو شەوە هەستکردن بە واقیعم لە دەستدا، تۆ بڵێی بە ئاگابووم یان ئەوەتا خەونێکی بێهوودانە بوو شتەکان تێکەڵ ببوون؟ مەرگێک لە جلێکی سپی نەخشراو بە پەپوولەی هێشتا زیندوو؟ وێنەکە تەڵخ بوو. پاشان وێنەکان لەسەرە بە ئێشەکەمدا بە دووای یەکدیدا دەهاتن : (دەستارِ ، خانوو، سەرێک بەرەوخوار، لەسەر دەست دەرۆم، بۆ گوندەکەم، دەشبێ ئەمەیش بڵێم، لە

چاڵەکەدا ، کەوتنی سەر، زەوییەکە چەمایەوە، دەستارەکە دەسووڕێتەوە، ئەوە سەرمە، چی دەبینم، توڕەدەدرێمە ناوەراستی حەوشەکەوە، شوێنەوارێکی ووشکی دار زەیتوونێکی پیر، لەم نزیکە، لەناو هەموو ماڵەکەدا رادەکەم، دایکم بانگم دەکات، دەنگم دەرنایەت رۆژی جەژنە، من دیارنیم، هەموویان دەبینم ، کەس من نابینێ، دەکەومە سەر شەپۆلی ئاو، بەدوای جۆگایەکەدا دەگەرێم ، بەدوای دەریاوە دەگەرێم، خۆشیە، ئەمە چاڵچاڵۆکەیە، خۆر دەگیرێت، بۆ ئەوەی بکەومە ناو رووناکیە درەوشاوەکەیەوە حەزم لە خەو نیە، دایکم بخوورِ دادەگیرسێنێ ، خوشکەکانم دەچنەسەر مێزەکەو سەما دەکەن. یەکێکیان دەڵێ: (گیرام) دەستی راستم دەگەزم، بەجارێک سێ دانم دەکەوێت، قژی خۆم رادەکێشم، گڤ بووە، تەڵێکی لێناکەوێت، مێروله لە ریشمدا دەزێت، نەخێر نە ئەسپێیە و نە رشکە، دەڵێم مێروولەیە، تێدا دێن و دەرۆن، ریشەکەم رادەوەشێنم، خۆی دەگرێت، مەرگ لە نزیکەوە تێدەپەرێت، وەک بلێی پەلەیەتی بەردە رەش لەسەر تای تەرازووە، ئەنگوستیلەیەک دەخەمە تایەکی دیکەیەوە، دەستارەکە پێشدەکەوێت و هەموو شتێک دەکەوێتەخوارەوە. چیرۆکی ژیانیان و ماندوو بوویان بۆیان دەگێرێتەوە، داوای یارمەتیان لێدەکات کە توانای بەردەوامیان بداتێ، بێدەنگ دەمامەوە و نەمدەویست دایکم بێزار بکەم، ئەو بە تەنها نەبوو، کە ئەم تەوافەی دەکرد، ژنانێکی زۆر و زەبەندی بەدبەخت و دایکانی جەرگ سووتاو و کیژانی عازەب و ئەوانی دیکەیش کە منداڵیان نابوو، ژنە دراوسێیەکمان هەبوو مێردەکەی نەمابوو. دوو کەس هاتبوون مێردەکەیان بردبوو، بۆ ئەوەی سەیری خانوویەک بکەن بۆ فرۆشتن، چونکە دەلاڵ بوو، رۆیشت و ئیدی نەگەراپەوە. منداڵەکانی پەنایان بردە بەر پۆلیس لەوێ چەند جارێک پێیان وتن: ( کە گەران بەردەوامە و هەر تازەیەک هەبوو ئاگادارتان دەکەینەوە). هەموو دەیانزانی کە کابرا رفێندرا بوو، تووردرابووە چاڵیکەوە، دەیانووت گوایە تاوانەکەی ئەوەبوو کە لە کێشەیەکی شوومدا تێوەگلابوو، پەیوەندی بەفیلێکەوە هەبوو کە یەکێک لە پیاوانی دەست رۆیشتووی سەر بە دەسەلات دەستی بەسەردا گرتبوو، کە هی کابرایەکی بیانی بوو لەبەر رەوشت لە مەغریب دەرکرابوو. راسپێردرابوو لەلایەن خاوەنەکەیەوە کە بیفرۆشێت، چەند جارێک ئاگاداری کردبووەوە کە باشتر وایە مەسەلەکە لەبیرکات. ئەوە بۆ فرۆشتن نیە و، موڵکی کابرای فەرەنسیش نیە، ئامۆژگاریەکانی بە راست وەرنەگرت و دیار نەما.. ژنەکەی دراوسێمان بوو، رۆژانی هەینی سەردانی ئەو حەوت وەلیەی دەکرد و قسەی لەگەڵدا دەکردن و داوای لێدەکردن هەق ئاشکرابکەن :( یا ئینسافم لەگەڵدا بکرێت و مێردەکەمم بۆ بگەرێتەوە! ئەگەر مردووە یان کوژراوە یا ئاگادارم کەنەوە، خەوم نەماوە ، کفنەکەیم ئامادەکردوە ئەوەتا چاوەرێم و ژووری زەماوەندیشمان ئامادە کردووە ، ئەگەر هاتەوە وەکو رۆژی یەکەم سەرلەنوێ زەماوەند دەکەین، منداڵمان نەبووە ، بەلام تا کۆتایی لەلای پێغەمبەر شەفاعەتم بخوازن.

"سەرچاوەی هەقم هەیە، رووناکیەکم هەیە لە ئارامگاکانتان دێتەدەرآ، بۆ ئەوەی بزانم مێردەکەم لەکوێیە، لێرە کەس گوێم لێ ناگرێت، کەس وەلامم ناداتەوە. لێرە پیاوان ترسنۆکن" قفڵێکیدا لە شیشی یەکێک لە پەنجەرەکانی مەزارەکە، قفڵەکەی دادەخست وکلیلەکەی فرێدەدایە کونی راکێشەرەکەوەو هەموو رۆژی پێنجشەممەیەک دەهات بۆ ئەوەی بزانآ قفڵەکە کراوەتەوە، ئەگەر کرابایەتەوە ئەوا نیشانەی چارەنووسەو مێردەکەی بۆ دەگەرێنێتەوە. لە تاریکەشەودا دوای ئەو تارماییە دەکەوتم، ئەوە دایکم نەبوو، لەوانەیە ئەو بۆی ناردبم، دەبآ دایکم نەخۆش بێت، ئەمەیش پەیامەکەیە. دەبوو خودی خۆم زیاتر وزیاتر کۆبکردایەتەوە، تا لەم حیدسەی خۆم دڵنیابم، دایکم و ئەو ژنەی کە بەدوای مێردە وونبووەکەیدا دەگەرێت، دایکم و تارماییەکە کە دوای هەنگاوەکانی کەوتووم، هەردووکیان لەو بێدەنگییە قووڵەمدا قسەیان بۆ دە کردم ، حیدسم زۆر بەهێزبوو، هەموو گومانێکم رەویەوە: دایکم نەخۆشە، لەوە دڵنیابووم، سەرلەنوآ

کەوتمەوە بەسەر جەستە ئێشاویەکەمدا. سەروچاوی دایکمم بینی رەنگ زەرد هەردووچاوی سوور هەڵگەڕابوون. ئازاری هەبوو، نەخۆشیەکی ئاسان نەبوو، نەخێر، دایکم تووشی نەخۆشیەکی کاریگەر هاتبوو، دەبووایە بەهاوڕێتی ئەو وێنەیە ژیابام، بۆ ئەوەی زیاتر هێز وخۆڕاگریم بداتآ بۆ ئەوەی بەرگری بکەم. لەوقۆناغەدا لە ڕێگای رووحانیمدا، هەر لەخۆمەوە خۆمکرد بە گومەزی تەنیایی خۆشەوە، لەو شوێنەی کە گازندە سوودی نیە، بەڵام هەر بەردێک، هەر تۆزە بێدەنگیەک. ئاوێنەیەکەو خودی تیاسووک بەدی دەکەیت وهەندێجاریش بڕوا بەخۆبوو، هەندێجاریش واقووڕماوێکی تووند، ئەو گومەزە سێبەرم بوو، نهێنیە مووتڵەقەکەم بوو، ئەو باخچە نهێنیەم بوو کە پەنای بۆ دەبەم. زیندانەکەم بەجێدێڵم و لە سەر نووکی پەنجەکانم رێدەکەم، لە دوای خۆمەوە کاژێ لەشم بەجێدەهێڵم، بەرەو بانێژەکانی بەر خۆرەتاوی ئەو خانووە بەرینە دەفرم، هەندێکیش داتەپیوە، کە سەرەدەرکردنم ولەتاریکترین شەوەکاندا ئارەزووی بەردەوام بوونم لەرێگا بۆ دەگەڕێنێتەوە، لەوآ کاتی زۆرم هەبوو بۆ بیرکردنەوە لە بەردە رەشەکە، لەو گەشتە کە خۆم بەتەنها کردبووم تائەنجامی بدەم، بۆچی کابە، مەکەومەدینەم هەڵبژارد؟ ئەم شوێنانە شوێنی پیرۆزن بەپآی ئەو ئایینەی کە لەسەری پەروەردە بووم.

ئایین بەلای منەوە مەسەلەیەکی کەسایەتیە، بەڵام چەندجار بەگوێمدا دەوترێت کە ئیسلام تایفەوناسنامەی ئێمەیەو ئێمە نەتەوەیەک پێکدێنین، ئەوجوانترەو باشترین خوڵقاندنی خودایە، کاتآ لە(هەرمومو) بووم وازم لەنوێژکردن هێنابوو، بڕوام بەخوا هەبوو، بەڵام هەندێجار تووشی گومان دەبم. لەوەتەی فەرمانی مردنی هێواشم بۆ دەرچووە بەوەی کە جەستەم دابڕزێت، وازم لەزیکری خوانەهێناوە، نزیک بوون لەمەرگ و ریسواکردنی کەرامەت و چەوساندنەوەی ناجۆر کە لەدەورماندایە، وای لێکردم کەرێگای ئەم دوورەپەرێزیە خۆشە بگرم.

باخچەکەم سادەیە: هەندآ دار پرتەقالر، درەختێکی لیمۆ یان دووان، لەناوەڕاستەکەیدا بیرێکی ئاو چاوقرژالر وگژوگیایەکی چڕ و ژوورێکی نووستن بۆ رۆژانی سارد یان ئەوکاتەی باران دەبارێت، هەبوو، ئەو ژوورە کە هیچی تیانیە، تەنها نوێنێک و لێفەیەک و سەرینێکی تیایە. دیوارەکانی بەگەچی شین کەفمالر کراوە. کاتآ رووناکی رۆژ نامێنآ، دوو مۆم دادەگیرسینم و دەچم بەلای خوێندنەوەوە. کاتآ ئێوارەیش دادێت، ژەمێک لەسەوزەی باخچەکە دەخۆم. بەڵام نان پیرەژنێک بۆم دەهێنآ، ژنەجوتیارێکی خەڵکی ناحیەکەیە، هەموو رۆژآ لەکاتی خۆیدا دەیهێنآ ، ئەمەیش نهێنیەکەمە، ئەو ژیانەی کەخەونم پێوەی دەبینی، ئەو شوێنەیش کە هەمیشە حەزم لێ بوو لێی نیشتەجآ بم، بۆ ئەوەی بچم بەلای تێڕامانەوە، تا نوێژبکەم و ئەوانە یادبکەمەوە کە لێرە نەماون، هیچی ترم ناوآ، داوام ئەوەیە، کە هیچم نەبآ، خۆم لەهەموو شتآ سووک بکەم، تەنها دیشداشەکەم نەبآ کە لەشم دادەپۆشێت، ئامادە دەبم، بۆ ئەوەی واز لەهەمووشتێک بهێنم، ئامادەبم بۆ رۆیشتن، هیچ شتێک مرۆڤ دوورناخاتەوە لەبیرکردنەوە لەمەرگ زیاتر لەوازهێنانی موتڵەق نەبآ، باشتر ئەوەیە کە هەموومان بگەینە ئەم حاڵەتە بۆ ئەوەی بەکۆمەڵر بەسەر مەرگدا سەرکەوین ، بەڵام نەخۆشیی و دارزانی هێواشی لەگەڵر ئێش و ئازاردا ، هەردووکیان رووی راستەقینەی مەرگن . هەڵدێرەکە دەم دابچڕاو بوو هەندێکمان لەتاریکیەکەدا رێیاندەکرد بآ ئەوەی لە زیندانەکەیاندا بچنەدەرەوە، کونی زەوویەکە کە بەزەوویەکی تەڕ داپۆشرابوو قوتی دەدا. کاتآ لەباخچەکە دەبم خۆشحالر دەبم، هەست دەکەم زەمەن و بیرو زوڵم لەخۆم تەکاندوە، لەهەموو ئازارێک کە تووشی بووین. بەڵام ناگەیشتمە باخچەکە تەنها لەبەر ئەوەی کە دەمویست، چونکە دەبآ یەکەم لەشەیتانۆکەکەی خۆم بێمە دەرەوە، یان لە سەرەخۆ بم تا ئازاد دەبم، بپەڕمەوە بۆ جیهانێکی دیکە. ئەمەیش مەسەلەیەکی ئاسان نەبوو، بۆ بردنەوەی کۆکردنەوەی خود ، بارودۆخێکی نائاسایی دەوێت تەنها بێدەنگیش بۆ ئەوە بەس نیە، هیچ رۆژێک نەگەیشتوومەتە پڕبوونی تەواوەتی، چونکە هەمیشە سەرنەکەوتوو بووم لە بیرچوونەوەی

ئازاردا، بەتایبەتی لەو قۆناغەی کە دانەکانم لەدەست دەدا، دانەئێشەیش تەنها ئەشکەنجەی تاڵی پێ نەدەنووشیم، بگرە تووڕی دەدام و لە بەرنامەی گەشتەکەم لە نموونەیی روحانیم لایدەدام، کە لەگەڵیدا بیرکردنەوەو هۆدۆزە و بەر گریکردن مەحاڵ بوو. ئەشکەنجەکەمان هاوبەش بوو، چەند هەوڵمدا کاکیلەیەکم هەڵکێشم. هەرکە بەتووندی رایدەکێشم لەگەڵیدا پارچەیەک لەمەلاشووم بە ساغی لێدەبێتەوە، ئازارەکە ئەوەندەی تر زیاد دەکات، لەکاتی سەرمای تەزیوو و زەردەگەرما تاسێنەردا و لەکاتی نۆرەی باداریدا توانیم کۆنترۆڵی جەستەی خۆم بکەم، بەلام دانیشە کۆڵی پێدەدام. بۆگەنی جەستەمانی ئەندام لە دوای ئەندام تەنی بوو، تەنها شتێک کەتوانیم بیپارێزم سەرم و ئەقڵم بوو، وازم لەئەندامەکانم هێنابوو بۆیان، تەنها داخوازیم ئەوەبوو کە زاڵ نەبن بەسەر زەین و ئازادیم بۆ ئەو شنە بایەی دەرەوە و ئەو تروسکایە کزەی شەوانەمدا، پەنام دەبردە بەر بەرگریەکانی خۆم و گوێم نەدەدا بە پلانەکەیان. فێربووم واز لە جەستەم بهێنم، جەستە ئەو شتە بینراوەیە کە دەیانبینی و دەیانتوانی دەستی لێ بدەن و بەدەمێکی بەئاگر داخکراو داخی بکەن، دەتوانن ئەشکەنجەی بدەن، برسی بکەن، بیخەنە بەر دووپشک و سەرمای تەزیوو، بەلام وریایی ئەوە بووم لەوەی کە زەینم بەدووربێت لەوان. تەنیا هێزم ئەوە بوو کە بەخۆدوورگرتن بەرەنگاری تووندوتیژی جەلادەکان دەبوومەوە، بەبێ گوێدانم، بەبێ هەستیاریم، لەراستیشدا من گوێ پێنەدەرو بێ هەست نەبووم. بەڵکو بۆ تێپەڕاندنی سەرکوتکردنمان مەشقم دەکرد: چۆن هەریەکێک لە ئێمە دەبێ گوێپێنەدربێت؟

ئازار دەچێژێ، بەشیشێکی ژەنگاوی گۆشتەکەت کون دەکەن، خوێن دەڕوا، لەگەڵیدا فرمێسکت دەڕژێت، لەشتێکی دیکە بیردەکەیتەوە، بەهەموو هێزێکتەوە سووری لەسەر ئەوەی خۆت رزگارکەیت، بیرکردنەوە لەئازارێکی تووندتر لەوە. بەوە رزگارت نابێ کە لەکێڵگەی خشخاسی رژاو، یان لەمرواری سپی بیربکەیتەوە. نەخێر، ئەم رزگاربوونە کورتخایەنە و پێویستی بەتۆزێک نهێنی هەیە، بگرە ئاسانیش دێتەدەست، لەسەرەتادا رامدەکرد بۆ کێڵگەکان، بەلام خێرا ئێش و ئازار دەیگەڕاندمەوە بۆ چاڵەکە، هەر ئەوکاتە هەستم کرد کە رەوینەوەی ئازار تەنها بەبیرکردنەوە دەبێ لەئازارێکی تووندتر لەخۆی و ترسناکتربێت لەو. خۆشبەختانە مێشکم هیچ خراپەیەکی بەسەر نەهاتووە، بەهەموو شتێ خۆی بەهێزدەکرد: وشەیەک کە هاوڕێیان بیانووتایە، حیکایەتێکم لێ دەهۆنیەوە، تاسەی من ئەوە بوو حیکایەتی وشەکان بدۆزمەوە، بۆ نموونە وشەی (قاوە) چەند سەعات دەمامەوە خەیاڵی ئەوەم دەکرد، کە ئەم دەنکانە لە چ شوێنێکەوە هاتوون، دەیدۆزمەوە. چۆن بیرۆکەی کۆکردنەوەی پەیابوو بەو بڕەی کە بەسە بۆ کارکردنی، دواجاریش هاڕینی و چۆن کوڵاندنی ئەم هاڕاوە قاوەییە رەشە پەیابوو و پالاوتنی ئەو شلەیەی کە لێوەی دەردەچێت، خواردنەوەی بەشەکروە یان بێ شەکرو تێکەڵکردنی لە گەڵ دەنکە هێلدا یان شتی تر: چۆن بووە خواردنەوەیەکی جیهانی و بەنگێک بۆ هەندێ کەس و بە ئاگاهێنەر بۆ هەندێکی دیکە. بەلام لەلای هەمووان بووە باو، خەیاڵی کێڵگەی ئەو رووەکەم دەکرد کە دەنکی سەوز دەگرێت، لەسەر یاڵی شاخە هەتاویەکان دا، ئەو ماوەیەم دەبژارد لەو رۆژەوەی کە ئەو درەختە دەچێنرا تا بەرەبەیانی ئەو رۆژەی کە دەچمە قاوەخانەیەکەوە و بێ بیرکردنەوە دەڵێم"فنجانێکی قاوەی بێ شەکر، ئەگەر بفەرمووی با خەست بێت". خەیاڵی گەشت و وێستگەکان و ناوەندەکان دەکەم، هەروەها بازنەی فرۆشیاروکڕیارەکان، وئەو کارگانەی کە چارەسەری جۆرەکانی قاوە دەکەن. چۆن ئارابیکا تێکەڵ بە رۆبوستا دەکرێت و، چۆن باشترین بەروبووم هەڵدەبژێرن و دەیخەنە لاوە. پاشان دەیخەنە بەردەست ئەو خەڵکانەی کە دەسرۆن و زۆر داواکاری لەوەی کە پەیوەندی بەجۆری قاوەی بەیانیانەوە هەیە. "

بیر لە کۆشکێک دەکەمەوە کە هیچ میرێک یان شایەک لێی هەڵناسێت دوو فنجانە قاوەی رابیکای خەست لەکۆستاریکاوە هاوردەکراوە نەخواتەوە، کە بەدەستی ئیتالیەکان برژاوەو بەدەستی چێشتلێنەرێکی ناپۆلی

ئامادەکرابێت. هەروەها بیر لەچەخماخەی تووڕەیی دەکەمەوە کە پێویستی جەستە بۆ قاوە هۆیەکەیەتی یان زۆر خواردنەوەی.

دەمێکە تووشی ئەو چەخماخە تووڕەییانە نابم. دیارە لێرە خواردنەوەی بەیانیانمان بەمادەی برۆمور، یان هەردەرمانێکی دیکە تێکەڵ دەکەن، بۆ ئەوەی ئامێرەکانمان نەرم بێت. لە(هەرمومو) پەنایان دەبردە بەر ئەو ڕێبازەش، وەکو یەکێک لەچێشتلێنەرەکان پێی وتم، هەموو هەفتەی جارێک بۆدرەیەکی سپی دەکەنە ناو مەنجەڵێکی گەورەی قاوەوە، تەنها لەکاتی مۆڵەتەکاندا نەبێت، ئەوەم دەزانی. سوپا تەگبیری هەمووشتێک دەکات، دەشبێ هیچ شتێکی بەسەردا تێنەپەڕێت، تەنانەت ئەگەر لەدەرەوەی سەربازگەیش بوونایە، لای خێزانەکانمان یان لەلای سۆزانیەکان دا، چاوی سوپا لەسەرمان ئێشکگر بوو، لەکاتی ئاشتی دا موڵکی ئەو بووین وەکو چۆن لەکاتی جەنگدا، کە لەکوێ بووینایە پێشبینی ئەوەمان دەکرد جەستە پارچە پارچە بکەوێتە خوارەوە، سەبارەت بە من شی کردنەوەی من یەکەم شل وشاوبوونی جەستەم بوو، ئەویشم لەبیرکردبوو، زۆر زەحمەت نەبوو بەلامەوە کە پشتگوێیخەم ، ئەمەیش بردم بۆ بیرکردنەوە بەشێوەیەکی گشتی لەژیانی سێکسی مەغریبییەکاندا بەشێوەیەکی تایبەتی. زانایەکی دەروون ناسی نەبووم و پسپۆڕێکی کاروباری سێکسی نەبووم. مەسەلەکەیش هەمووی ئەوە بوو کە سەرنجی هەندێ لە هەڵس وکەوتی هاوڕێکانم دەدا، ئەو ڕۆژانەی کە هێشتا لە ئەکادیمیا بووین. وەکو ئەوان بووم: ژیانێکی سێکسی بەدبەخت و بەپەرۆش و نیمچە ئاژەڵیانە، پشووە کورتەکانمانم بیردەکەوتەوە، بەتایبەتی لە ئێوارانذا بەچاکی ئەو قوماندانەی کە دە خوێندکاری هەڵدەبژارد بۆ ئەوەی بچن بۆ ئەو شارە نزیکە، بۆ بەتاڵکردنەوەی کەپتە پەنگخواردووەکەیان، بەبێ ناونان، بە(رووخسەتی گانکردن) لەقەڵەم درابوو هەریەکێکمان ماڵی خۆی هەبوو بیرم دێتەوە خانوویەک هەبوو بەمۆم ڕووناک بوو، حەوشەیەکی ناوەوەی بەفەرشی سوور ڕاخرابوو، ژوورەکانی دیکەیش پڕیان لەفەرشی لەسەر کەڵەکەکراو بوو، ژنێکی قەڵەو لەبەردەم یەکێک لەژوورەکان دا دانیشتبوو، چوارپێنج کیژۆڵە لەدەوری دانیشتبوون، لە پڕێکدا پیرێ ژنێک لەسێبەرەکەدا پەیابوو، سینیەکی لەسەردەست بوو چەند کوپ چایەکی لەسەربوو، کیژێکی دە ساڵانی لەتەک بوو، سینیەک نانی بەهەنگوینی لەسەربوو، مەسەلەکان هەمووی بەبێدەنگی بەڕێوە دەچوون، هاوڕێکانم فێربوون لە من زیاتر سەردانی ئەو ماڵەیان دەکرد، ژنەگەوادە قەڵەوەکە بەناوی خۆمانەوە بانگی دەکردین و دەیوت: (ماوەیەکی دوورودرێژ دیارنین، دەبێ تۆ سزادرابیت. سوپا ڕەحمتان پێ ناکات. گاگەل و پەرژینیان خستووەتە نێوان ئەوان و ژیانەوە! ئای لەم بەدبەختیە! من بەزەییم بەحاڵی کیژۆڵەکانمدا دێتەوە، کە بەم ڕۆژگارە بەڕە دەچنن و زۆر جاریش دەپرسن ئایا ئێوارە سەردانیکەرمان دەبێت. منیش بەچی وەڵامیان بدەمەوە)..

بەچرپە چرپی نەبیستراوەوە قسەمان دەکرد. چایمان دەخواردەوە و کولێرەمان دەخوارد، هەریەکەمان چاوی دەگێڕا بۆ ئەوەی دۆستەژنی خۆی هەڵبژێرێت، یان بەبارێکی دیکە قوربانیەکەی خۆی هەڵبژێرێت. چونکە ئەوەی کە بۆی هاتبووین بە پەلەو بەشێرزەیی ئەنجامان دەدا. هەمیشە بۆچێ بەجێکردنی مەسەلەکە بەپەلەبووین، کرێی کیژە شاخاویە بەدبەختەکانمان دەدا، چاوەڕێی جاری داهاتوو بووین، دوای چای خواردنەوە ژنە گەوادەکە مۆمەکانی دەکوژاندەوە، هەریەکەمان دەچووە لای کیژۆڵەکەی خۆی، مەسەلەکان پێشینە ئامادەکرابوون، پێویستی بەقسەکردن نەبوو، لەتاریکیەکی تەواوی پڕ لەچرپە چرپ و هەناسکە هەناسکی بچڕ بچڕدا، پاشان قیژەیەکی تاساو، هاواری پیاوێک لەچاوتروکاندنێکدا دادەبەزێت، هەر کە هەڵدەساینەوە کیژۆڵەکە لەسەر گازی پشت دەمایەوە، هەردوو قاچی بلێوکردووەتەوە، هەندێ لە کیژۆڵەکان دەییانووت:

(پیاو ئاوها دەبآ، وەکو بروسکە تیژن) بەهەندآ شەرمەوە هەڵدەساین، هەوڵماندەدا خێرا لەماڵەکە بچینە دەرەوە، پاشان لەهاوشانی یەکتر ریزدەبووین و میزمان دەکرد بەدیوارەکەی بەرامبەردا، لەو بڕوایە بووین کە بەوە لەو میکرۆبانە رزگارمان دەبێت کە لەوانە هەڵەمانگرتبآ، رۆژێک هەستم نەکرد شانازی بکەم بەوەی کە دەمکرد، هەموو جارێکیش سوێندم دەخوارد کە چیتر نەیەمەوە بۆ ماڵەکەی ئەو ژنە گوادە قەڵەوە ، ئەو ژنە قالی چنە.

(21)

ئەمجۆرە بیرەوەریانە سەرقاڵیان نەدەکردم هەوڵیشم نەدەدا کە وەکو بیرەوەریەکانی دیکە سووکیان بکەمەوە، ئەوانە تەنانەت بیرەوەریش نەبوون، بگرە مشتی بوون لەوێنەی کالڕ کە دەگەڕانەوە بۆ سەردەمی سەرەرۆییمان، هیچ خواستێکمان نەبوو جگە لەوەی کە سەربازی لێهاتوو و ئەفسەری چاک بین لەرێزەکانی هێزە چەکدارەکانی پاشایەتیدا. ئاستی فێرکردنمان بەرزنەبوو. ئەگەر خراپ نەبووایە. حەزم بە خوێندنەوە بوو لەدوای هەر گەڕانەوەیەکمدا لەموڵەتەکەم چەندکتێبم لەگەڵ خۆم دەهێنایەوە، کە لەخاوەن کتێبفرۆشیەک دەمکڕی لە(فاس). پیاوێکی پیربوو، چاوی کزبوو، هەمیشە دەیووت ئەوکتێب لەبەر خاتر ژنان دەفرۆشێت، چونکە باشترین کریاری ئەون، زەوقیان دەزانآ و دەزانآ حەزیان لەچیە. وەکو پزیشک و عەتار ئاماژەی ئەوانەیان بۆ دەکات کە لەگەڵ ئارەزوویاندا بگونجێت، دوکانەکەی پڕبوو لە هەزاران کتێبی کەڵەکە کراو بەشێوەیەکی شێواو، کە تەنها خۆی دەیزانی ڕێکیان بخات، هەمیشە رۆمانە فەرەنسیە کلاسیکیەکان و دیوانە شیعری عەرەبی بۆهەڵدەگرتم، خوێندەوە تاکە دەرگای شاراوە بوو کەلێوەی بچمە ژوورەوە و لەقوتابخانەی سەربازی هەڵبێم، کە تووندوتیژ مەشقی پآ لەبیردەبردمەوە و، یارمەتی دەدام بۆ ئەوەی گوآی خۆم کەڕکەم لە هات و هاواری ئەفسەرە نەخوێندەوارەکانی ریز، کەتێکەڵەیەکی عەرەبی و فەرەنسی بوون، هات و هاوارەکەیان:(راسلما) بۆ ئەوەی بڵێن(کۆبنەوە) و (غەزا) بۆ چاک بوونەوەو، (بیرمیسو) بۆ مۆڵەت و.. تاد.. لەوچاڵەدا سەرجەم لاپەڕەکانی رۆمانی(باوەگۆریۆ)م لەو تەنیاییەدا بەبیری خۆمدا دەهێنایەوە، زۆرجاریش ئەمە لەکاتی سەیردا دەبوو، بۆ نموونە کاتێک تووشی دان یەشە دەبووم، کە نەمدەتوانی دەمم بکەمەوە، وشەو گوزارشتەکان لەخۆیانە دەردەپەڕین و لەبەر خۆمەوە دەمخوێندنەوە، وەکو بڵێی لەقوتابخانەم و دەقێکم دەووتەوە یان بۆ منداڵێکی نەخۆش دەمخوێندەوە. وەکو نیعمەتێک وابوو لەخواوە. بەویستی ئەو سەدان لاپەڕەم بیردەهاتەوە کە چەند ساڵڕ لەمەوبەر خوێندبوومنەوە، پێویستی بەهیچ هەوڵێک نەبوو بۆ بیرهێنانەوە: هەر لەخۆیان بەبیرم دەهاتنەوە.

(لەکۆتایی ساڵی سێیەمدا، باوە گۆریۆ خەرجیەکانی خۆی کەم کردەوە ، کە گواستیەوە بۆ نهۆمی سێیەم، بەچل و پێنج فرەنک مانگانە لێی نشتەجآ بوو، هەروەها وازی لەجگەرەیش هێناو وازی لەوەش هێنا کە بۆن لەخۆی بدات). هەندآ کەس بەو بڕگەیە پێکەنینیان دەهات، کەنابآ پیاو بۆن لەسەرچاوی خۆی بدات.

ئاسان نەبوو لەلام کە هەردوو بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی کە لەو سەردەمە باو بوو راڤەبکەم، کە بەلزاک کتێبەکانی تیا نووسیوون. بۆیە گوێم بە پێکەنینەکەیان نەدەدا و بەردەوام دەبووم:

(باوەگۆڕێو پیرێکی داوێن پیس بوو، چاوەکانی بەدوور نەبوون لەکارتێکردنی پیسی ئەو دەرمانانەی کە نەخۆشیەکانی پێویستیان پآی هەبوو، مەگەر بەلێهاتووی پزیشک نەبێ.)

-مەبەست لەپیرێکی داوین پیس چیە؟

ئیدی ئەوە بوو دەستم کرد بەراڤەکردنی دەقەکەو وشەکانی، ئەو مەسەلەیەش لە رۆمانەکە دوورمان دەخاتەوە و زۆرجاریش دەمانبات بۆ دەمەتەقێیەکی سیایی دەربارەی کۆمەڵگاکەمان و داب و نەریتەکانی و هەروەها درۆ و مۆڵگەی نامەردیەکانی، پاشان کاتێک ئەو نامانە دەخوێنمەوە کە دایکی راستینیاک و خوشکەکانی خۆی بۆی ناردون، گوێگرەکان دەکەونەوە گومانەوە و گاڵتەم پێدەکەن.(باسی فیلمێکی پۆلیسیمان بۆ بکە، یان فیلمێکی کاوبۆی. ئێمە تۆزێک حەزمان بەتەشویقە). بەردەوام دەبووم(لەخوێندنەوەکانم) ئەگەرچیش هەندێکیان بێزار دەکات بۆیە ئەوە دەکەم تابیری خۆم مەشق پآ بدەم و بەرگری مەترسی شێوانی بکەم. بەڵام لەکاتی ماندووبوونمدا، هەندآ وەخت روودەدات کە بەبآ رێک وپێکی یان بآ سیاق چەند لاپەڕەیەکی بەلزاک و هەندێکیش لەڤیکتۆر هۆگۆ بەبیرم دەهاتنەوە. ئەوجایش هەمووشتآ لەسەرمدا تێکەلڕ دەبوو، کە دەبووە هۆی نیوە سەرەیەشەیەک، وەکو بلێی ئەم سیخناخیە دەبووە هۆی دڵتەنگیم و تەحەموول نەدەکرا. لەبەرخۆمەوە دەمووت:

"لەسەرەخۆبن، خۆش بەختانە تۆ بەبیری باش ناسراوی، بگرە نایابیش، هێور دەبوومەوە و هەمووشتآ دەگەڕایەوە وەکو جاران" ئەم بیرە دڵنیایە ئەو هەمووشتەیە لەباوکمانەوە بۆمان ماوەتەوە. وەکو زۆربەی براو خوشکەکانم بیری نایابم هەیە، برا بچووکەکەم، ئەوەی کە سەفەری ولایەتە یەکگرتووەکانی کردو لەوآ لە "ئاکتورز ستۆدیۆ" وانە نواندنی خوێندن، دەیتوانی هەموو شیعرەکانی(گوڵە بەدەکان) لەبەر بلێتەوە بآ ئەوەی هەڵەبکات یان زمانی تەتەڵەبکات. لەدەستدانی ئەم هێزە خۆڕسکیە لەوانە بوو کارێکی نێگەتیڤ بکاتە سەر ژیانم لەچاڵەکەدا: زیندانەکەم تەسک دەبوەوە، دیوارەکانی نزیک دەبوونەوە و میچەکەی نزم دەبوەوە. دەبآ لەبەرامبەر ئەوەدا پەلەبکرێت بۆ گەڕانەوەی توانای پەیوەندی کردن بەو جیهانە دوورە خەیاڵکراوانەدا.

بۆ ئەوەی دڵنیابم دەڵێم:(بیری خۆم بەتالڕ کردەوە، یادەوەریە بەئێشەکانم لێی دوورخستەوە و زۆریانم سووتاند، لەوانەیە نەمتوانی بێت لەزۆربەیان رزگارم بێت، یان لەوانەیە هەڵەم کردبێت: دەبآ من کتێبەکانم سووتاندبآ لەجیاتی وێنەکانی هەرزەیی و شوێنەکانیان. نەخێر، دەبآ ئەم بشێویە رێکبخەمەوە و، ئاسوودەبم و، لەسکەوە بەهێواشی هەناسە دەکێشم، بەهەمان هێواشیەوە هەناسە دەدەمەوە و قاچی راستم درێژ دەکەم و بەشێوەیەکی بازنەیی دەیجوڵێنمەوە، قاچی راست شل دەکەم و بەقاچی چەپ هەمان شت دووبارە دەکەمەوە. هەردوو قووڵم درێژ دەکەم، دەست لەدیوارەکان دەدەم، بەدانیشتنەوە بەرزیان دەکەمەوە. میچەکە لەپێنج سانتیمەتر لەنووکی پەنجەکانمەوە دوورنیە، دەبآ دیوارەکان بکشێنەوە، بەلەپم پاڵیان پێوە دەنێم. تۆزێک باڵا هەڵدەبڕم و هەوڵدەدەم میچەکە هەڵبڕم وەکو بلێی سەرقەباغی مەنجەڵە.

بەدرێژایی رۆژ ئەم پرۆسەیە دووبارە دەکەمەوە، هەرکە لەبەر ماندوویی هەرەس دەهێنم، هەست دەکەم کە توانیم، چەند سانتیمەترێک بەدەست بهێنم. تەنها گرفتەکەیش-گرفتی بیرە- دەکرێت بەکاری شتێک چارەسەربکرێت، شتێکی دەستگیر، کە بواری بەندکردنمە.

**ئەگەر توانیم کتێبخانە زەینیەکەم رێک بخەمەوە ئەوا رزگارم بووە و دیوارەکان کۆڵیان پآ نەدام، ئەگەر بەزین هەلاتمایە بۆ بەیەکگەیشتن بەهەندآ لەوکەسایەتیانەی کە رۆمانووسەکان خەیاڵیان کردوە، ئەوا گرفتی تەنگیم لە خۆم دووردەخستەوە.**

**هەر لەوساتەدا بەخۆی وەحیم بۆ هاتە خوارەوە:( ئەگەر بیرت خیانەتت لێ دەکات، کەسایەتیە تایبەتیەکانی خۆت بدۆزەرەوە)، لەراستیدا ئەوە خیانەت نەبوو، بگرە بی تاقەتی وماندوویی بوو، باوەگۆریوم بۆ(خوێندنەوە) دوابەدوای ئەویش(کلۆڵەکان) و دووبارە خوێندمەوە و دووبارە تا ئامێری ریکۆردەکە پەکی کەوت، زۆر پێویست هەبوو بۆ لاپەڕەی نوآ، بۆ چەند چیرۆکێک بۆیەکجار بخوێندرێتەوە، چەند رۆژێکم لەگەڕان بەسەربرد، بەرە بەرە کتێبخانەکەی خۆم پێکهێنایەوە، کتێبی زۆری تیانەبووە، بەلام کتێبێکی تیا بوو لەکاتی تاقی کردنەوەکانی چوونە ناو قوتابخانەی مەغریبییەوە بۆ کارگێڕی و(کە تیاسەرکەوتوو نەبووم بەجیاوازی نمرەیەک) خوێندبوومەوە. ئەویش کتێبی(نامۆ)ی ئەلبێرکامۆ بوو، ئۆە! ئای لەوخۆشی و لەزەتە بەرگەشتەی ئەو لاپەڕانە کە دەربڕینی هەڵبژاردەیان تیابوو، لەماوەی سەرجەم مانگێکدا، (نامۆ)م بۆ برادەرەکانم دەگێڕایەوە و، یادی عەبدول قادری بەدبەختم کردەوە کەمرد، چونکە کەسی نەدۆزیەوە چیرۆکێکی بۆ بگێڕێتەوە. لەگەلڕ کامۆدا هەستم کرد لەسەر رووی خۆمم. نەخێر بگرە بەگێڕانەوەی هەندآ لەبڕگەکانی زیاتر لە جارێک چێژم وەردەگرت، هێندەی بەهای سەر سوورهێنەری دەداتآ کەچیرۆکی تاوان تێپەڕدەکات، ئەو رۆمانە کە لەچاڵدا دەگێڕدرێتەوە، لەنزیک مەرگەوە، هەمان واتای نابێت، لە مێرگێکدا لەژێر سێبەری درەختی گێلاسدا خوێندرابێتەوە. چاوکانم دەقەکەیان کۆپی کرد. دەمخوێندەوە وەکو بلێی لەسەر تابلۆیەک لەسەر شاشەیەک لەبەرچاوم بوو، بەبآ وەستان. ناوە ناوە دەمبیست یەکێک هاواری دەکردو دەیووت:(دووبارە، دووبارە، ئەگەر روخسەت هەبآ. بڕگەی دووەم دووبارە بکەرەوە)، لەسەرخۆ بەردەوام دەبووم، وشەکانم دوور دەخستەوە، نێوانێکی زەمەنیم دەخستە نێوان وێنەکانەوە، بۆئەوەی جێگای بڕگە زارەکیەکان بگرنەوە.(خۆرەکە تیشکەکەی بەنیمچە ستوونی دەخستە سەر لمەکە، دەرەوشانەوەی لەسەر دەریاکە لەتوانا بەدەربوو). دانم دەنا بە هەردوو وشەی(خۆر) و(دەرەوشانەوە) دا، پێم وابوو دووبارەکردنەوەی ئەو دوو گوزارشتە چاڵەکەمان پڕ لەرووناکی دەکات، کە لەدەرەقەت نایەت. و بەردەوام دەبم:( خۆرەکە زاڵر بوو، پریشکی دەهاویشت بۆ سەر لم و دەریاکە)، بەتووندی وشەی(لم) و(دەریا)م دەووت و دووبارەیان دەکەمەوە و بەردەوام دەبم:(دوای تۆزێک گەڕامەوە بۆ کەنار و وای لێکردم رێبکەم. پریشکە سووتێنەرەکەشی لەگەڵدا بوو، لەسەر لمەکە دەریا خێرا وکپ هەناسەی دەداکە هی شەپۆلە وردەکان بوو، لەسەرەخۆ دەرۆیشتم بەرەو تاشە بەردەکان و، هەستم دەکرد سەرم لەبەرخۆرەکە ئاوساوە). لێرەدا تووشی گومان بووم. وشەی(سەرم) یان ( ناوچەوانم)بوو؟ تەنها تێکڕاییەکی بچووک بوو. داوای مەعزەرەتم لە(کامۆ) کرد ئەگەر یەکێک لە گوزارشتەکانیم لوول دابێت. هەریەکێک لەئێمە شێوازی خۆی بۆ وەرگرتنی ئەو خوێندنەوەیەهەیە، منیش هەروەها، گەنجینەیەکی تایبەتی وێنەیی خۆم هەبوو، سیخناخ بوو بەحاڵ تێدا جێیان دەبووەوە . بۆیە دەبوو هەندێک بەتاڵی بکەمەوە. هەندێکیان دەچۆڕانە سەر زەویەکەو دەبینران کە بە کورت تیشک دەمرن. خوێندنەوە وێنەی نوێی دەهێنایە ئاراوە، کەڵەکە دەبوون، بەیەکەوە دەنووسان، تێکەلڕ دەبوون، پاشان : خۆرەکە ،کەنارەکە، ئارەقە، خوێن، جەستە بەگوللە کونکراوەکان، دەریاکە و منیش کە(لەدەرگای کوێرەوەربی) دەدەم ، لەیەکتری دەشاردەوە. وەکو بیرێکی وشەی لە بێژنگدراو وابووم، بەرامبەر بەتاریکی وەستابووم. لەجێگایەکدا نەدەمامەوە، خوێندنەوە و دووبارە خوێندنەوە بەس نەبوون. دەبوو دامبهێنایە، دووبارە چیرۆکم دابنایەتەوە، بۆ ئەوەی لەگەلڕ دوورەپەرێزیەکەماندا یەکبگرنەوە.**

(نامۆ) رۆمانێکی نموونەیی بوو بۆ مەشقێکی ئاوها. ئەگەر پێویستی زادەی ململانێکمان نەبووایە دژ بەتێکشکا نی قەوارەمان. ئەگینا رۆژێک چیە جورئەتی ئەوەم نەکردوە دەستکاریی ئەم رۆمانە بکەم، بەئارەزووی خۆم لەگەڵ(کامۆ) دا هەڵس و کەوتم دەکرد، حیکایەتی( مێرسۆ)م دووبارە دادەهێنایەوە. دەورەکانم هەڵدەگێرایەوە: ریمۆ و ماسۆن و میرسۆ بەبێ گوێدان دەچن بەلای نای ژەنینەوە، لەیەکشەممەیەکی هاویندا، کاتێک عەرەبە کۆچەریەکان شەڕیان پێ دەفرۆشن، هەمان ئەو خۆرەیەو هەمان ئەو رووناکیەشە و بەتایبەتیش هەمان بێهوودەییە، وەکو لەرۆمانەکەدایە ، بەتەنها ناوە فەرەنسیەکان دێت، بەڵام ئەوانی دیکە، عەرەبەکان، بەتایبەتی ئەوەی چوار فیشەک دەنێ بە(میرسۆ) وە، ناویان نیە، دەسبەجێ هەستم کرد کە رۆمانەکەی(کامۆ) هیچ گۆڕانێک قبووڵ ناکات، دووبارە ئاسایی خوێندمەوە تا لەبەر ماندوویی دەسەپاچە بووم ئەو گوزارشتانە بخوێنمەوە کە لەسەرمدا تەراتێنیان دەکرد. وەک بڵێی تەمێک بەری دەگرێت. ئەوە بوو بە برادەرەکانم راگەیاند کە بەشێوەیەکی کاتی لەخوێندنەوە بوومەوە. ئەو دەمەیش وەکو غەڵبە غەڵبێکی کز دەهاتە گوێم، گوێم لێ بوو کە یەکێکیان گوزارشتە سەرەتاییەکانی کتێبەکە دەڵێتەوە:(ئەمڕۆ دایکم مرد، یان لەوانەیە دوێنێ، نازانم، لە داڵدەکەوە بروسکەیەکم بۆ هات:(دایکت مرد، سبەینێ بەخاک سپاردنە، سەرەخۆشیت لێ دەکەین). بەڵام ئەمە واتای هیچ نیە. دەشبێ دوێنێ بەخاکیان سپاردبێ). دەنگێکی دیکە بەردەوام بوو:( ئەمڕۆ دەمرم، یان لەوانەیە سبەینێ، دایکم نەبروسکەی بۆ دێت لەتزمامارتەوە و نەسەرەخۆشیەکی گەرمیش. بەڵام ئەمە واتای هیچ ناگەیەنێ. لەوانە ئەوە دوێنێ بووبێت). دەنگێکی دیکە:( ئەوکاتەی کە سەرلەنوێ چوار فیشەکت نا بەتەرمە بێ گیانەکەوە، کونیان کرد بێ ئەوەی هیچ شوێنەوارێکیان لەسەر هەبێ، وەک بڵێی چوار لێدان بوو لەسەر دەرگای کلۆلیی لیدەدرا. کە سەرلەنوێ شتەکان ئاوەدان بکەینەوە وەک بڵێی چاڵەکە گۆڕنەبێت. ئەمیش هەیکەلی تێکۆشانە نەبچڕاوە بەردەوامە سەر سەختەکەمان بوو. خۆمان بدەینە بەدەستەوە نەدەین. نابێ بیرنەکەینەوە نە لەجەلادەکانمان و نەلەنەخشەو وێنەی پێشینی ووردترین ووردەکاریی ئەو رێگایەی کە مەرگ دەیگرێتە بەر، بەهێواشی، زۆر بەهێواشی، تارۆحمان فرمێسک بە فرمێسک دەکێشێ، بۆ ئەوەی ئەشکەنجە بچێتە جەستەوە و ئاگرەکەی لەسەرەخۆ کزبێ تا بەیەکجار دەکوژێتەوە. دەبێ شتەکان بەبیر ئاوەدان بکەینەوە و، دەبێ لە بەشدارکردنی بیرکردنەوە دوورکەوینەوە. دوای ئەو هەموو ساڵانە ترسی خۆم لەرابردووی کۆن لەدەست دابوو، رابردوویەکی زۆر دوور، نامۆ بوولە من، کاتێک بیردەکەمەوە ناترسم لەمردن لەسۆزدا. تەنانەت پێویستم بەسووتاندنی وێنەکان یان رێکخستنیان نەبوو، لە تاقیکردنەوەی فرمێسک بەهێزتر بووم کە دەڕوا بەرەو تونێلێکی دیکە. کە بیرەوەریەکانم خۆم دەبینم دەڵێی بیرەوەریەکانی کەسێکی دیکەن، منیش تەنها غەوارەیەکی گزیر نەبێ چیدی نیم، دەمەوێ سەرلەنوێ رووخساری ئەو کیژە بەدیکەم کە دەزگیرانم بوو، بۆ دۆزینەوەیشی زۆر زەحمەت نابینم، لە کەشێکی هەتاویدا، لەکەناری سوێرە لەسەر کورسیەکی قاچ شکاو دانیشتووە، دەشێ کەسێک یان ئەوە خۆم بم، لەتەمەنی نۆزدەساڵ بووم، بزەی دێت، پاڵ بەقاچی کورسیەکەوە دەنێ بۆ ئەوەی لەنگەری تێکچێ، کیژەکە پێدەکەنێ، ئەویدیکەیش پێدەکەنێ، ماچێکی دەوێ، ئەویدیکە ناوێرێت بەئاشکرا کچەکە ماچ کات، لەسەر مەستەبەیەکی یەکێک لە قاوەخانەکانی کەنارەکە، وێنەگرێکی گەڕیدە بەلایاندا تێ دەپەڕێت، وێنەیەکیان دەگرێت وەدەڵێت:(سبەینێ، هەمان کات، لە هەمان شوێن) کچەکە هەڵدەسێ، ئەویدیکە بەچاو شوێنی دەکەوێت، دەبینێ رووناکیەکە لەسەر قژە درێژەکەی دەبریسکێتەوە، دەترسێت لێی دووردەکەوێتەوە و لەکیسی بچێت، بەدوایدا رادەکات، لەناو قەدی دەگرێت پێکەوە دەکەونە سەر لمەکە، منداڵەکان بەو حاڵەتەیان پێدەکەنن، هەڵدەسنەوە، کچەکە سەیری سەعاتەکەی دەستی دەکات:( دەبێ بڕۆم، باوکم کەبێتەوە بۆ ماڵ لەوێ نەبم پێی خۆش نیە، تاسبەی، هەمان کات و لەهەمان شوێندا). ئەویدیکە خەم دایدەگرێت، بەتەنیا لەسەر لمەکە پیاسە دەکات، خۆرەکە روو لەئاوابوونە.

بەگێڕانەوەی ئەو وێنانە هیچ هەستێک دامناگرێت. لەوانەیە بۆ کات بەسەربردن یارمەتیم بدەن، بەڵام مەبەستم نین. تەنانەت نەمدەتوانی خۆم بناسمەوە لەوێنەی ئەو پیاوە عاشقەدا، لەوەدا دەسەپاچە بووم. لەبەرخۆمەوە دەمووت(لەوانەیە بۆم باشتربآ)، خۆم دەدەمە دەست ئیحاکانی دیکەوە کە ناتوانم بەرامبەریان هیچ بکەم، تەنها کە نامۆیەکی بەتاسەبم بەوەی کە پآی وایە دەیبینآ، حەپەساوە بەوەی کە تاقی دەکاتەوە، کات بەسەربردن! بەرەواڵەت ئەوە ئیش وکارمان بوو، جگە لەوەی کە کاتەکە وشک بوو بوو.

مەسەلەکە دەیخستمە پێکەنینەوە. هیچ واتایەکم لێی نادۆزیەوە، وەکو وەکو وەرزیەک، بووینە گیانەوەرانی وەرزیی، چەند رزمەیەکی پڕ لە وەرزیی، وەرزییەکە بۆنی کەرووی گۆڕستانەکانی لێدێت کاتآ بەرد تەردەبێ. وەرزیی لەدەورمان دەخولایەوە، پێڵوەکانمانی دەکرۆشت، پێستەکانمانی لۆچ دەکردو دەچەقیە هەناومانەوە. دەمزانی کە بیرەوەریە بەنرخەکانم خەریکن کۆچ دەکەن، بگرە کۆچیان کرد بەرەو ئاقارێکی دیکەی شەو، لەوانەیە چاوەڕێی دەرچوونم بن لە چاڵەکە بۆ ئەوەی بێنەوە جێگاکەی خۆیان. ئێستایش دوورکەوتنەوە، وەلانرام، بە بینینیان سەر لەنوآ ئازارم نادەن، گرنگ ئەوەیە سوورنەبم لەسەریان، لەوحاڵەی کەتیدام گاڵتەم پآ نەکەن، خۆم بەو پەراوێزە سادەیەی ئازادیی بەهێزدەکرد، رێگەم بەخۆم دەدا کە گەمەیان پآ بکەم و، تەنانەت پێشی پەرەسەندنی رووداوەکانیش بکەوم. دەزگیرانەکەم وازی لەوە هێنابوو کە دەزگیرانم بێت، مافی ئەوەم نەبوو لەماڵەوە بەندی بکەم، بۆیە ئازادم کرد، چۆن بزانآ من ئەوەم کردوە؟

چونکە بڕوای چەسپاوم لەلا لە دایک ببوو، کە ئێمە لەدیدی خانەوادەو کەسوکارمان لەریزی مردووان بووین، تەنها دایکم لەسەر تەمای خۆی جێگیربوو، کە بۆ ئەوەی بە زیندوویی بمبینێ . دایک لەمەسەلەی ژیانی کوڕەکەی یان مردنی هەڵە ناکات. دواجار پێم دەگات کە کەسانێکی نەناسراو لەدەرگاکەیان داوە و بەرووخساری خەماوی درۆنانەوە و بەدەنگی نزم وەکو هەواڵێکی دڵسۆزانەی بدەنآ پآی دەڵێن:(کوڕەکەت مردووە، ماوەی دوومانگە لەسێدارە دراوە، بەستیان بە درەختێکەوە و هەردوو چاویان بەستەوە، پاشان دەستەیەک لەسەربازگوللە بارانیان کرد. خانمەکەم تۆ دەزانی ئێمە سەرپشک نەکراوین کە مەسەلەکەت پآ راگەیەنین، بەڵام هەمووومان موسڵمانین، لەسەرمانە دڵدانەوە بکەین. (إنالله وانا إليه راجعون). دەرۆن و پاڵتۆ قاوەییەکانیان داوە بەشانیانەوە، بەرلەوەی بۆی بڕەخسێت کە هەر پرسیارێک بێت لێیان بکات. کەسانی دیکە چوون بۆلای بۆ ئەوەی پێچەوانەی ئەوەی بۆ دووپات بکەنەوە. بەخۆشی و رووخۆشیەوە:(کوڕەکەت زیندووە و تەندروستە، ئەو لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی دیکەدا چیا رۆدەنێن، ئەمەیش نهێنی کت وپڕیەکەیە، وریابە بیشارەوە). خۆشبەختانە دایکیشم بڕوای بەهیچ نەدەکرد تەنها بەحیدسی تایبەتی خۆی نەبێت. نیشانەکانم لەوەوە بۆ دەهات، حیدس، دەمزانی ئەو کەدەزانآ. دەزگیرانەکەم هێندە نەیدەناسیم کەوای لێبکات هەر بەزەیین پەیوەندبێت پێمەوە. دوای شۆکی بەندیخانەی(قونەیتەرە) دووجار هات سەردانی کردم، هەستم کرد ئایندەی لەگەڵ مندا نابێت، گریا. فرمێسکی ماڵئاوایی رشت، پاشان بۆ دواجار بەنیگایەک سەیری کردم، ئەونیگایەی کە تەماشای نەخۆشی پێدەکرێت لەسەرەمەرگدا . زۆر لەسەروچاوم راماو فرمێسک بەرووومەتەکانیدا دەهاتە خوارآ، پاشان وەچەرخاوو بەهەنگاوی چەسپاوەو خێراوە رۆیشت. هەموو هەستێکی ئێش وپەشیمانیم لەخۆم حەرام کردبوو، ئەو هەمووەی کە پێش دەی ئەیلوولی 1971 ژیابووم نابآ حیساب بکرێت و، ناشبآ خەریکم بکات یان بواری زیندانەکەم داگیربکات...

لەگەڵ رۆیشتنی کاتدا، دەروونم ئاسوودە دەبوو، لەوەیش گرنگتر خۆی قایم کردبوو بەرامبەر ئەوەی کە باوەزی رابردوو هەڵیگرتبوو، ئیدی توانای گەمەکردن و تەنانەت خۆشیشم هەبوو، رۆژانێکم بەسەربرد کە هەوڵم دەدا مێردێک

بۆ دەزگیرانەکەم بدۆزمەوە، دەمویست بالاّ بەرزبێت، وەکو بالاّی خۆم بەلانی کەمەوە لەسەرەتای دەستگیرکردنمدا، قژزەرد بێ، لەمن جیاوازتر بێ، بۆنا: تەنانەت ئەوروپیش بێت، رۆشنبیرو مامۆستای ئەدەب یان هونەرمەندبآ، حەزم لێ بوو ژیانێکی درەوشاوەی بۆ دابین بکەم، پیاوێک کە بتوانآ هەمووشتێکی بۆ دابین کات، کەمن نەمدەتوانی بۆی دابین بکەم، پیاوێک لەسەفەرەکانیدا لەگەلڕ خۆیدا بیبات بۆ گریکستان، بۆ ئیتالّیا، بۆ ئەندەلووس، بیبات بۆ(برادۆ) لەمەدرید و(لۆڤەر) لەپاریس و کتێبی بەدیاری بداتآ و پێکەوە لەسەر جێگابیانخوێننەوە، پیاوێک کە لەگەڵیدا شانۆ و مۆسیقای کلاسی دەناسآ، دەیکاتە ژنە مەغرببییەکی جیاواز لەژنانی دیکە، وای لێدەکات خەون ببینآ و چیرۆکەکەمانی لەبیربچێتەوە. منیش، دەبآ وازبێنم لەبیرکردنەوە لەو سەردەمەی ژیانم، بەچ هەقێک مێردی بۆ دەدۆزمەوە؟

لەوانەیە دۆزیبێتەوە و ئێستا بەتەبایی تەواو لەمەراکیش یان لە دارول بەیزا لەگەڵیدا دەژی، لەوانەیە زۆرجاریش ببێتە شەڕیان، لەگەرمەی بەدبەختیەکەیدا منی بیربکەوێنەوە بیری دەکەوینەوە؟ نەخێر، تکام وایە بیری نەکەومەوە هەرگیز. ناشبآ بیربکەمەوە، نەک لەجوانی و رووژاوی زیندەوەرەکان و شتەکان و، نەخۆشی شەوانی هاوین، و نە لە شەفافیەتی خەونێ کە چاوی نیوە خەوتووی ساوا راژەنێت. بێدەنگ بووم، بڕوام وابوو کە بوومەتە کتێبێک و کەس نایکاتەوە.

(22)

هیچمان لەبارەی (سەبان)ەوە نەدەزانی کە لەسەرەتای هەشتاکاندا ختسایەنە ریزی گروپەکەمانەوە، پاسەوانەکان پێشی خۆیانیان دابوو لەکاتی نیوەرۆژەدا، پیاوێکی کەتە بوو، بالاّ بەرز، رەشتاڵە، قژی رووتابووەوە تالّەموویەکی پێوە نەبوو.

بێدەنگ بوو، وەلاّمی نادایەوە ئەگەر کەسێک بانگی کردبایە، وەلاّمی هیچ پرسیارێکی نەدەدایەوە، بۆ بەیانی رۆژی دواتر رایانسپاردم کەبۆی باس بکەم بەرۆژ چۆن کاتی خۆمان بەسەر دەبەین و، ئەوینەما کەمانەی کە بەسەر خۆماندا دابەشمان کردوون. چەندجارێک ناویم لێ پرسی وەلاّمی نەدایەوە، دوای تۆزێک وتی:( سەبان، بانگم کە سەبان).

- لەکوێوە هاتووی؟

بێدەنگ بوو.

- تۆ بۆ لێرەی؟

بێدەنگ بوو..

" سەبان گوێم لێ بگرە، ئێمە لێرە رێک وپێکین، دەبآ پێت بڵێم چۆن لێرەکات بەسەردەبەین. لەکاتی بەیانیدا قورئان دەخوێنین و گێڕانەوەی چیرۆکیشی تیا دەکەوێت، رۆژی هەفتەیەکیش عومەر باسی پاریسمان بۆ دەکات. کاتێ تەمەنی ببووە بیست سالڕ مانگێگ لێی ژیابوو. بەلاّم دوای نیوەڕۆ تەرخانە بۆ گفتوگۆی بەکۆمەلڕ، نزیکەی ماوەی مانگێکیشە

مەسەلەی کۆلۆنیالی باس دەکەین. ئەوپەڕی ئازادیشی کە لەم چالاکیانە بەشداربی یان بەشدارنەبی. گرنگ ئاگربەستی شەوانەیە. دوای شێوان، دەبآ بێدەنگ بین بۆ ئەوەی ئیسراحەت بکەین، بەلآ، تەنانەت لێرەیش، پێویستمان بەحەسانەوەیە. ئەو دیوارانەی نێوان زیندانەکانمان زۆر تەنکن. هەموو شتێکیان لێوە دەبیسترێت، نالەو مرخە مرخ، ئەگەر لەسەر ئەم بەرنامەیە رازیت، بلێ رازیم، یان ئەگەر ناتەوآ قسە بکەیت، دووجار بدە لەدەرگای زیندانەکەی خۆت". هەرکە دووجار گوێم لە لێدانی دەرگابوو، هەناسەیەکم هەڵکێشا، شەوی بەراهێنانی جەستەوە بەسەربرد، لەکاتی راهێنانی جەزبیدا مەحالڕ بوو کە گوێمان لەهاڕەی هەناسە بەهێزەکەی نەبێت. بەرۆژ دەنووست، هەندێکمان هەوڵی دەدا کەبیهێنێتە قسە، وەلێ بێهوودە بوو، دوای تێپەڕبوونی دوومانگ ، دوای زەحمەتێکی زۆر، روخستەم وەرگرت کە چاوم پآی بکەوێت. ئەو پاسەوانەی کە هەڵوێستەکەم بۆی باسکرد بەمەسەلەیەکی فزووڵیانە بۆ زانینی نهێنی کابراکە، تا ئەویش پێی وتم: " هەموو ئەوەی کە دەیزانم ئەو لە گاردی پاشایەتی بووە، دەبآ گوناهێکی گەورەی کردبآ بۆ ئەوەی بگاتە ئەم شوێنە، لەوانەیە رەفتاری خراپی کردبێت لەگەلڕ کچە شازادەکاندا.. بڕۆ و هەوڵدە بزانی". پێش نیوەڕۆ ماوەیەکی زۆرم بەدەستەوە بوو بۆ ئەوەی قسەی لەگەڵدا بکەم، کاتآ پاسەوانەکە دەرگاکەی کردەوە و تیشکی لایتەکەی خستە سەری، یەکسەر سەرنجم دا کە تووشی گرانەتا بووە، لێوەکانی تەتەڵە دەکەن و ئارەقە لەناوچەوانی دێتە خوارەوە، نەمویست ئەو پرسیارانەی کە کاتی گەیشتنی لێم کرد دووبارەیان بکەمەوە، دوای رۆیشتنی پاسەوانەکە بەهەندآ گوزارشت وورتە وورتی لێوەهات. دەستی راستی لەپشتی بوو کاتآ بەفرەنسیەکی کرچ وکالڕ قسەی لەگەڵدا کردم و وتی:"حەزم لەوەرزشە. لێرە کاتی زۆرم لەبەر دەستە تا وەرزش بکەم."

- ئایا تۆ لەریزی گاردی پاشایەتی بوو؟

- نازانم.

- چیت لەپشتت شاردوەتەوە؟

- هیچ، ئەگەریش، هیچ..

- بۆچی دەستت ختسووەتە پشتت؟

- بەبی هۆ. ئەگەریش..

- کەواتە، لێم گەڕی بابیبینم، دەتوانم بیبینم.

دوای تۆزێک، وەرچەخا بآ ئەوەی لەشوێنەکەی بجوولآ وتی:

- تەماشاکە.

- ببوورە، بەلآم لێرە، ئێمە رووناکی نابینین، پێشنیاز دەکەم کە چاوەڕێی پاسەوانەکە بیت تا زیندانەکە بەلایتەکەی رووناک بکاتەوە، بەلآم ئێستا پێم بلێ ئەوە چیە؟

**پێی وتم،**

- **ئازارێکی توندم هەیە.**

- **لەکەیەوە؟**

- **ئۆف، لەسەرەتای هەفتەی دووەهەمی هاتنمەوە.**

**کاتێک پاسەوانەکە هات بۆ ئەوەی بمبات، کاتێ تیشکی لایتەکەی دا لەپشتی( سەبان) بینیم باڵی شکاوە ئێسقانی ئانیشکی لە گۆشتەکەی هاتبووە دەرەوە کە تووشی گەنگرینە ببوو. سەرلەنوێ وەرچەرخایەوە و لەبەرامبەر دەرگاکەدا بەدانیشتنەوە مایەوە. پاسەوانەکە لێی پرسی..**

- **بەڕای تۆ چەند دەمێنێ؟**

- **نازانم، مەگەر سیسرکە بیخوات بەرلەوەی گەنگەرینەکە بەلەشیدا بلێوبێتەوە. ئەمەش روویدا، هەزاران سیسرک ومێرووی دیکە لەزیندانەکانی ئێمە رۆیشتبوون وخواردیان. پاسەوانەکان دەترسان دەرگای زیندانیەکەی بکەنەوە، لێیان دەپرسی ئەگەر هێشتا زیندوویە، گوێت لەلێدانیک یان دووان دەبێت لەدەرگاکە، بەرۆژ بۆنی مەرگ لەدەوری زیندانەکاندا دەسوڕایەوە. لەشەودا بایەقوش بەخوێندنە شوومەکەی دەچریکێنێ، کە مژدەی ئەجەلێکی نزیک بوو، ئایە بایەقوشە یان کونە پەپو، ڕێگایەک نییە بزانین چۆن؟ بەگوێرەی وەخت فێربوین کە نەخۆشەکە دوای بەسەرچوونی پانزە رۆژ بەسەر بیستنی ئەودەنگە شوومە دەمرێت.**

**لەسەرەتادا گوێمان بەمەسەلەکە نەدەدا. بەڵام کەریم یەکەم کەس بوو کەسەرنجی ئەوەیدا. چەند جارێک بانگی( سەبان) م کرد:**

- **ئەگەر گوێت لێمە، شتێ بڵێ یان بدە لەدەرگا.**

**دوای سەعاتێک تێگەیشتم کەمردوە. بۆ رۆژی دواتر پاسەوانەکان دەرگای زیندانەکەیان کردەوە و تیشکیان خستەسەر، بەڵام بەتوندی دەرگاکەیان پێوەدا و خێرا بۆی دەرچوون و کەفیان دەچاند، لەکاتی پاڵەپەستۆیان بۆ دوورکەوتنە لەوشوێنە ، یەکێکیان مەنجەڵە قاوەکەی لێکەوتە خوارەوە. دوای نیوەڕۆ هاتنەوە و بەدەمامک سەروچاوی خۆیان داپۆشی بوو و دەسکێشیان کردبووە دەستیان. دەترسان دەستی لێ بدەن و پێشنیازیان کرد کە دەرگاکەی خۆمیان بۆ بکەمەوە تا یارمەتیان بدەم. گەنگەرینە بە خێرایی بەتەواوی جەستەیدا بلێوبووەوە، سەرنجم دا کرم لەهەردوو پاژنەی دەهاتە دەرێ، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەسیسرکە لێی کۆببوونەوە ودەرکردنیان زەحمەت بوو ، بە زەحمەت لاشەکەم هەڵگرت وخستمە ناو توورەکەیەکی پلاستیکە. دەبوو دەست و برد ئەو هەزاران سیسرکە لەنابرایە، یەکێک لە پاسەوانەکان بۆدرەیەکی ژەهراوی هێنا کە سوپا بۆ لەناوبردنی کوللە بەکاریدەهێنێ. بۆ درەیەکی ژەهری زۆر خەتەرناک بوو، ناچاربووم کە دەمامک و دەسکێش بەکاربهێنم. لەچەند خولەکێکدا سیسرکەکان بەربوونەوە سەر زەوی، وەکو هێشوو بەتۆپەڵێ بەردەبوونەوە. پاشان پاسەوانەکە عارەبانەیەک و خاکە نازێکی هێنا بۆ هەڵگرتنیان لەزەویەکە. مەرگی( سەبان) لەسیسرکەی رزگارکردین. بەڵام من گوێلێک لەو بۆدرەیەم هەڵگرت دەمپرژاند بە بەردەرکەی زیندانەکاندا. پاسەوانەکان ئاگاداری کردمەوە کە ئەوە سەرپێچی کردنی ئەمانەتە. "ئەگەر نەیانکوژێن**

**لەچەند رۆژێکدا دەمانخۆن، بەهەرحالڕ، دەبآ مردن لێرەدا کاتێک بخایەنێت بەمەش ئەمانەتەکە تێکدەدەم، وەلێ لەگەلڕ خۆمدا تەبام، بامردن بێت، بەڵام بە قوومی بچووک. "**

- **وەکو قوماندار قسە دەکەیت.**

**بەڵا، شێوازو تەکنیکەکەم وەرگرت، بۆ یەکەمجاریش پاسەوانەکە سڵاوی بۆ سەندمەوە. هەر گروپێک دووچاری ئەوە دەبآ کە خەڵکانی خراپیان تیا بئاخنن. لەقوتابخانە لەدەستەکەی ئێمەدا سآ کەس تیابوو: هەوالگرێک و ترسنۆکێک و وەرزکەرێکی تیابوو. ئاسایشە کە یەکێک لەم سیانە لە گرتووخانە لەگەڵماندا بێت. لەکەسایەتی هەر مرۆڤێکدا برێک لەبازاڕیەتی تێدایە. کەسایەتی(عەشار) نموونەی بازاڕیەتیەک بوو کە رادەی تەحەمموولکردنی رەت کردبوو، زیندەوەرێک بوو لە لێواری سروشتی ئاژەڵیدا بوو، وەک بلێی ئاژەڵێک بوو لاسایی رەوشتی ئادەمیزادی دەکردەوە. (عەشار) بەس بەتەنها بازاڕیی نەبوو، بگرە نامەردیش بوو، بێزم لێی دەهاتەوە، بەڵام، دواجار ئاگام لەهەستی خۆم هەبوو: عەشار شایەنی ئەوە نەبوو کە بەرامبەری هیچ هەستێک دەربڕم. بۆیە راهاتم کە بەرامبەری خۆم لێی تێنەگەیەنم، لەکاتی پێویست دا خۆمی تیاهەڵقوورتێنم، بۆیە خۆ لێ تێنەگەیاند واتای دیارنەبوونی هەست نیە، بگرە رەتکردنەوەیەتی. (عەشار) بێزارکەربوو، هیچ سنوورێکی نەبوو، لەئێمە گەورەتر بوو، پلەی رەقیبی یەکەمی هەبوو، نەخوێنەوار بوو، بازاڕیی بوو، دڕبوو، شانازیی بە دڕیەتی خۆیەوە دەکرد. لەهیندی چینی سەربازبوو، بیرەوەریەکانی ئەو سەردەمەی هەڵگرتبوو، دروستی دەکردن یان بازرگانی پێوە دەکرد. بەلای ئەوەوە ڤێتنامیەکان "چینیەکان" بوون، کاتآ دەربارەیان قسەی دەکرد، زاراوەی سووکایەتی و رەگەز پەرستانەی بەکاردەهێنا. هەرکە خۆی بینیەوە لەهەوڵدانی کۆدەتای سەربازی بەرێکەوت تێوەگلاوە. ئەو کاتە بەدزیەوە سواری یەکێک لەو سەیارانە دەبآ کە بەرەو(هرمومو) دەرۆیشتن، بەرێکەوتنی ئەو سەیارانەی بەهەل زانی، بۆ ئەوەی ناخۆشیەک لەگەلڕ کوڕە مامەکەیدا یەکلابکاتەوە کە دووکانێکی رۆنفرۆشی هەبوو لە(ریبات). گەیشینە ئەوەی دوای بەماوەیەکی کورت لەدەستگیرکردنمان، کە ئەو لەساڵانی یەکەمی بەندکردنەکەیدا کە ئەو نەعلەتی دادەباراند بەسەر کوڕە مامەکەیدا، بەیانی و ئێوارە، ئاواتی مردنێکی ترسناکی بۆی دەخواست. "خوایە ببێتە ژێر تانکەوە هەناوی رژاوی بەدەستەکانی خۆت کۆکەیتەوە و مردنەکەی بەهێواشی بێت".**

**یان:"خودا تووشی گرانەتات بکات، گرانەتای هیندی چینی کە ئەقلڕ تێکدەدات، تا دەستەکانت پەنجە پەنجە دەخۆیت".**

**(عەشار) کەسێکی بەدبوو، لەرێگەی ئەوەوە بەخیلی و غیرەم دۆزیەوە. کە دوو نەخۆشی باون لەژیانی ئاساییدا، بەڵام بەر لە ئەو لەگرتووخانەکەماندا جێگەیان نەبووە، لەگەلڕ ئەوەشدا(عەشار) توانی بیانهێنێتەژوورەوە و لێیان گەڕا گەشە بکەن و ژەهری خۆیان بلێوبکەنەوە بەنێو ووردەکاریەکانی ژیانە کلۆڵەکەماندا. زیندانەکەی بەرامبەری زیندانەکەم بوو، ئیشی ئەوە بوو کە کەشی دەمەتەقآی چەندین لە گرتووەکان تێک بدات، یان شەوان بە بلّمە بلّم و ملّچە ملّچە بەسەر بەرێت بۆ ئەوەی تووڕەمان بکات، هیچ رێگایەکمان نەبوو بۆ کارکردنەسەری. هەستم کرد چارەی ئەوەیە کە قبووڵی بکەین و بەشداری بکەین لەهەرشتێک کە دەیکەین، سەرەڕای ئەوەی کە کابرایەکی نەخوێندەواریشەو، سووربووم لەسەر ئەوەی کە قورئانی پآ بخوێنم و واز لەوگروپە بهێنم کە بەخێرایی پێشکەوتن لە لەبەرکردنی کتێبە ئازیزەکە، دەیووت:**

"بۆچی ئێوە نەک من؟ منیش مرۆڤم و، موسڵمانێکی ساڵحم و پیاوێکی دنیا دیتەم و، چینیەکان لەبیریان کە من کێم". زۆر بەزەحمەت دەیتوانی ووردبێت، بەتایبەتی لەووتنی وشەکاندا وەکو پێویست. چونکە دەبوو وشەکان بچڕ بچڕکات و، بیانکاتە بڕگەی لەفزی یەک لەدوای یەک، لەدوای منەوە دەیووتەوە، پاشان هاواری بەرزدەبووەوە، رقی خۆی بەرامبەر قورئان و ئیسلام ئاشکرا دەکرد.. ناچار دەبووم سزای بدەم، نابآ قسەی لەگەڵر بکەم تا داوای لێبوردنم لێنەکات، داوای لێبکەم کە نوێژ بکات، هەستم کرد کە قیژاندنەکەی دەربڕین بوو لە دڵتەنگیەی بەرامبەر نەزانینەکەی خۆی. لەماوەی مانگێک توانی بەبآ هەڵە سوورەتی فاتیحە بخوێنێتەوە، ئارەزوویەکی راستگۆیانەی هەبوو کەبێتەریزی کۆمەڵەکەوە وەکو ئەوانی دیکە وابآ، ببێتە یەکێک لەتاکەکانی، بەڵام نەیدەتوانی کۆنترۆڵی هەستی غیرەی خۆی بکات. ئەو رۆژەی کە پاسەوانەکە روخسەتی دامێ سەردانی( سەبان) بکەم، زۆر توورەبوو: " بۆ پاسەوانەکە لەگەڵر تۆ قسەدەکات، بۆ تۆ هەڵدەبژێرآ نەک من؟ من بە تەمەن لەتۆ گەورەترم، لەتۆ لەپێشترم. تۆ چی دەکەیت تا لەناو ئێمەدا لەبەرچاوبیت؟ ها؟ پێم بلێ؟ وەڵامم بدەرەوە، من لەجەنگاوەر دێرینەکانی هیندی چینیم، چینیەکان من دەیانناسم. تۆ وەکو ئەوان وای، قسەناکەیت. تۆ بنبڕی. هەموو شتێک لەلای تۆ'بەنهێنیە". بەهیچ وەڵامم نەدەدایەوە، بگرە لێدەگەڕام بۆ رق وکینەی خۆی، لەکۆتایی رۆژدا پێی دەوتم:

- چیە ئەگەر هەندآ لەسوورەتی(بەقەرە) بخوێنینەوە؟

- نەک ئەمشەو، بگرە سبەینآ ئەوە دەکەین. ئێستا کاتی بێدەنگیە. بێدەنگ بەو هەوڵدە بەپێی شێوەی هەناسەدانی خۆت بیربکەرەوە، فێربە کە بێدەنگیت بۆ قووت بدرێت. لەبەرخۆتە بڵێرەوە کە بێدەنگیی بۆ خۆت و بۆ ئەوانی دیکەیش ئیسراحەتە. مەسەلەیەکی کارایە بۆ ئێمە کە بێدەنگیی بچێژین، بێدەنگی دەبێتە قەرەبووکردنەوەی ئەو رووناکیەی کە لەدەستی دەدەین.

- باشە، ئایا لێم توورە نیت؟ ئایا پێم دەڵای کە( سەبان) چی پآ ووتیت؟ ئەو مرد، قەیناکە ئەگەریش قسەبکەیت، بەڵێنم دەدەیتآ، ها، ئەی ئاغای(بنبڕ)؟.

- عەشار دەمت داخە، ئەگینا سبەینآ لە قورئان بآ بەشت دەکەم.

بێدەنگ دەبوو، بەڵام بەرلەوەی بخەوێت بۆڵە بۆڵی دەکرد و، هەندآ جاریش بەدەنگی بەرز خەونی دەبینی. بەهاوار و قسە تێکەڵ و پێکەڵەکانی بەئاگای دەهێنامەوە. بەڵام کاتآ بەیانی لێم دەپرسی بەژیانی دایکی سوێندی دەخوارد کە ئەوە کەسێکی دیکە بوو وایکردووە. رۆژێکیان پاسەوانەکە لەنانخواردن بێبەشی کرد، ئیدی جڵەوی بۆ نارەزایی خۆی شل کرد و، دەیووت کە ئەو مەسەلەیە لەتەگبیری منە، هەر چەندآ بۆم باسکردبایە کە مەسەلەکە پەیوەندی بەمنەوە نیە، تادەهات هاوارکردنەکەی توندتر دەبوو، جنێوی بەهەمووان دەدا، نۆرەکەی بەدوعاکردن لەمن کۆتایی دەهات بەوەی کە چاوی شەڕەنگێز بمگرێتەوە.

بەڵام لەوشوێنەی کە لێی بووین نەشوومی هەبوو نەچاوی شەڕەنگێزو نەجادوگەریی ونە جادو و نەتەڵەسم کە بتوانن ئازارمان بدەن. هەرکە پاسەوانەکە هات بۆ رۆژی دواتر، بەشە خۆراکەکەی بۆ هێنا، لێی پرسی ئایا خواردنەکە چەوریی تێدایە..؟

پاسەوانەکە وەڵامی دایەوە:

- **بەشی تۆ چەوری تیایە.**

**ئەگەر ئەو میزاجە خراپ و کەللەرەقیەی نەبووایە، ئەگینا(عەشار) زیندانیەکی ئاسایی بوو، ئەزموونی هاوبەشی فێری کردبووم ، کە تەنانەت هەستی بەدخووییش دەکرآ تەحەمموول بکرێت، لەو چاڵەی کە تێی فرێدرابووین و بە ئەوەی کەرو لێمان بدات.**

(23)

**ئێوارەیەکیان، کاتآ نوێژم دەکرد، نوێژی فەرزی ئەو رۆژە نەبوو، بگرە ئەو نوێژەی کە کاتی ئازادبوونم نەمکردبوو، بولبولی مەراکیش سەردانی کردم، چۆلەکەی مندالّیم، کەناومان نابوو(سیبیبت) یان(لە فەقیرە) چۆلەکەی پیرۆز، دواجار زانیم ئەو چۆلەکەیە ناوی شەرشوری کلکداربوو، پەرەکانی سەرومل و سنگی رەنگیان خۆڵەمێشیەکی رێک و پێک بوو، بەلاّم ئەوەی مابوونەوە بازیان قاوەیی بوون، ماوەیەک وامزانی دارکونکەرەیە هێندە خوێندنەکانیان لەیەک دەچوو، بەلاّم دڵنیا نەبووم لەوە، بۆیە بەخەملاّندنی ناوەکەی و رەنگی پەرەکەی بەفەرەنسی دڵی خۆم دەدایەوە، لەکونێکی هەوا گۆرین نیشتەوە، بۆ ماوە چارەکە سەعاتێک یان زیاتر خوێندی، بێگومان ووردە نانی تەرکراوم پێی دەدا، هەر کە لەخواردنی ووردکە نانەکە بووەوە دەستی کردەوە بەخوێندن پاشان رۆیشت. دەبآ لەسەر درەختێکی نزیک هێلانەی کردبێت. هەرکە گەرایەوە لەسەر کونە سەرەکیەکە نیشتەوە و دەستی کرد بەخویندن، دۆخی چاودێردی وەرگرت و خوێندنەکەی دەگۆری ئەگەر هەستی بەجووڵانەوەیەک بکردایە لەدەوروبەری گرتووخانەکە.**

**بەو جۆرە پێشەکی بەهاتنی پاسەوانەکانمان دەزانی بەپێی گۆرینی جریوە جریوی(سیبیبت).. ئێستاش جریوە جریوە جۆراو جۆرەکانیم لەیادە، فێربووم کە بەخێرایی جیاوازیی نێوانیان بکەم. رۆژێکیان بەریتمێکی پەلە و بچربچر دەیخوێند، نەمدەزانی ئەو ریتمە دەربرین لەچی بوو.(سیبیبیت) لە باران بارین ئاگاداری دەکردینەوە. هیچمان دەربارەی بارودۆخی ئاسمان نەدەزانی. بەلاّم لەسایەی ئەو بولبولەوە بارودۆخی کەشمان دەزانی. هەر ئەو بوو ئاگاداری کردینەوە لەهەڵکردنی زریانی خۆلاّوی بەو نزیکانە، لەشێوازی خوێندنەکەی دەمانزانی، کە شتێک لەدەرەوە روودەدات. لەگەلر کات و شارەزاییدا هێما جۆراو جۆرەکانی جریوە جریوەکانی شارەزا بووم. پاسەوانەکان سەریان سوورِدەما کاتآ دەمانووت:"ئای لەم بارانە" یان :"دەنگوباسی زریانەکە چیە؟". لەبەرکردنی ئەو جیاوازیە وردانە لەمێشکمدا چەند مانگێکی خایاند، بۆ نموونە هەرکە جۆری خوێندنی بەیانی بگۆرِیایە دەمزانی کەیەکێک لەپاسەوانەکان بەمۆڵەت لەگرتووخانەکە رۆیشتووە. رۆژێکیان، توانجێکم دا لە مەسەلەکە کاتآ لەگەلر ئەو دوو پاسەوانەی کە لەخزمەت بوون.**

- **بۆچی ئەویتر مۆڵەتی وەرگرت و ئێوەنا؟**

- **چۆن ئەوە دەزانی**

- **دەزانم و هەروا..**

**وایانزانی ئێمە لە جنۆکەین، خەڵکانێکین نابآ تێکەڵمان بن، چونکە داروەستەی ئەهریمەنین."سیبیبت" بووە هاودەمی تەنیاییم و برادەرم، هەرکە لەسەر چەپەری کونی باکێشەکە دەنیشێتەوە لە زیندانەکەمدا، یەکسەر هەست بەبوونی دەکەم، سەرەرای تاریکیەکە ، بەدەنگی نزم قسەم لەگەڵدا دەکرد، چونکە حەزم لێ نەبوو غیرەی(عەشار) بورووژێنم**

**و، بەردەوام دەبووم لەگێڕانەوەی ئەوەی بەرۆژکردومە، داوام لێکرد کە کاتی نوێژکردن نەیەت، سەیر لەوەشدایە بۆ ئەوەی بێتەژوورەوەی زیندانەکە چاوەڕێی دەکرد تا لەنوێژ دەبوومەوە، هەرکە گوێی لە " ئەلسەلام و عەلەیکوم" بووایە، دەستی دەکرد بەجریوە جریو، چونکە هەستی دەکرد نوێژم تەواوکردووەو بایەخی پێ دەدەم. رۆژێکیان(عەشار)ی بەخێڵ بردوو، وتی:**

**- چیرۆکی ئەم چۆلەکەیە چیە؟ بۆچی سەردانی تۆدەکات وسەردانی من ناکات؟ تۆ مەشقت پێیکردوە بۆ ئەوەی بۆ من نەخوێنی، بۆچی ئەم رِقە؟ بۆچی ئەم نامەردیە؟ منیش شایەنی ئەوەم کە شالوورەکە بخوێنێ بۆ رۆژە دارِزاوەکانم، پێویستم بەچۆلەکەیەکی گواویە ببێتە هاودەمی تەنیاییەکەم و بەدبەختیەکەم. چی دەرخوارد دەدەیت تا بۆلای خۆتی راکێشیت؟ پێم بلێ چی دەکەیت؟**

**وتم (عەشار( هێمن بە، ئەم چۆلەکەیە نیشانەیەکە لەخوداوە. ئەمە پەیامبەری داوایە، بۆ من کە ئیمانی خۆمم بۆ داوا پشتگوێ خستبوو، هەر بەرێکەوت بۆم هات و، لەوانەیە رۆژێک لەزیندانەکەی تۆیش بنیشێتەوە. دڵپیسی مەکە بەرامبەر چۆلەکەیەکی بچووک، هەست ناکەیت ئەم دڵپیسیەی تۆ ناکەسبەچەیە، دەبێ نوێژبکەیت، من لەلای خۆمەوە ئەو رۆژانەی پێشووم ژماردوە کە دەبوو نوێژیان تیا بکەم، لەژماردن نایەن، تەمەنم لەنێوان پانزە و بیست ساڵدا بوو نکووڵی ئیمانی خۆم کردو وازم لە نوێژ هێنا، ئەمرِۆیش بۆ خودا فەرزی نوێژ شەش رۆژی لەمەوبەر دەکەم سەرەڕای نوێژی ئەو رۆژەی تیدام. وەک بڵێی قەرزە، نوێژی دواکەوتوو و بێ ئاگایی و سەرلێ تێکچوونەکانی خۆم دەکەمەوە، هی رۆژانی جاران کۆدەکەمەوە، شانازی بەوەوە ناکەم کە بووم وکاتێ تەمەنم بیست سالْ بوو. بۆیە برِوام بەخودایە و بەمحەمەدو بەعیساو بەمووسا، برِوام بە ئەولەویەتی ئیمانە، برِوام بەئێستایە، بەڵام رابردووم نیە، هەر رۆژێک دەرِوات رۆژێکی مردووە، بێ شوێنەوارە، بێدەنگە، بێ رەنگە. هەموو بەیانیەک سەرلەنوێ لەدایک دەبمەوە، تاخۆم دەبینم وەکو(سیبیبت) چۆلەکەیەکی هەست ناسکم و ناسک و دەم بەهاوار، لەزمانی چۆلەکە زۆر تێدەگەم زیاتر لەزمانی ئادەمیزاد. (سیبیبت) دەمبات و هاوڕێتیم دەکات لە هەڵهاتنمدا بۆ جیهانە رۆحانیەکەم. رۆحسووکی و نەرم و نیانی و خوێندنە خۆشەکەی و، ئەو وردە جیاوازیانەی نێوان جۆرەکانی خوێندنەکەی زۆر یارمەتیم دەدەن، دوای نوێژی شێوان، ئەو دەمەی سەرما پەل و پۆم سڕ دەکات و، ئازار بالْڕ و دەستم ئیفلیج دەکات، ئەو دەمەی هاوارو هانابردن هیچ سوودێکی نیە، خوێندنەکەی(سیبیبت)م بیردەکەوتەوە، بەنادیاریی دەمهێنایەوە بیری خۆم، چەندجارێک بەبیری خۆممدا دەهێنایەوە، بۆ ئەوەی ئازارە کە ئیشی کەمتربووایە، (عەشار) بۆیە شالوورەکە سەردانم دەکات، پەیوەندیەک لەنێوانماندا هەیە، پەیوەندیەک بەتووندو تۆڵی دەزووی ئاورێشم، بەتووندو تۆڵی قژە سەرێک. ئەم پەیوەندیە تاکە شتە کە لەدەرەوە قبووڵی دەکەم، چونکە دەزانم ئەم چۆلەکەیە لەپێناوی مندا خوڵقاوە، بۆم نێردراوە بۆ شەفاعەتی بێئومێدیی یان بەویستەی خودایە، عەشار شەوت باش..ئیدی لەو دەمەوە(عەشار) بەهەموو توانایەکیەوە هەوڵی دەدا بەئاگابێت، داوای لێکردم پێنج نوێژەکەی فێرکەم، زۆر بەشەرمەوە ئەوەی پێ وتم، ئەو ناوی خوای دەهێناو، داوای یارمەتی لێدەکرد، کاتێ دەبووایە بچێتە جەنگێکەوە. لەگەلْڕ ئەوەشدا عەشار رق و کینەو هەڵەشەیەکەی سووک نەبوو..**

(24)

**لەماوەی رابردووی ژیانمدا، نەک خەوم تەنها شێواو بوو، بگرە زۆر کەم خەونم دەبینی، لەمانگەکانی یەکەمی زیندانیەکەمدا خەوم زڕا و خەونەکان لێم تۆران، بەڵام دوای ئەوەی پەیوەندیم بچڕی بەرابردوو و هیواوە ، خەوێکی ئاسایی دەخەوتم جگە لەشەوە زۆر ساردەکان نەبێ دەبووایە بە ئاگابوومایە بۆ ئەوەی رەق نەبمەوە و، خەونەکانم هاتنەوە، شەوەکان پڕبوون لەخەونەکان، هەندێکیان کاریان تێدەکردم و لەبیرمدا هەڵدەکۆڵران، هەندێکیشیان شوێنەواری لەبەردڵیان لەلام بەجێدەهێشت، ئەویش دەگمەن بوو. تاقە زیندانی بووم لەنێوانیاندا کە خەونم بەهەرسآ پێغەمبەرەکەوە دەبینی. لەگەڵ(مووسا)دا دەکەوتمە دەمەتەقێیەکی شێوە سیاسی دوورودرێژەوە، رووبەرووی یەکدی دەوەستاین، ئەو لەسەر عەرشەکەی خۆی و منیش لەسەر زەویەکی تەخت، پێم دەووت نایەکسانی لەنێوان خەڵکدا سەرچاوەی دابەش بوونە. گوێی لێدەگرتم و قسەی نەکرد لەگەڵمدا.**

**یەسووعیش بێدەنگ دەبوو، ماوەماوە دەهاتەلام، هەردوو دەستی پان دەکردەوە، چاوەکانی خەمبار بوون. بەڵام محەمەد سەروچاویم نەدەبینی، بەڵام هەستم بەئامادەگیە درەوشاوەکەی دەکرد. گوێم لەدەنگێکی زوڵاڵ دەبوو، لەدوورەوە دەهات، لەسەرمدا دەنگی دەدایەوە وەکو بڵێی حەکیمێکی پیرەو بەگوێمدا دەچرپێنآ و هەرباسی سەبری دەکرد:**

**ئەی ئەو زیندەوەرەی کە ناخۆشی بەرۆکی گرتوویت**

**بزانەکە سەبر چاکەیەکە لەچاکەکانی ئیمان،**

**بشزانە کە بەخششێکە لەخواوە**

**پێغەمبەر (ئەیووب)ت بیربێتەوە، چ ناخۆشیەکی تووش هات، خوای بەبیرهاتەوە بۆ ئەوەی تەمبآ بێت، پێی دەڵێن لە پیاوچاکانە.**

**ئەی موسڵمان، لەبیرکراونیت سەرەڕای تاریکیی و شورەکان**

**بزانە کە سەبر رێگای رزگاربوون و کلیلەکەیەتی، ئەنجامیش تۆ باش دەزانی کە خودا لەگەڵ بەسەبراندایە.**

**ئەنجامی ئەو خەونانە هەستم بەئاسوودەیی دەکرد، چونکە دڵنیایان دەکردم، خۆم دەبینیەوە لەسەر رێگای هەق و دادپەروەریدا. پێویستم بەوە نیە دڵم پڕبآ لەهیوا. خودا دەستبەردارم نەبوو. مەرگ دەتوانآ کەی بیەوێت بێت دێت، بەڵام ئێش، هەوڵدەدەم تا بە پڕوپووچی بیبینم، مەبەستم پاک وبێگەرد بوو، هێزوئیرادەیەکم دەداتآ کە هەوڵنادەم بۆ داواکردنیان. کەسم لەخەونەکانم ئاگادارنەکردۆتەوە ،کە لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا دەیبینم، تەنها موڵکی خۆمن لەبەرامبەردا خەونی(خواردنی کەسکەسی) نیگەرانی دەکردم:**

**(ژمارەمان لەبەر دەرگای مزگەوتدا زۆربوو، برسیمان بوو، شڕەوپڕەمان لەبەربوو، کەشەکە زۆر گەرم بوو، جورئەتی ئەوەمان نەبوو بچینە ژوورەوە بۆ مزگەوتەکە، چونکە ئاومان پآ نەبوو بۆ دەسنوێژگرتن، خەڵکەکە بەلاماندا تێدەپەڕن و ئاوڕنادەنەوە. کەواتە کەسیش قسەمان لەگەڵ ناکات.) لەپڕێکدا یەکێکمان هەڵدەسآ و بەڕاکردن دووردەکەوێتەوە، بەنیگاکانمان دوای دەکەوین، وەلێ مەسەلەیەکی شاراوە وامان لێدەکات جووڵە نەکەین، دوای قەدەرێک دەگەڕێتەوە لامان و لەگەڵنێکی گەورە کەسکەسی بەسەوزەی شێر وگۆشتی مەڕەوە لەسەردەست هەڵگرتووە، لەسەر زەویەکە دایدەنآ. دەوری لێ دەدەین و بەدەست دەکەوینە خواردنی. ئەو بەتەنیا دەمێنێتەوە، بەپێوە دەوستآ، ناخوات، قسەناکات، چاومان تآ دەبڕێت و دەگەڕێتە دواوە". ئەنجام خەونەکە واتایەکی دیاری کراوی هەبوو: مەرگی یەکێکمان. من**

**لەنێوانیاندا بەتەنیا نەبووم کەخەونی دەبینی ونووقلاّنەی شووم بوو، ئەو بەیانیە هەستم کرد کاتآ خەونەکەم بۆیان گێڕایەوە، ئەوانی دیکەیش خەونەکانی خۆیان گێڕایەوە،(واکرین) دەیووت ئەوە شوومە کە گەنمەشامی بێتە خەونمان: "خۆی لەسەرە رێگا دەبینێتەوە لەنزیک جووتیارێک گۆزەی گەنمە شامی دەفرۆشێت، دانەیەکی دەداتآ بآ ئەوەی لەبەرامبەر داوای پارەی لێ بکات". پێی ووت: " ئەم هەمووە بگرە، ئەمە تویشوویەکی چاکە بۆ سەفەری رێگا". ئەوکاتەی دەڕوا و دوور دەکەوێتەوە، تووشی دەبآ بەتووشی کەسێکەوە دەیناسآ، بەلاّم کەسەکە بەلایدا رەت دەبآ بآ ئەوەی سڵاو لێ بکات. دەزانآ کە ئەوکەسە ئاگای لەو نەبوو". بەلاّم خەونەکانی(عەباس) زیاتر روون بوون، ئاهەنگ، پێکەنین، رووناکی، تیشکی خۆری درەوشاوەو، لەناوەڕاستدا قەفەزێکی گەورە پڕ لەکۆتر و لەکۆترەباریکە، درەوشاوەو، لەناوەڕاستدا قەفەزێکی گەورە پڕ لەکۆتر و لەکۆترەباریکە، دەستێکی سپی لەئاسمان دێتە خوارەوە و خۆی دەکاتە نێوان شیشی قەفەسەکەوە و کۆترێک دەگرێت، پاشان لەنێو هەورەکەدا وون دەبآ. ئەم خەونانە مایەی تاکە شوومێکن، بۆنی مەرگ دێتە ژوورەوە و ناوگرتووخانەکە تەماوی دەکات، دەخوولێتەوە، و بەدەوری هەندآ لەزیندانەکان دەسووڕێتەوە تادەگاتە یەکێکیان، لەشەودا، بایەقووش هاوارە شوومەی دەست پێدەکات، بەزمانی خۆی رادەگەیەنێ: کۆچکردنی یەکێکمانە، هەندآ جار خوێندنە شیوەنیەکەی بەبآ وەستان پانزە رۆژ بەردەوام دەبوو، تا دوای رێورەسمی بەخاک سپاردنەکە ، هەمووومان وریا بووین بۆ نوقلاّنەی باڵندەکان، تەنها(عەشار) هەستی بەواتاکانی نەدەکرد، دەیقیژاند و رقی لێمان دەبوەوە ، چونکە بۆ ئەم هەست پێکردنە دەست پێشخەربووین، پاسەوانەکانمان لەمەسەلەکە ئاگاداردەکردەوە. چونکە دەبوو توورەکەی لاستیک و گەچی گەرم ئامادەبکرێت و، دەبآگۆڕهەڵکەنرێت، بەلاّم زۆرجار بێزارییان دەربڕی و پێیان دەووتین: "ئێمە پاسەوانین و گۆڕهەڵکەن نین".**

- **مەسەلەکە بەدەستی من نیە، وەلاّمم دەدانەوە؟، خەونەکانمان هەواڵەکانیان یەک لابووەتەوە: ئەمە ئاگاداركردنەوەی مەرگە. نازانم بەرکێمان دەکەوێت، من، بەلای خۆمەوە، ئامادەم بۆی، بەلاّم هەست ناکەم لێمەوە نزیک بێت، ئەگەر هاتوو ئازاری بڕبڕەی پشتم زیادی کرد لەرادەی خۆی، دەتوانن بمکوژن، بەمەیش رزگارم دەکەن.**

- **خەونی تێکەڵڕ وپێکەڵڕ، تا زیندوویت ئەم خزمەتەت ناکەین، لێرەدا خزمەت پێشکەشکردن قەدەغەیە، مەسەلەکان بەوشێوەیە بەڕێوەدەچآ، دەبوو ئەوەت زانیبایە لەوەتەی کە تەشریفت هێناوەتە ئێرە.**

- **بەلاّم لەمەینەتیدا وەکو یەکین.**

- **نەخێر، تۆ هەڵەیت، ئێمە سەربازی سەربەدەوڵەت و شەریفین، ئەمەیش شەرەفێکە سوپا پێی بەخشیووین کە دایمەزراندوین بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە..**

- **بەلاّم ئێمە سەربەهەمان خێزانین.**

- **نەخێر؟ هەرگیز! ئەگەر لەوەرزکردنمان بەردەوام بیت، دەتکوژم!**

- **دەی، بیکە..**

- **هەیهوو..**

**پێدەکەنیم کاتێک عەشتار دەمارگیر دەبوو چونکە هەستی دەکرد کە دوور خراوەتەوە.**

(25)

لەوەرزی زستاندا پاسەوانەکان بۆ شەوێک بەلای کەمەوە شێت دەبوون. کاتآ بەچرا رووناک و تێلاکانی دەستیانەوە دەهاتنە ژوورەوە، ئێمە نووستووبووین، بەچەکی رەشاشەوە. لەوپەڕی تآ ورووژاویی بوون، سووربوون بۆ کۆتایی هێنان بەحاڵەتێکی خەیاڵکراو لەئاژاوە. "دەبآ واز لە ژاوە ژاو ومرخەمرخی وەکو بەرازە کێوی و پێکەنینی جنۆکانە بهێنن، یان ئەوەتا وازدەهێنن یان ئەوەتا مشکەکوێرەکان بەرەڵادەکەین".

لەخەو هەڵیاندەساندین. داوامان لێدەکردن وازمان لێ بێنن و لێمان گەڕێن. سوێندمان دەخوارد کە کەسمان نە قسەی کردوە نە پێکەنیووە نەهاواری کردوە. بێهوودە بوو، ئەوان لەوبڕوایەدا بوون کە ئێمە یان ئاهەنگێک دەگێڕین یان خۆمان ئامادەدەکەین بۆ شۆڕش، هەرکە دەرۆیشتن خۆمان لەبەر پێکەنین نەدەگرت، لەبەرخۆمانەوە دەمانووت: ئەوان شێت بوون. ئەوسایش دەگەڕانەوە هێندەی دی تووڕەببوون و، بەتێلاکانیان دەیاندا لەدەرگاکان و هەرایەکی گەورەیان دەنایەوە: " ئەگەر جنۆکەتان تیا کەوتووە، یان دەستتان لەگەڵ ئەهریمەن تێکەڵ کردوە، دەزانین چۆن دەتانپلیشێنینەوە و تێکتاندەشکێنین، ئەم گاڵتەجاڕیە راگرن". هیچ ئارەزوویەکمان نەبوو کە مشت و مڕیان لە گەڵ بکەین یان بۆیان بسەلمێنین کە گرتووخانەکە جنۆکەی تیدانیە، بەڕای من ئەگەر جنۆکەیش هەبێت خۆیان لەم چاڵە لادەدەن کە پڕی خراپەیە. لە شەوانی دیکە گوێمان لە تەقەی گوللە دەبێت، دواجار زانیمان کە تارماییەکیان بینیووە و تەقەیان لێی کردووە، بەپێی دەقی ئەو یاسایانەی کە فەرمانیان پێدەدا هەرشتێک جوولایەوە تەقەی لێبکەن.

تەقەیان لەتارماییەکان دەکرد بەتایبەتی لەشەوانی مانگەشەودا، بە تایبەتی کاتێک مێشکەکان لەوپەری وروژاندابن، بۆ رۆژی دواتر راپۆرت بەرزدەکەنەوە بۆ قوماندار ، ئەویش لەلای خۆیەوە بەرزی دەکاتەوە بۆ سەرکردایەتی باڵا، تەقەکردن هەڵەی، ئەعساب شپرزەیی لەلای پاسەوانەکان، شوێنەواری شووم لەبەر کامڵبونی مانگ... تاد. ئەمە دڵی دەداینەوە بەڵام باری ژیانی لێ سووک نەکردین، دیاربوو عەشار دڵی خۆش بوو و دەیووت:" دەسپێشخەریەکی چاکە.. بەتەنیا نەبووین ئەوانەی کە سەراسێمە زۆری بۆ دەهێنان، ئەوانیش خەریکە شێت دەبن. مەسەلەیەکی چاکە بۆ بەرزبوونەوەی وورەم".

رۆژێکیان هاتن بۆ رشتنی زەوی گرتووخانەکە بە دەرمانی پاککەرەوە و، دواییش بخووریان پیدا ڕشت، پێیانوابوو بەبخوور جنۆکە دەردەکەن، لەبەرخۆمەوە پێکەنینم دەهات، ئەم گوزارشتانەیان دەووتەوە : "ئەعوزوبیلا لەوانەی کە برایەتی شەیتان دەکەن و لەسەردەستی نانیان خواردوە و ئەوانەی بەدکاریی لەچاوانیان پریشک دەهاوآ، باخودا کردەوەی شەیتان و برادەرەکانی پووچەڵ کاتەوە، هێزو بیناییمان پآ ببەخشآ بۆ ئەوەی بەرگری شەڕەنگێزیەکانی بکەین و، رێگەمان بداتآ تا مۆڵەتمان بدەنآ بەزووترین کات، بۆ ئەوەی ئەم شێتیەمان لەبیربچێتەوە کە لەم زەویە غەزەب لێگیراوە بۆ هەتا هەتاییە چاوی تآ بڕیووین". منیش لەلای خۆمەوە گوزارشتی پێچەوانەم دەخوێند(ڕعوژ باللە من الشیگان الرجیم) ئەوانیش لەدوای منەوە دەیانووتەوە، وەلێ مامۆستا(غەریب) ئایەتی قورئانی دەخوێندەوە. قورئان خوێندنەکە دەیترساندن و بەپەلە گرتووخانەکەیان بەجێدەهێشت، هەستیان دەکرد کە دووچاری گاڵتەپێکردنی ئێمە بوون. دواجار زانیم ئەوە دەسپێشخەریەک بوو لەلایەن ئەوانەوە، ئەوە تاقە دەسپێشخەری بوو کە جورئەتیان

کردبوو لەماوەی هەژدە ساڵی زیندانیدا لەلایەن ئەوانەوە بیکەن، قوماندار ئاگای ئەوەی نەبوو، چونکە هەرگیز پێی نەهاتبووە ناو زیندانەکەوە، بەڵام بەووردی دەیزانی کە چی روودەدات لەوێ. لەسەرەتادا لەپاسەوانەکان دەپاڕاینەوە ئەگەر یەکێکمان نەخۆش کەوت قوماندار ئاگاداربکەنەوە. ئەگەر یەکێکیان جورئەتی ئەوەی کردبایە و ئاگاداری کردبایەوە بۆ نموونە کە "ژمارە 6 زۆر نەخۆشە" دەیقیژاندو دەیووت:"نەخڵەتابن هەواڵم بۆ بێنن کە فڵان نەخۆشە. نەیەن تەنها بۆ ئەوەی پێم بڵێن کە مردوە، بۆ ئەوەی حیسابەکانم راست دەرچن. تێ گەیشتی؟ لەمەودوا نامەوێ گوێم لەوشەی(نەخۆش)بێت، دەی، بڕۆن".

قوماندار کە وەکو لوغزێک خۆی دەرناخست، رۆژێکیان(عەشار) لافی ئەوەی لێدا بۆ ئەوەی سەرنجمان رابکێشێت، کە ئەو لەمەوبەر قومانداری ناسیووە، بێ ئەوەی بەدرۆی بخەینەوە، بڕیارمان دا کە وەسفی بکەین، یان بەلای کەمەوە بڵێین ئەوە بەخەیاڵماندا هاتووە:

- کورتە باڵایە، قەڵەو و نابووتە.
- سمێڵێکی هەیە کە نیشانەی پیاوەتیە.
- بۆنی دەمی گەنیوە.
- نەخوێندەوارە، ناتوانێ راپۆرتە کورتە لەیەکچووەکان بخوێنێتەوە و بیانووسێتەوە.
- لاوازە، لەشی بتەوە، دەموچاو ئاوڵاویە، چاو بەقوڵاچووە، نیگا لێڵە.
- دەبێ تووشی نەخۆشیەکی جەستەیی هاتبێ.
- خێزانی نیە
- بەبێ ناخۆشی دەخەوێت
- بەرتیل ناخوات.
- رێک و پێکەو میوەی دەریا ناخوات.
- وەکو سەگ موتیعە، لەسەر کوشتن مەشق دراوە، لەسەر سەربڕین،لەسەر خوێن خواردن و خواردنی جگەری قوربانیەکانی.
- هەرگیز گومان ناکات،
- بۆ ئەوەی یەکێکمان گومان بکات دەبێ بیربکاتەوە، بەڵام ئەو هەرگیز بیرناکاتەوە.
- دەبێ تووشی نەخۆشیەکی کوشندە هاتبێ.
- لەوانەیە (ئۆفەفیر)یش وەکو ئەو وابێت.

عەشار خۆی تێهەڵقورتاند و وتی:

**سەرەڕای ئەوەی وتتان مەسەلەیەکتان بەبیردانەهات کە ئەو گۆشتی ئادەمیزاد دەخوات، حەزی بەخواردنی گۆشتی بنیادەمە. نەوسنە و حەزی لەمندالانە. بۆیە گوێزانەوەی بۆ ئێرە بەمەبەستی دوورخستنەوەی بوو لە(ریبات) و سزادانی. بەلام مەسەلەکەی بەسزا نەدەزانی بگرە بەڕێزلێنان ، کە ئیتاعەی سەرۆکەکانی بەسەر خەلکانی دیکەدا بسەپێنآ. حەزی لەئیتاعە بوو و زیادەڕۆیی تیدادەکرد هەمیشە لەئیتاعەکردنی خۆیدا بووە. ئەگەر لەرێگا تووشی هاتبای سەرنجت نەدەدا.**

**- عەشار تۆ راست دەکەیت، درِندەکان لە سەروچاوی خۆیاندا ئەو دڕندەییانە هەلناگرن کە ئەنجامیان داوە. دەبآ قوماندار سەربازێکی دلسۆز بێت لەخزمەتی سوپا و خزمەتی فەرماندەکانیدا.**

**دواجارتێگەیشتم کە قوماندار بەرهەمێکی رووت و تووندوتیژی پەروەردەی سەربازی فەرەنسای کۆلۆنیالی بوو، سوپای هیند چینی ئەوەی لەمەغریب خزمەتی کردبوو بەفەرماندەیی ژەنرالێ بووایآ دولاتۆر، کە بەربەرەکان ناویان نابوو(موحا ئۆلاسوور) کاتی (ئۆفەقیر) بەلاویەتی دەیگرێتە خۆی و مەشقی پێدەکات و دەیهێنێتە بەلاتەوە. قوماندار و (ئۆفەقیر) پێکەوە بوون، ئەویش ئەفسەری دوو ئەستێرە بوو لەسوپای فەرەنسادا، بەرزبووەوە خرایە ریزی هێزە چەکدارەکانی پاشایەتیەوە، لەئەکادیمیا مەشق درابوو. هەلبژاردنی بۆ مەسەلەی گرتووخانەکە کوێرانە نەبوو، خزمەتی بەرچاوی کردبوو بۆ سوپا و دەرەک. بکوژێکی بآ دەنگ و هێمن بوو. لەهەموو جیهاندا لەوێنەی قوماندار هەن، پیاون و سەروچاوی بنیادەمەیان هەیەو جەستەو رۆحیان بەچاکی و لێزانیەوە لەهەموو شێوەیەکی مرۆڤانە خالی کرابوونەوە، ئەوان نامۆن لەوەی کە ئادەمیانەیەو تێیاندایە، وێنەی ئەوانەی کە بڕیار دەدەن خوێنی خۆیان لە دەست بدەن ، بەبێ دوودلی وگومانی پرسیارکردن. قوماندار دەورەکەی بەخۆڕسکی و ئاسانی ترسناکەوە دەبینی و لەگەلیدا دەژیا. تەبا بوو لەگەل هەرکەسێکدا کە دەبێتە نێوان بۆ مەرگ کە لەسەرەخۆو بەدانراوی دەهات و، بۆ ئەشکەنجەدانە بەووردی حیساب بۆ کراوەکان، لەوە زیاتر چیتر نەبوو، لەگەلێ ئەو ئەرک و ئیرادەیەی کە پێی سپێردرابوون تێکەل ببوو، پڕ بوو چلک و کێم و هەناوی بەکینەیەکی میکانیزمی ئاوسابوو، چاوی بەخوێنێکی زەردی دەستەونەزەر داپۆشرابوو. قوماندار خۆی بەقوماندار دەزانی، خۆی دەشاردەوە، گەمەی بەمێشکی رزگاربووەکان دەکرد، بەتەنیا وەکو کەمتیاری هار دەیقیژاند، بەتەنها ئەو دڕندەیە خۆی لەخۆیدا چالێکی بآ بن بوو. هەرگیز بیرم لێی نەدەکردەوە.**

(26)

**ئەگەرچی لەدەرکردنی ئەوکەسایەتیە لەبیرکردنەوەی خۆم سەرکەوتوو بووم، سەرکەوتوویش بووین لەبەرگریکردنی بآ ئومێدیی. ئەگەر رازی بووم بەوەی دژ بەخۆم و دژ بەقوماندار و تارماییەکانی ململانآ بکەم، هەندێجار لەخۆم دەپرسی لەسەرچاوەی گوڕوتینەوە لەجەستەو رۆحم پێی بەهێز دەبووم. ئازار نەبوو کە ئاماژەی ئەو رێگایەی بۆ کردم کە گرتوومەتەبەر، بگرە خۆم بووم، خودی خۆم پێش هەر ئازارێک و چاو لەهەر ئازارێک دەپۆشێت، دەبووایە بەسەر گومان و کانگای لاوازیمدا سەرکەوتمایە، بەتایبەتی ئەو وەهمانەی کە هەموو زینەوەرێکی ئادەمیانە ئاویان دەدەن. چۆن بتوانم ئەوە بکەم؟ کە لەناخمدا بیکوژێنمەوە، چونکە وازم هێنا لەدلنیابوون لەو وێنانەی کە واقیع زەیف دەکەن، لاوازییش لەوەدایە کە هەستەکان واوەربگیرێن کە واقیعن، لەگەلێ درۆێکدا رێککەویت کە لەخودتەوە دەرپەڕێت**

و بگەڕێتەوە بۆ خودت. بەوەیش وابزانیت کە هەنگاوێکت بەرەو پێشەوە ناوە. بەهەرحاڵ ئەگەر ویستت لەوبیابانەدا بەرەو پێشەوە بڕۆی، دەبێ لەهەموو شتێک ئازاد دەبێت، دەبێ درک بەوە بکەیت کە تەنها بیرۆکە لە هەموو شتێک ئازاد دەبێت، کەفیلە بەوەی کە بتگەیەنێتە خۆشی و بێشی کە لەوانەیە ناوی سۆزگرتن بێت.

ژمارە(5) عەبدلمەلیک، کوڕێکی ئازابوو، رۆژێک گومانی نەکردوە عەشار بێزاری دەکرد و بەخیلی بەپاکی سەربوردەکەی دەبرد: "ئەی عەبدلمەلیک، هەرگیز ئازار ناچێژی؟ تۆ دەتەوێ وامان تێبگەیەنیت وەکو داروسێکەم لەزیندانەکەی بەرامبەردا کە کابرایەکی رادەبەدەری. بەڵام پێم وایە گەمەکەی خۆت دەشارێتەوە، ئەم جێ پەنجەیەت خیانەتمان لێ دەکات و سەرپێچی کۆمەڵەکە دەکات. هەموو نەخۆشن، هیچمان تەندروست نیە، بەتەنها تۆ نانالێنیت؟ تۆ گاڵتەمان پێ دەکەیت".

تۆزێک لەسەری وەستام، بەڵام دواجار دەبوایە بهاتمایە ناو باسەکەو پێی بڵێم: "عەشار، بێدەنگ بە، لێی گەڕێ و رێزی هەڵوێستی بگرە. "

- بێگومان، چونکە تۆیش وەکو ئەویت، تۆیش خۆت وانیشان دەدەیت کە نەفس بەرزیت. کەتۆ تەڕەزانی سەردەمی، بەچاکی گەمەکەی تۆش دەزانم و گەمژەنیم.

- عەشار وازبێنە ئەگینا گۆشەگیرت دەکەین.

- نا تەنها گۆشەگیریی نا.. لەوانەیە لەناوم ببات، بەڵام تکات لێدەکەم بە برادەرەکەت بلێ با تۆزێک قسەم لەگەڵردا بکات.

- بۆم نیە داوای ئەوەی لێبکەم. ئەگەر بیەوێ قسەبکات دەیکرد. ئەگەریش بێدەنگ بێ ئەوا هۆی خۆی هەیە.

- ئۆکەی، بێدەنگ دەبم، رازی بوویت؟ بەڵام بێزارم، چی بکەی بۆ ئەوەی وەڕزی لەخۆت دوورخەیتەوە؟

- بیردەکەمەوە، نوێژدەکەم، لەبەرخۆمەوە سوورەتەکانی قورئان دەخوێنم، بەدوای چیرۆکەوە دەگەڕێم بۆ ئەوەی بۆتانی بگێڕمەوە، ئەمە ئەو هەمووەیە کە دەیکەم.

دوای تۆزێک لەبێدەنگی دێتەقسە:

- ئایا دەتوانی یارمەتیم بدەیت بۆ خوێندنەوەی سوورەتی(بەقەرە)؟

- دواجار، ئێستا نۆرەی وانەی ئینگلیزیەو فوئاد مامۆستامانە.

عەبدول مەلیک وازی هێنابوو لەبەشداریکردنمان لەچالاکیەکان، دیار نەبوو، نیگەران بووم لەوەی بەسەری هاتبوو، بەڵام جورئەتم نەدەکرد بێزاری بکەم.. پاسەوانەکان سەرنجی ئەوەیان دابوو کەوازی لەنانخواردن هێنابوو، وەلی ئاگای لەوەبوو نان هەڵگرێت، لەبەتانیە(1936)ە کەی تەوورەکەیەکی دووری بوو، نانی تیدا کۆدەکردەوە، نانەکەی دەخستە تەوورەکەکەوە تا ووشک بێتەوە، دواجار پارچە پارچەی دەکرد و بەهەردوو پاژنەی دەیهاڕی پاشان تەڕی دەکردو قوتی دەدا. ئەمە خواردنی رۆژانەی بوو، وورده نانی ووشکی دەخوارد کە لەبنی تەوورەکەکەی دەمایەوە. بەمەیش رێبازی مردنی

خۆی هەڵبژاردبوو، بەڵاّم ئەوەی پێی بزانین. کاتێک بانگم دەکرد دەیبووت هەموو شتێک بەچاکی بەڕێوە دەچێت، رزگاربوون نزیکە، بەگاڵتەوە لێم دەپرسی کە ئەگەر رێبازێکی راکردنی دۆزیبێتەوە.

- بەڵێ بەڵام ئەمجارە نامگرنەوە.

ئەو هەر لەسەرەتاوە تاکە کەس بوو لە ناومان کە هەوڵی راکردنی دابوو، بەیانیەکیان هەر کە دوو پاسەوانەکە دەرگای زیندانەکەیان کردەوە، بۆ ئەوەی نان و قاوە دابنێن، لێیداو چووە دەرەوە دوای ئەوە هەردوکیانی خست و مەنجەڵە قاوەکشیان پێ بوو، مانەوەی دەرگای زیندانەکەی بەکراوە بەهەڵزانی و رایکرد، بەهاوار دوای کەوتن و، توانیان لەناوەڕاستی حەوشەکە بیوەستێنن و کەوتنە لێدانی بەجنێودان:(هەی خوێڕی، خەریک بوو بێتەهۆی کوشتنمان، چیمان لێکردوی تابمانخەیتە ئەم هەڵوێستەوە؟ بەخت یارمان بوو، پاسەوان لەچاودێرییدا فەرمانی راشکاویان پێیە، کە تەقەبکەن لەهەر شتێکن بجووڵێتەوە)..

هەر کە گەڕانیانەوە بۆ زیندانەکەی، وەعزیان داینێ ووتیان:

"هەوڵبدەن دەرچنە دەرەوە دەکوژرێن و ئێمەیش لەگەڵتان دەکوژرێین" سەرنەکەوتنی ئەو هەوڵە پاشگەزی کردینەوە لەهەر هەوڵێکی لەوجۆرە، عەبدل مەلیک لێی رزگار نەبوو، ئەنجامی ئازارێکی زۆر کە چەند رۆژێکی خایاند مرد. دوای پاسەوانەکان تەرمەکەیان گواستەوە، جل و بەتانیەو توورەکە کەیم هەڵگرت، کە هێشتا پڕبوو لە نان. هەر کە لەبەردەم یەکێک لەپاسەوانەکان توورەکەکەم کردەوە و، بەتیشکی لایتەکەی یارمەتی دام، تووشی شۆک بووم هەرکە دیتم توورەکەکە پڕیەتی لەسیسرکە زیاتر لەنانەکەو هێلکەکانیان تێکەڵر بەووردە نانەکە ببوو، عەبدل مەلیکی کڵۆلر نەیدەتوانی بزانێ کەچی دەخوات، بەخواردنی هەزاران هێلکەی سیسرکە ژەهرخواردوو بوو. مردنی عەبدل مەلیک زۆرکاری کردبوو لە(عەشار). هەستی خەمباری کرد بۆی، چونکە بەر لەمردنی بەچەند هەفتەیەک بێزاری دەکرد.

(27)

کەریم، بەندۆلە قسەکەرەکەمان و رۆژ ژمێرمان و رێپیشاندەری تاریکیەکەمان بوو، تادەهات بێ تاقەت دەبوو، ئاگاداری دەکردینەوە کە لەچ سالر و چ مانگێکداین، بەلاّم ئاگای لەرۆژو لەسەعات نەبوو، ئیشکردنی ئامێرەکە تێکچوو بوو، بیری کزببوو، بەلانی کەمەوە دەمزانی سەعاتەکە چەندە، بێئەوەی بەکەس بڵێم و شوێنی ئەوم گرتەوە. سیانزە سالر بوو لەو گرتووخانەیەدا بووین، نیوەی ژمارەکەمان لەوێ تیاچوون، پاسەوانەکانیان نەدەگۆڕیەوە بەهی دیکە، وەکو بڵێی تامردن بۆ خزمەتی ئێمە دانرابوون، زۆرجار چۆلەکە لەوێ هەبوو، هەندێکیان دەیانجریواندو هەندێکیان لەجموجۆڵی حەوشەکەو کەش و هەوا ئاگاداریان دەکردینەوە، رۆتین لەدۆزەخیشدا هەیە، زۆرجار پاسەوانەکان میزاجیان خراپ بوو، هەندێکیان گازندەیان لەتەنهایی دەکرد. پاشان سەرنجی ئەوەمدا کە رەقیب (مەفازلر) پاسەوانی پلە بەرزتربوو، جارناجارێک دەوەستا لەتەنیشت زیندانەکەی لای چەپی زیندانەکەی منەوە، کە واکرینی لێ بوو، ماوەیەک بەزمانی بەربەری قسەی لەگەڵدا دەکرد، باسی مەسەلەی ئاساییان دەکرد، رۆژێکیان(مەفازلر) بەدەنگی نزم قسەی لەگەڵدا دەکرد. بەچرپە قسەیان دەکرد، هیچم نەووت، بەلاّم گەیشتمە ئەوەی

**کە خەڵکی شارێکن، دواجار پێم گەیشت نەک ژن وژنخوازی یەکترن، بەڵکو هەردوو خێزانەکەیان پەیمانێکیان هەبوو کە بە بەبەری پێی دەووترێت(تاتا)، رۆژێکیان بۆم نەرخسا بوو کە بزانم رەچەڵەکی ئەم وشەیە چیە. جەنگاوەر کۆنەکانی هندی چینی لەسەربازگە وەکو ئاماژە بۆ کوختێکی خڕ بەکاریان دەهێنا کە سەربازەکانیان تیا بەند دەکرد بۆ چەند سەعاتێک بۆ تەمێکردنیان. بەڵام ناوەکە لێرەدا بەتەواوی واتایەکی دیکەی هەیە، لەبەرچەند هۆیەکی ئاڵۆز خێزانێک پەیمانی وەلا بۆ خێزانێکی دیکە ، یان هۆزێکی دیکە رادەگەیەنآ و خۆی دەخاتە ژێر پاراستنی ئەوەوە، بگرە ژێر سەرپەرشتیاری ئەوەوە، پەیوەندیانە توندو تۆلر دەبێت تا شێوەیەکی پیرۆز وەردەگرێت، ئەم جۆرە وەلایەش پشتگیریەکی واتایی و پاڵپشتێکی مادی و هاوکاریەکی بآ مەرج لەگەلر تاکەکانی ئەو خێزانەدا دەسەپێنآ کە بە(تاتا) دەناسرێت. نازانم چۆن لەنێوان خۆیاندا یەکتردەناسێنن، واکرین و مەفازلر ساڵانێکیان بەسەربردبوو بەرلەوەی ئەوە ئاشکرا بکەن کە هەردوکیان ملکەچی پەیوەندیەکانی(تاتا)ن. چەند هەفتەیەک تێپەری گوێم لێ بوو واکرین دووجار دای لەدیواری نێوان هەردوو زیندانەکەمان و پێی وتم:**

**(دەتوانی نامەیەک بۆ ژنەکەم بنووسی؟).**

**سەرم سوورما**

**(نامە؟ ئەوەت هەیە کە پێویستیەتی، قەڵەم و کاغەز؟).**

- **بەم نزیکانە ئەوەی پێویستمە دەستم دەکەوێت. پێموایە توانای ئەوە هەیە کە نامە بگەیەنمە ژنەکەم و مەسەلەکە هێشتا تەئکیدنیە.**

- **چۆن قەڵەم وکاغزت دەست دەکەوێت؟ تۆباش دەزانیت ئەو شتانە زۆر بەنرخن و بەتەواوەتی بوونیان قەدەغەیە لەچاڵەکەدا.**

- **گوێبگرە، دواجار بۆت باسی دەکەم. بەڵام ئێستا پێم بلێ ئەگەر رازی ئەو خزمەتەم بکەیت، تۆ دەزانی من پیتەکانی هیجام لەبیرچووەتەوە، ناتوانم بخوێنمەوە، ئەمەیش نەخۆشیەکەمە. بەڵام تۆ مێشکی خۆت بەساغ و سەلامەتی پاراستووە. وشەکانم لەبیرنەماوە.**

- **بەتەئکید، بەڵام وریابە.**

- **"ێگومان مەفازلر ئامۆزامە، بابلێین بەتەواوی ئامۆزام نیە، ژنەکەم ئامۆزای ژنەکەیەتی. وابزانم پەیمانێک لەنێوان هەردوو خێزانەکەماندا هەیە. رۆژێکیان سروشتی ئەم پەیمانەت بۆ باس دەکەم. مافی ئەوەی نیە قسەبکات. بەڵام پێموایە رازی دەبآ کە نامەکەم بۆ بەرێت. بۆ ئەوەی دەبآ چاوەروانی کاتی مۆڵەتەکەی بین و بەتایبەتی گۆرینی ئەو پاسەوانەی کە مۆڵەتدراوەکان دەپشکنێت".**

**بۆیە واکرین دوای سآ مانگ لەچاوەروانی و قسەکردنی بەگومان و مەترسیدار کرانەوەی دەرگای زیندانەکەی بەهەلزانی، تا لەژێر دەرگا زیندانەکەمەوە پارچە کاغەزێک و قەڵەمێکی دار درێژبکات. دەستم درێژ کردو بەدزیەوە هەڵمگرتن. گەلێ دڵم خۆش بوو، حەماسێک کە باس ناکرێت، هەوڵمدا دەریان نەخەم. قەڵەمەکەم گرت و خستمە سەر لێوم، بەڵا دارقەڵەمەکەم ماچ کرد، کە ناوکێکی رە سا سی تیدایە، پاشان لەسەرەخۆ کاغەزەکەم گرتە دەستەوە، زبربوو، بەڵام چیمداوە لەجۆری ئەو پارچە کاغەزەی، کە هەرکەدەستم بەری کەوت ئیدی واتای کزە رووناکیەک بوو**

**لەوتاریکیەماندا. سەرەتا دەستم کرد بەزەین دەمنووسی، چۆن دەست پێ بکەم؟ ئایا دەبێ هێما بەکاربێنم یان دەبێ رووداوەکان وەکو خۆیان بگێرمەوە؟ ئەوەی لەزەینمدا نووسی بووم سڕیمەوە، پاشان جارێکی دیکە دەمنووسیەوەو واکرین پەلەی لێدەکردم:( بەژنەکەم بلێ هێشتا لەژیاندا ماوم و پێی بڵێی هەندێ داودەرمان بداتە مەفازلڕ)..**

- **بەڵێ، بەڵام دەبێ ئەم هەلە بقۆزینەوە و خێزانەکانی دیکە لەچارەنووسمان ئاگادار بکەینەوە..**

- **من بڕوام پێتە؟، بەڵام لەبیرت نەچێ کە مەفازلڕ خۆی دووچاری مەترسی گەورە دەکات، شتی ئاسایی بنووسە..**

**بەوجۆرە دوای چوار رۆژ لەتێڕامان، کاغەزەکەمان کردە دوولەتەوە و دوو رستەم نووسی: من باشم، ئێمە لە(تزمامارت) ین، رووناکی نیە، هەندێ دەرمانی ئازار بدە بەمەفازلڕ.. واکرین..**

**هەر لەوساتەوە، دیاربوو ئەو لەتەکاغەزە گۆرانی یەکلاکەرەوە لەژیانماندا روودەدات، لەلای خۆمەوە، ئارەزووم نەبوو بۆ کەس بنووسم، چونکە هەر لەسەرەتاوە بڕیارم دابوو کە نەدەزگیران و نەخێزانم نیە. پێنج ساڵی دیکە بەسەر دەچێت، پێنج ساڵ لەگومان کە تیدا هیوا سەرلەنوێ دیار دەکەوێت. دەبووایە نکووڵی لەو هیوایە بکەم و لەناو دۆزەخدا بژیم ، ململانێ دژی مەرگ بکەم بەو ئامرازانەی کە لەبەردەستمدایە، واتا بە ئیرادە و هێزی روحانی. مەفازلڕ پارچە کاغەزەکەی برد بۆ ژنەکەی واکرین بێ ئەوەی هیچی پێ بلێ. خوێنەواری نەبوو، دابووی بەدایکی ژنە خاوەن دەرمانخانەیەک کە ئەویش براکەی لەریزی بێ سەرو شوێنەکاندا بوو، بەم شێوەیە برا بچووکەی ژمارە(18) عومەر پێی زانیبوو، کە لەفەرەنسا دەیخوێند، مەفازلڕ لە ژنە خاوەنی دەرمانخانەکە وەرگت، بەتایبەتی دەرمانی ئازار و دژە هەڵاوسان. لەگەڵڕ بڕە پارەیەک. یەکسەر هەستم پێکرد کە مەفازلڕ گەرچی مەبەستی هاوکاری خێڵەکی بوو. هەرکە دوای چەندمانگێک هات بەرتیلی وەرگرتوو هەرکە هات بۆ سەردانی واکرین لێی پرسی ئەگەر پێویستی بەداودەرمان هەبێت. گەندەلی تەنانەت لەدۆزەخیش موعجیزەکان بریندار دەکات، بۆ یەکەمجار بینیم کە گەندەڵی هەندێ چاکەی هەیە، هەندێ پێیان وابوو کە گەندەڵی یارمەتی رزگار بوونی هەندێ خەڵک دەدات. هەندێ پارچە کاغەز لەگرتووخانەکەوە دزەیان دەکرد و مەفازڵیش دەوڵەمەند دەبوو، براکەی عومەر پەیوەندی کردبوو بە(کریستین)ەوە، ژنێکی ئاسایی نەبوو، چالاکوان بوو لە پێناوی مافی مرۆڤدا، بەرگریکاربوو، زۆر بەحەماسەت بوو، ئەوە بوو ساڵانێکی لەهەوڵی خۆی ژیانی تەرخان دەکات بۆ ریسواکردنی راستی ئەو گرتووخانەیەو هەوڵدان بۆ بەرەڵاکردنمان، هیچ یەکێک لە ئێمەی نەدەناسی و بایەخی بەچارەنووسمان دەدا وەکو بلێی هەموومان برای ئەوین، زەوی ژێرو ژوورکرد بۆ ئەوەی دەستگیرکردنمان لەبەرچاوی هەمووجیهاندا ریسوابکات، وەکو لەمەوبەر بۆ مێردەکەی کردبوو کاتێ دەستگیرکرابوو، بەهۆی رایەکانیەوە، لە بەندیخانەی(قونەیتەرە)، سەیریش لەوەدایە کە قوماندار نەهات بۆ بەشەکەی ئێمە بۆ لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەی دزەکردنی ئەو زانیاریانە. راستیش گومانی چووە سەر بەندییەکانی گرتووخانەی(ڕ) کە لەوێ کە سیستمە پیادەکراوەکان کەمتر توندوتیژی بوون، لەوانەیە ئەنجام دەسەڵات بەڕاستی بەرامبەر بڵێوبوونەوەی ئەو زانیاریانە تەنگەتاو نابێت، بگرە بەپێچەوانەی ئەوەوە لەوانەیە لەبەرژەوەندیدا بێت کە ئەوە باس بکرێت ، بۆ ئەوەی هەستی ترس لەلای خەڵک بچەسپێنێ و، شێوەیەکن لەشێوەی تۆقاندنی دەمامک کراوە جێگیربێت. تەنانەت مەفازڵیش، نێردرا بوو بۆ رێکخستنی دزەکردنی ئەو زانیاریە سەرەتاییانە، ئەگینا بۆچی پانزە ساڵ چاوەڕێی کردبوو بۆ ئەوەی ئەو سۆزداریەی خۆی دەرخات؟**

**هەرکە رۆژنامەکان دەستیان کرد بەنووسین لەسەر(تزمامارت) مەفازلر ترسی لێ نیشت، کەسێکی نامەردی لێ دەرچوو، خۆی بەدوور دەگرت قسەمان لەگەلردا بکات، هەرکە لەبەردەم دەرگاکەی واکرینەوە رەت بووایە تفێکی دەکردو بەزمانی بەربەری جنێوێکی دەدات. کەس نەیدەتوانی بەرەنگاری ئەو هەواڵە ببێتەوە کە لەدەرەوە بلێوببوەوە. پێم گەیشت کە(کریستین) پەیوەندی کردبوو بەرێکخراوی لێبووردنی نێو دەوڵەتی و رۆژنامەنووسە دەست رۆیشتووەکانەوە، ئیدی بەتەنها چارەنووسمان بارمتەی ویستی قوماندار نەبوو، بگرە هی هەڵوێستی رای گشتی جیهانیش بوو. لەو ماوەیەدا پیاوان دەمردن، وەک بلێی هیوای ئازادی بوو بەمردن.**

(28)

**هێشتا تا ئەمرۆیش شەرم دەکەم لەوەی کە 23ی نیسانی 1987روویدا. کۆنترۆڵی خۆم لەدەست دابوو، ئالوودەی میزاجێکی خراپ و تووڕەیی و شۆرشی ئەعساب ببووم. دوو رۆژ بوو وازم لەنوێژکردن هێنابوو ، ئارەزووی تێرامان و راکردنم ن لەرێگای بەردە رەشدا لەدەستدابوو، منیش جآ لاوازی خۆم هەبوو، هەوڵمدەدا بیشارمەوە یان گوێی نەدەمێ، لەو هەوڵەمدا سەرکەوتوو بووم، تا بەلانی کەمەوە بەرگەی ئێشی جەستەی خۆم بگرم، ئەوەی کە برِبرِەی پشتی دەشکاندم و دەستی گۆج دەکردم. ئارەزووی هەستانی بەیانیانیشم نەبوو، بەبیانووی ئەوەی کە پەردەکان بۆ هەتا هەتایە دادرانەوە کە تەونەکانیان لەچیمەنتۆ بوون و لۆچیان هەبوو. ئارەزووی هەڵسانم نەبوو بەسەر نەوی کردنەوە، حاڵم حاڵی کەسێک بوو چاوەرێی هیچ نەبوو، لەگەلر ئەم ناهیچەدا راهاتبوو کە لەبەردەکانەوە دەچۆرا، سەرەرای ئەو نامانەی کە بۆ خزمەتی واکرین دەمنووسین. لەوانەیە پەتای هیواکەش گەیشتبووە منیش کە لەنزیک واکرین و هەندآ لەوانی دیکەوە دەسوورایەوە؟ ئەوسا بۆ جاری یەکەم داڵغەی ساتی دەرچوونم لێدەدا، بۆ یەکەمجار بیرم لەخۆر کردەوە، رووناکیەکانی منداڵییم سەرلەنوآ هاتەوە بەرچاو و ئەو بیرەوەریانەی کە پەیوەندیم پێیانەوە بچرابوو، سەرلەنوآ هاتنەوە، دیتم دایکم سپی پۆشیوە. باوەشی بۆ راگرتووم تا بەدووروودرێژی بەسنگی خۆیەوەم بنووسێنێ، دەستی کرد بەگریان و منیش گریام.**

**ئەو هەمووەی کە لەماوەی پانزە سالر پێکەوەم نابوو بەهێواشی هەرەسی دێنێ. دەبوو نەمهێشتایە خێرا ئەوە روویدات و دەبوو وەرزشە زەینیەکانم دەست پآ بکەمەوە بۆ ئەوەی شوێنەکەی خۆم بگەرێنمەوە. لەوماوەیەدا بەتایبەتی (لەحسێن) پێی باش بوو کە ماوەی دووسالر بوو لەزیندانەکەی تەنیشت زیندانەکەم لەبەندیخانەی(قونەیتەرە) دراوسێم بوو، بۆ بەدبەختی خۆی بۆ ئەوەی وەرزم بکات، بۆ بەتایبەتی ئەو شەوەی هەڵبژارد، شەوی گومان و لاوازیی، بۆ ئەوەی بەئەنقەست ئازارم بدات؟**

**(ئەی کورِی پاڵەوان تۆ لەکورِی قەحبەیەک بەولاوە هیچی دیکەنیت، لەپشتی باوکت نەهاتووی، ئەگەر بەراستی لەپشتی ئەو هاتبی بەئاشکرا نکوولی لێ نەدەکرێت، تۆی بە دۆزەخ سپاردو ناو ناتۆرەی خراپی پآ ووتوویت؟ وەڵامم بدەرەوە، هەی لافلێدەر). دەبوو وەلامی نەدەمەوە ئەگینا رایدەکێشام بۆ شەرِە قسەیەک کە ئەنجامەکەی چاک نەبوو. دەیویست ئیحراجم بکات، لەو جێگایەم بدات کە دەیەشێت، تەنانەت ئەگەریش وازمهێنا کە رقم لەباوکم بێتەوەو لەبیری بکەم و بژیم وەک بلێی هەتیووی بآ باوکم، ئەو شەوە زۆر بآ تاقەت بووم، وەکو ئەوانی دیکە گەرامەوە سەر**

سروشتەكەی خۆم شایانی ئازاردان بووم، ماندو تێكشكاو، منیش ویستم بریندارى بكەم، بیرم كەوتەوە كاتێك لە(قونەتیەرە) بووین، گواستیانەوە بۆ نەخۆشخانە بەهۆی تووشبوونی بەنیشانەكانی دلڕ وەستان، پزیشك خستیە ژێر چاودێریەوە لەگەڵیدا باش بوو تەنانەت رێگەی دا كە ژنەكەی سەردانی بكات، ئەوكاتە هێشتا زیندانی ئاسایی بووین بەدەسالرِ زیندانی حوكمدرابووین ، وەكو زیندانی ئاسایی مامەڵەیان لەگەڵدا دەكردین، ژنەكەی هات بۆلای و پێكەوە پێی دەووتم هەر كە ئەو ساتانەی بیردەكەوێتەوە دەسپەر ِدەكات، بەری ئەو سەردانە منداڵێك بوو، ئەو ئێوارەیەی كە گواستیانینەوە بۆ(تزمامارت) هەواڵەكەی پآ گەیشت و لە خۆشیاندا هەڵدەبەزیەوە. سووكە حیسابێكم كرد، بۆم دەركەوت كە منداڵبوونەكە دوای نۆ مانگ و دەرۆژ بووە لەسەردانەكەی بەندیخانە. بەڵام هیچ قسەم نەكرد و منداڵەكە بەر لەوەعدەی راگەیەنراو لەدایك بوو، سەرەڕای ئەوەیش، پەنام بردە گومان پێكردن بۆ ئەوەی وەڵامی ئەو هێرشەی ئەو شەوەی بدەمەوە كە لەلای خۆم نەبووم..(باشە، ئەگەر بەوە رازیت كە من كوڕی زینام! كە تۆ كوڕی خانەوادەیەكی خانەدانی، باوكت بەڕاستی باوكتە، هیچ گومانێكم لەوەنیە. بەڵام ئایا تۆ لەو باوەڕەیت كە كوڕەكەت لەپشتی تۆ هاتووە؟ باش بیرت بآ كە ژنەكەت دوای نۆمانگ و دە رۆژ منداڵی بووە. منداڵبوونێكی پێشوەخت نەبوو كە ئەوەی لێی بووەتەوە؟ دوای تۆ كەسێكی دیكە چووەتەلای.

(لەحسێن) لێم ببوورە، تۆ ناچارت كردم ئەو قسەیە بكەم.

- هەی خوێڕی تۆ باش دەزانی كە ژنەكەم لەخێزانێكی باشە و خۆشی دەوێم، ئیتر بۆچی ئەم قسەیەی بۆ هەڵدەبەستیت؟

- ئەمە هەڵبەستن نیە، تۆ خۆت هەمووشتێكت پیَّی وتم. بیرت بآ تەنانەت خۆت كەوتیتە گومانەوە پاشان بەسەر لەڤاندنێك و دەست هەڵتەكاندنێك ئەوەت رەواندەوە وسووربووی كە ناویشی بنآی(مەبروك).

- باوكت گەوادە..

- ئەم جۆرە مەسەلەیە پەیوەندیم پێوەنیە. بەڵام تۆ، گسكی گوشی، لە ئەكادیمیە نەقیبەكە سووكایەتی پێدەكردی و هیچت نەدەووت.

- فەرمانم بەجێدەهێنا.

- چۆن قوتابییەكی ئەفسەر لەخۆی رادەبینآ بازاڕی بكات بۆ ژنەكەی نەقیب، فەرماندەكەی خۆی؟ ئەمجۆرە مەسەلانە سەربازێك دەیكات، تۆ هیچ هەست بەكەرامەتی خۆت ناكەیت!.

- تۆیش هەی بەدبەخت، باوكت واسیتەی بۆ كردیت بۆ ئەوەی ببیتە ئەفسەری دوو ئەستێرە، بەڵام هەر بە مووئەهلی مایتەوە، چونكە تۆ بآ دەسەڵاتیت.

- نەعلەت لەبەرزبوونەوەو پلە.. لەخۆت بپرسە بۆچی پزیشكە رووخۆشەكە رێگەی دا بەژنەكەت سەردانت بكات، لەبەر رەشی چاوت بوو؟

- ژنەكەم شەریفە، دەشبینی چاوەڕێم دەبێت هەر كە لەزیندان دەچمەدەرەوە. بەڵام تۆ كە دەردەچیت كەس چاوەڕێت نابێت، تۆ كوڕی هیچیت، كوڕی ناجێگای، كوڕی زینایت..

- مێردی هەڵخەڵەتاو..
- بەکرێگیراو..
- گەندەڵڕ..
- هۆمۆسێکسواڵ
- بەخیل..
- کەرە..
- دەسپەڕچی، ..!؟
- کوڕی گوناه..

بەدرێژایی شەو شەڕە جنێومان کرد، ئەو یەکەم کەس هەرەسی هێنا و دەستی کرد بەگریان. منیش دەمویست دەست بەگریان بکەم، هێندە شەرمم بەخۆم بوو، لەبەر ماندوویی و بێزاریم بەرامبەر ئەو ئازارەی کە تووشی(لەحسێنی داماو)م کردبوو. هەستم دەکرد کە تاوانبارم، چونکە زۆر لەمن ناسکتر بوو، هەرچەندآ هەوڵمدایە دواجار داوای لێبوردنی لێبکەم و هەندآ مەسەلەی پآ بلێم بۆ ئەوەی دڵنیایی کەم، تا گەیشتە ئەوەی درۆبکەم، کە سوێندم بۆ خوارد کە خوشکە بچووکەکەم منداڵبوونی سآ هەفتە لەوادەی چاوەڕوانکراوی خۆی دواکەوت. بەڵام بێهوودە بوو،(لەحسێن) بەتەواوەتی تێکشکابوو، جنێوەکانم فەوتانبوویان، وەلێ ئەو جنێوەی کەپێی دام بەراستی کارتێ نەکردبووم، سەرلەنوآ بیرم لەباوکم کردەوە و کەچی بەسەرهێناوم. دێتە بەرچاوم کە دیسان لەبەر پێی پاشادا کەوتووە. تکووڵی لە کوڕە ناجسنەکەی دەکات کەخیانەتی لێکردو وای لێکرد کە پەیوەندی لەگەڵڕ خاوەن شکۆدا ناخۆش بآ. ئەوەبوو(لەحسێن) دەستی کرد بەووڕێنەکردن. ماوەی چەند مانگێک قسەی لەگەڵڕ کەسدا نەدەکرد، بانگی(مەبروکە)ی ژنی دەکرد بەشەوو بەرۆژ. کاتآ لەقورئان خوێندندا دەنگمان بەرزدەکردەوە، بەبڵمە بڵمەوە ئەویش دەیووتەوە، بۆ ئەوەی ریتمی قورئان خوێندنەکە بشێوێنآ، بەدخووببوو، خۆی دابووە دەستی مەرگێکی لەسەرەخۆوە، هەر کە مەفازلڕ هەندآ داودەرمانی بۆ هێنا ، تکام لێی کرد کە روخسەتم بدات چەند سەعاتێک لەتەک(لەحسێن) لەزیندانەکەی بەسەر بەرم. ئەمەیش مانگی ئایار بوو. باوەشم پێداکردو ئیسپرینەکەم پێیدا زۆر لاواز ببوو، دەگریا(لێم ببوورە تۆ باش دەزانی ئەو پیاوەی کە شەوی 23ی نیسان 1987قسەی لەگەڵڕ کردین من نەبووم. ئەوە ئەهریمەنە کە دوای ئەوەی دێتە لەشمەوە، بیر وباوەڕە شەڕەنگێزەکانم داگیردەکات و دەنگم دەدزێت و تەقەلا دەدات ئازارت بدات، بەشبەحاڵی خۆم ئازارم دیوەو هێشتا تائەمرۆیش. خۆت بگرە، هەمووما‌ن لەم شوێنە دەردەچین. ژن و کوڕەکەت چاوەڕآی گەڕانەوەت دەکەن و نائومێدیان مەکە. بگرە، ئەم داودەرمانە بخۆ. دەبآ خواردن بخۆیت، هەمیشە(لەحسێن) هاوڕێتیمانت لەبیربآ لەئەکادیمیە پێکەوەبووین، هاوکاریمان لە(قونەتیەرە) تەنانەت لێرەیش، ئێمە لەسەر پشتی یەک بەلەمین. دەبآ خۆت راگریت، تکات لێ دەکەم، کۆچ نەکەیت. وازهێنانت لەئێمە پێم تەحەموول ناکرێت، ئەمە گرنگە، خەریکە بگەین، ئەوەی دەیبینم تۆ دەیبینی؟ پێم بلێ، تکات لێدەکەم، چاوت بکەرەوە، هەستەکانت واڵاکە، دایکت و ژنەکەت و کوڕەکەت دەوریەک بخووریان بۆ ئامادەکردویت، خۆیان ئامادەکردوە بۆ پێشوازی کردنت ماڵەکەیان بەسپی بۆیاخ کردوە هەمووچاوەڕوانتن. پێم بلێ، دەمەوآ لەگەڵتدابم، هاوڕێت بم بۆ ئەو ئاهەنگە، تۆ دەعوەتم دەکەیت، وانیە؟ دواجاریش

**پێکەوە دەچین بۆ مەکە. سوێند بێ کە هاوڕێتیت بکەم، تۆ لەسەرتە تەنها ئەمە قبووڵ بکەیت، من بۆ گەشتێک دەعوەتت دەکەم، سواری فڕۆکە دەبین، لەقاهیرە دادەبزین و دەچین بۆ سەردانی ئەهرامەکان. دەتبەم بۆ ئەو چایخانەیەی کە (نەجیب مەحفوز) لێی دادەنیشێ. لەگەڵیدا چەند وێنەیەک دەگرین، پاشان بەمەرجی ئاسایی فەرزی حەج جێبەجێدەکەین، نەماندووببون، نە نەبوونی، خۆت بگرە).**

**زۆر بەزەحمەت فرمێسکەکانی سڕیەوە. توانی ئەم وشانەی خوارەوە دەرببڕێت:**

**(ئەمە راستە، لەوانەیە کوڕەکەم لەپشتی خۆم نەهاتبێ، خۆم لەوە دڵنیام، تۆ لەسەر هەقیت..)**

**- بەڵام، نەخێر، نەخێر، نەخێر، مەبەستم تەنها ئازاردانت بوو، بڕوام نەبوو بەوەی کە دەمووت.(لەحسێن) تکات لێدەکەم، لێت دەپاڕێمەوە، لێم ببوورە. ئەم چیرۆکەم هەڵبەست بۆ ئەوەی وەڵامی ئیستیفزاز کردنەت بدەمەوە. کوڕەکەت لەپشتی خۆت هاتووە. ئەو چاوەڕێتە. بێ ئومێدی مەکە، دەبێ ئەم جێگایە بەجێی بێڵی، ئەوجا دەبینی، هەرکە ئێرە بەجێدێڵی ئەم هەمووەت لەبیردەچێتەوە.**

**دەستی کرد بەگریان.(لەحسێن) لەباوەشم دا رۆحی دەرچوو، بەتووندی نووسانم بەخۆمەوە و چەند ئایەتێک قورئانم بۆ خوێند، ئوستاد زانی(لەحسێن) مرد و بەدەنگە خۆشەکەی ئایەتی قورئان بۆ خوێند.**

(29)

**ئەوەیش لە من روویدا کە وەکو کەسایەتی(کامۆ) بیرم کردەوە،(ئەگەر بەندم بکەن.. نەخێر.. ئەگەر بمخەنە ناو پوازی درەختێکی وشکەوە بژیم... درەختێکی بەتەمەن، ئەوەی کە(موحا) تیدا نشتەجێیە، هیچم نابێ مەشغووڵم کات، جگە ئەوەنەبێ کە چاودێری گوڵی ئاسمان بکەم لەسەری سەرم، بەرە بەرەش لەمەسەلەکە رادەهاتم..) و سووڕانەوەی چۆلەکەم دەبینی.. نەخێر.. مەسەلەکە مەسەلەی چۆلەکەکان و هەورو بۆینباغ بوو.. هەمووشتێ لەسەرمدا تێکەڵ دەبێت، بەڵام دەزانم گوڵی ئاسمان ناکرێ ببێتە(سیببیت)، چۆلەکەی منداڵیم، درەختی ووشکیش کۆمەڵە بەردێکی تەڕە، تەنێک چەمەنتۆیە و ئاسمانم لەبیردەباتەوە. لەهەرکاتێکی دیکە زیاتر هەستم کرد گەڕانەوە بۆ ئیمان پێویستە. لەدوای نوێژ لەنقووم بوونی تێڕاماندا دەمامەوە، مەرگی(لەحسێن) زۆرکاری تێکردم، دەهاتە خەم، لەمێرگوزارێک دا دەمبینی بەختەوەرە بوو، ژمارەیەک منداڵ لەدەوری بوون، ژنەکەیشی لەتەنیشتی بوو، قەپی لەسێوی سوور دەدا هەرکە بەئاگادێمەوە لەبەرخۆمەوە دەپرسم ئەو خەونەی دیتم واتای چی بوو، مردوو بەختەوەرە، لەوانەیە دەبێ من بم کە ویژدانم ئازارم دەدات تارادەیەک تەقەلای ژیان دەدەم بۆ ئەوەی(لەحسین) لێم خۆش بێت، سەرلەنوێ پەنام بردەبەر دوو فریشتە پاسەوانەکەم کە ناویانم نابوو: عەلی و عەلیلی. هێندە لەنوێژکردندا نقووم ببووم بانگیانم دەکرد و قسەم لەگەڵدا دەکردن:(مادامێکی لێرەن، ئەمەیش واتای ئەوەیە کە خوا نایەوێت دەسبەردارم بێت، دواجار دەشزانم، کە مادامێکی هەردوکتان لەبەردەممدا، من نەمدۆڕاندوە).. لەوێ هەردوکیان بەبێدەنگ وەستاون. زیکری خوام دەووتەوە، هەموو ئەو ناوانەیم دەووتەوە کە دەمزانین، دووبارەم دەکردنەوە، زۆر رەحمان و رەحیم و عەلیم و قەدیرم دەووتەوە،(عەشار) دڵنیا نەبوو کە بەچیپەوە گوێم لێ بگرێت، ئەو پێی وابوو بەمە دژی پیلانی لێ دەکەم. لێی**

دەپرسیم کەچی دەڵێم  و دوعاکردنەی پێ دەبڕیم، دەنگم بەرزدەکردەوە بۆ ئەوەی تێی بگەیەنم کە وەڕزم دەکات، ئەویش دەستی دەکرد بەنوێژ خوێندن، بەڵام لەبەر ئەوەی دەقەکەی نەدەزانی، بۆیە بڵمە بڵمی دەکردو پاشان دەوەستاو داوای لێ دەکردم لەقورئان خوێندن یارمەتی بدەم(ئوستاد) یش لەکاتی شیاوودا خۆی تیاهەڵدەقورتاند.

خۆشبەختانە خوێندنەکەی بۆ راست دەکردەوە. نقوومی نوێژکردن بووم کە(مەفازلر)بە داردەستەکەی دای لەدەرگا زیندانەکەم، هێشتا کاتی نان خواردن نەهاتبوو، دەرگاکەی کردەوە و پاکەتێک دەرمانی هەڵدا کەدوو پارچەی تەواوی تیابوو. دەرگاکەی(عەشار)یشی کردەوە و پێی وت:(ئەو پارچەیە حەبی ئازارە، باش بزانە، کەمن ژیانت رزگار دەکەم).

(عەشار) بەئێرەییەوە وتی:

- بۆچی بەویترت دا؟
- چونکە شایانی ئەوەیە بیدرێتێ، هەی گەمژە!
- بەڵا، بەڵام من دەمێکەو داوام کردوە.
- ئێ چ فەرقێکی هەیە؟ گوێم لەقیژەت بێ لێتی دەسنمەوە.
- نەخێر، نەخێر، سەرنجێک بوو، تەنها سەرنجێک بوو..

لەو رۆژەوە حەزم بە تێهەڵدانی(عەشار) دەکرد، پاسەوانەکان دەرگای هەموو زیندانەکانیان کردەوە سەرەڕای تاریکی تا سەردانی یەکدی بکەین، کزە رووناکیەک لە دەروازەکەوە دەهاتە ژوورەوە، لەبەرهۆیەک بوو نەماندەزانی عەشار بەتێهەڵدان و جنێو کەوتە گیانی(واکرین) (کوڕی قەحبە، ئەمەت بەسەرەوە ناچێت، لەناوت دەبەم، لەناوت دەبەم.. هەوڵماندا بەهەموومان لەیەکیان بکەینەوە، بێ ئەوەی پرسیارمان لێ بکات، مەفازلر فەرمانیدا(عەشار) لەزیندانەکەی خۆیدا بەند بکرێت، بۆماوەی دوومانگ مەفازلر هەموو رۆژی هەینیەک نیوسەعات مۆڵەتی دەداینێ بۆ ئەوەی لەهەیوانەکە پیاسەبکەین ، بێ ئەوەی دەرگای زیندانەکەی(عەشار) بکاتەوە و بێ ئەوەی هیچ رووداوێک تۆماربکرێت..)

رۆژێکیان بەدەم ودوویەکە ملکەچەوە پێی ووتم:

- پێم بلێ لەگەڵر خۆتدا دەمبەیت بۆ مەکە؟ گوناهی زۆرم هەیە دەمەوێ لێی پاک ببمەوە.  و داوای لێخۆش بوون دەکەم، پەیمانم دەدیتێ؟ بلێ، تکات لێدەکەم، ئەم داواکاریەم رەت مەکەرەوە، من خراپ و بەخێل و نەفامم..

- باشت دەناسم، هەر کەلێرە دەرچوویت یەکەم شت کە دەیکەیت دەچیت بۆ لای سۆزانیەکان، بۆیە توخوا بەس پیسایی نەفامیەکەت لەم چاڵە تاریکە بلێوبکەرەوە و وازبێنە لەسەولر لێدان.

- ئەوەی دەیڵای راستە، تۆ باشم دەناسی. دڵنیام کە ژنەکەم چاوەڕێم دەکات، هەر کە دەردەچم پیربووم بۆیە بەراشکاوی پێت دەڵێم هەرکە لەم شوێنە دەرچووم بەزیندووی کیژۆڵەیەک دەخوازم لەکیژانی شارەکەم.

- باشت کرد، کیژێکی بی تاوان تەمەن منداڵتر لەبچووکترین منداڵەکانت!
- هەڵە لەوەدا چیە؟ ئەمە ژیانە.

- عەشار، حەزم لێ نیە قسەت لەگەلڕدا بکەم، تۆ کەسێکی قێزەوەنی..

ناچاربوونم بەتەحەمولکردنی کەسێکی وەکو(عەشار) مەسەلەیەکی ماندووکەر بوو، خۆتاً هەڵقورتاندنە یەک لەدوای یەکەکانی وەرزشی تێرامانمی دەشێواند. ئیدی دوو فریشتەکە دوعاکەیان قبوولڕ نەدەکردم، هەستکردنم بەبوونیان لەدەست دابوو، لەگەلڕ وەختدا تووشی تەلەفبوونی جەستەیی و زەینی بووم، لەبەر ئەو نارەحەتیانە هێزی ووردبیریم نەما، زیاترو زیاتر تاقەتی پەنابردنە بەر جیهانی رۆحانیم نەما، لەکەم ئیرادەیی نەبوو، بگرە ماندوو بووم، تا ئەمرۆش بەدەستی شوێنەواری ئەو تەلەفبوونەوە دەناڵێنم، هێشتا بەزەحمەت دەخوێنمەوە و دەنووسم و ناتوانم لەچەند خولەکێک زیاتر زەینی بخەمەسەر، دەبوو نە ڕقم لەعەشار بووایە نە لە هەر کەسێکی دیکەیش، وازم هێنا لەوەی کە عەشار بخەمە کرۆکی بایەخدانی خۆمەوە و، گوێزامەوە بۆلای کەسانی دیکە لەپێشیانەوە باوکم بوو، بینیم کە دیشداشەیەکی ئاوریشمی لەبەرە، وەکو ژن بۆنی لەخۆی داوە، دڵی خۆشە، هەردووگۆنای سوورن، ریشی تاشیوە، جەستە پڕ وقەڵەو نیە، هەنگاو سووک، وەک بڵێی رێ ورۆیشتنی کەسێکی ئامادەیە کە هەمیشە لەبەردەم پاشادا بچەمێتەوە، چاوی نووقاندوە، زمانی ئامادەیە، هەموو پایەیەک بە هەلدەزانآ بۆ دەرپەڕاندنی وشەیەکی پڕ لەهێماکە بتوانێت بزیەک دەربێنآ، یان، ئەگەر دڵخۆش بووایە کە پێکەنینێک لەخاوەن نازو نیعمەتەکەیەوە بەرکەوێت. دەمبینی و بزەم دەهاتآ.

چۆن دەتوانم رقم لەپاڵەوانێک بێت کە لەبەلاتەو لەژیانە؟ بۆ باوکێک کە بیری ناکەوێتەوە خێزانی هەیە. لیبۆک نەبوو چونکە هیچ شوێنەواری تراژیدیایەک بە کەسایەتیەوە دیار نەبوو. ئەو گوێنەدەری دڵنیایە، حەزی لەبەلات و ئەمیرەکانە، دەمبینی و لێدەگەڕام وەکو خەیاڵێک بەژیانمدا تێپەڕێت. لام ئاسان بوو کە رقم لێی ببێتەوە، بیبوغزێنم و حەزی تۆڵەسەندنەوە لێی لەناخی خۆمدا گەشەپآ بکەم. وەلێ ئەو ئاسانیە بەتەڵە دەوردرا بوو: بەچیرۆکی وردەکاری رقبوونەوە دەست پی دەکات و بەوە کۆتایی دێت ببێتە ژەهرێک و لەخوێنەکەتدا بگەڕێت و بتکوژآ. دوای باوکم چەندین خەیاڵم دەبینی، ئەو تارمایانەی کە پەلکێشیان کردین بۆ ئەم ئەزموونە بەدە، هەموویان نەمردن، هەندآ ئەفسەریان مایەوە توانیان سەری خۆیان بپارێزن، چونکە گەمەی سەرلێتێکدانیان کردبوو، رقم لەوانەیش نابێتەوە، بەراستی خوێڕی بوون، دوژمنم نەبوو، نەمهێشت هیچ مەیلێکی خراپ لەناخمدا زالڕ بێت، هەستم کرد چەند ماندووبوونە کە کاتی خۆم بەپارچە پارچەکردنی ئەو کەسانە بەرمەسەر کەبوونە هۆی ئەم رادەیەی ئازارم. سوور بووم کە ئەو هەمووە پشت گوآ بخەم، بەمەش لەهەموویان رزگارم بوو، وەک بڵێی هەموویانم کوشت و بآ ئەوەی دەستم خوێناوی بێت. بآ ئەوەی تا هەتا هەتایە ئەو ئارەزووە بجوومەوە لەناخمدا بۆ ئەوەی تووشی ئەو دەردەسەریەبن بەدەستیەوە دەمناڵاند، مەبەستم بوو بە شێوەیەکی بنەبڕ مەبەستم بیرۆکەی تۆڵەسەندنەوەی دووربخەمەوە، بکەومە ئەودیوەوە، وبایەخنەدان بەو خەمانە، ئەو تۆڵەسەندنەوەیە کە بۆنی مەرگێکی رۆچووی لێدێت و گرفتەکە چارەسەر ناکات، کەسم نەدۆزیەوە کە رقم لێی ببێتەوە، ئەمەیش سەرلەنوآ نیشانەی حاڵەتێک بوو خۆشەویستربوو لەنێوان حاڵەتەکان: پیاوێکی سەربەست بووم.

(30)

**سەرەڕای گریمانەی دزەکردنە تەگبیرکراوەکە لەلایەن دەسەڵاتەوە لەبەر هۆی سیاسی، هەمیشە لەخۆم دەپرسی: چی پاڵی بە(مەفازلڕ)ەوە نا سەرۆکی پاسەوانەکانی بەتەمەنتر و قسەرەقتر، کە نامەکان هەڵگرێت بۆ دەرەوەی گرتووخانەکە، بەمەیش ژیانی خۆی و ژیانی ژێر دەستەکانی بخاتە مەترسییەوە؟ چڵێسی پارەو پوول، چاوچنۆکی، پارەیەکی زۆری دەست دەکەوت بەو خزمەتانەی کە پێشکەش بە(واکرین)ی دەکرد. وەلێ ئێمە هیچمان نەبوو بیدۆڕێنین، ماوەی حەڤدەساڵە ئێمە لەو چاڵی مەرگە لەسەرەخۆیین، لەژێر چاودێری پاسەوانەکاندا، چەند عادەتێک لەنێوانماندا دروست بوو، ڕۆتین تەشەنەی کرد، تەنها مەرگ نەبێ کە ماوە ناماوەیەک بەریتمی ئەو ژیانەوە دەهات، (مەفازلڕ) یش ئەو مەسەلەیە بەهەل دەزانێ، ئێمەش پەنامان بۆ (واکرین) دەبرد، بۆ ئەوەی لەڕێگەی ئەوەوە زۆرترین زانیاری بنێرینە دەرەوە، گوێمان بەئاگایی و وریا بوون نەدەدا لەبەر دابڕانمان لەگەلڕ ئەوەی کە لەدەرەوە ڕوودەدات، گرنگ ئەوەبوو هەندێ داودەرمانمان دەست کەوێت. سەرەڕای هەموو شتێک، ماقوولڕ نیە کە مانەوەمان هیچ واتایەکی هەبێت، ئەمەیش ئەنجامی سەقەتیەکە، بەلای هەندێکەوە واتای گیانەڵایەکی درێژخایەنە، لەلای هەندێکی دیکە ڕەواڵەتی ژیانێکی تەزیوە لەشوێنە سادەکان لەو شوێنەی دەرمانێک قووت دەدرێت هەرچۆنێک بێت، کە ئەمەیش ڕووداوێکی گشتی جیایە. پەنامان بەرێکەوت بوو، بۆ ئەوەی موعجیزەیەک لەو چاڵەدا ڕووبدات کەتیدا بەرە بەرە ژمارەمان کەمی دەکرد. ئیدی ڕۆژمێرەکەمان نەما، بەندۆلەکەمان بەبێ ئاگادار کردنەوەیەکی پێشینە گیانی دایە دەستەوە. عەبدلکریم کە پێمان دەووت(کەریم) بەبێدەنگی مرد لەبەر لاوازیی و بەدخۆراکی، ئیشتهای خواردنی نەمابوو، ئەمەیش نیشانەیەکی خراپ بوو. سەرەتای کۆتایی بوو، بەر لەوەی حاڵەتی تێکچێ ت داوای لێکردم جێگای بگرمەوە، منیش ئەوەم کرد، بەڵام بە بەشێکی کەمتر لەسەرکەوتن، منیش خاڵی زانینی خۆم لەدەست دابوو، ڕۆژەکانم تێکەلڕ دەکرد، لەوەیش(فەلاح) ژمارە(14) یارمەتی دەدام پلەی یاریدەر بوو، هەر بەنەخۆشی هاتە زیندان و هەر بەتەن نەخۆشیش مایەوە، ئەرکەکەمان دابەشکرد، ئەو سەعاتەکانی دەژمارد منیش ڕۆژ و مانگەکانم دەژمارد، فەلاح کابرایەکی وریابوو، کورتە باڵا بوو، لاوازبوو، بەدەستی ژەهرێکەوە دەیناڵاند کە ژنێک دەرخواردی دابوو، دەیووت(من بخۆرم و ئەو ژنەیش کێکی بەهەنگوینی دامێ شێخی جادوبازەکانیش خۆشترین ژەهری تیاکردبوو، ژەهرێکە کەس ناکوژێت، بەڵکو دەبێتە هۆی زۆر لەنەخۆشیەکان..**

- **ئایا تۆ دڵنیایت کە زیندان هۆی نەخۆشیەکەت نیە؟**

- **لێرە نەخۆشی لە ئاسانترین ڕێگاوە گەشە دەکات. میزەکەم خوێنە، زۆرجار کێم لەمزەکەمدا بەدی دەکەم، ماوەی حەڤدە ساڵە ئامێرەکەم بەکار نەهێناوە، ئەمە تەفسیری چیە؟**

**فەلاح بەلای منەوە وەکو تاقی کردنەوەیەک وابوو. جەستەی تووشی ئەهۆنترین نەخۆشی دەبوو، هێشتا بەرگری دەکرد، داوای داودەرمانی لێدەکردم..**

- **چ داودەرمانێک؟**

- **هەرچیەک بێ فەرقی نیە، مەبەست دەپێکێ، هەموو جەستەم دەیەشێت.**

**واکرین هەندێکی بۆ نارد، هەمووی بەجارێک قووت دا، ئەو دەمەی لە(قونەیتەرە) بووین. مافی ئەوەمان هەبوو بچین بۆ خەستەخانەکەی بەندیخانە، داوای حەبی ڤالیومی کرد، بڕێکی ئەوتۆی لێ خوارد، هەستم کرد کە خۆی دەکوژێت ، بەڵام شتی وانەبوو، جادوی ژنەکە کاری تێکردبوو هەوڵی دەدا بەڤالێوم بەرگری بکات. هەرکە گەیشتینە(تزمامارت)**

دەرمانی هێورکەرەوەی لێ قەدەغەکرا، ئەوسا پێم وابوو کەتووشی دڵ وەستان دەبێت، بەڵام توانی خۆی بگونجێنآ، گەرچی ئەنجامی ئەوە دەینالآند، بەڵام بۆکەس گازندەی نەکردبوو، لەوانەیە ئەو زیندانیکردنەیشی لەچاو ئەودا بەشێک بوو لە پیلانی(جادوەکە)..

(ئەو ژنەی پێی دەوتم و سوێندی دەخوارد دەبآ شتێکم لێ بکات، سەرکەوتوو بوو لەوە، وریای ژنانی خنەیفەرە بە! ئەوان زۆر دڵرِقن، دەیویست بیخوازم، خەیاڵی ئەوە بکە سۆزانیەک هەڵیبژاردوم بۆ ئەوەی ببمە مێردی؟ کێشەکە ئەوەبوو دەچووم بەلانی کەم لەزۆربەی مۆڵەتەکانمدا بۆ لای، عادەتی تایبەتی خۆم هەبوون، بەر لەئێوارە دەرۆیشتم بەتەنیا لەگەڵمدا دەمایەوە چای بۆ دروست دەکردم، پاشان قابێک وێسکی بۆ دەهێنام و دەمانخواردەوە، بەر لەشیووی ئێوارە سێکسم لەگەڵیدا دەکرد، لەکاتی شێواندا لەچاو وون دەبوو، پاشان لەشەودا چەندجارێک سێکسم لەگەڵدا دەکرد، هەر کەدەمویست پارەی بدەمآ تووڕە دەبوو و بەرشەقی دەدام، رۆژێکیان پێی وتم کە لەو زیاتر پێشوازی پیاوی دیکە ناکات و من تاقە پیاوی ئەوم، هەڵیبژاردوم و پاک بووەتەوە لەگەڵم، ئەو خانووە گەورەیەی بەجێهێشت کە لەگەڵ سۆزانیەکانی تر لێی نیشتەجآ بوو، گواستیەوە بۆ خانوویەکی بچووکتر و لەوآ نیشتەجێیە، لەلای من نەبوو کە سۆزانیەک بخوازم، لەسێدارە نادرێت ئەگەر کەسێک بۆتی باس کات بۆچی، شوورەیی، ریسوابوون، باشتر بوو کە خۆم بدزمەوە، لەبەرچاو وون بم، بەڵام بەدبەختم، مەسەلەی لەوجۆرە بە مێشکمدا نەهات، بەهەرحاڵ ئەوەی بوو، بوو. بەرهەمی نەخۆشیداری بۆ تیاچاندم، چووم راوێژم کرد بەجادوبازێکی دوعا نووس، ئەو هەمووشتێکی پآ ووتم، بەڵام باشتر وابوو راوێژی ژمارەیەک پزیشکم بکردایە، سەرەڕای ئیشی جادوبازێک کە بەهێواشی خۆی خستووەتە ئیشی جادوبازێکی دیکەوە، چونکە کاری جادو بازێک ناکرێت بەتاڵ بکرێتەوە ، جگەت بەکاری جادوبازێکی دیکە نەبآ، بەڵام کاتم بۆ نەڕەخسا(هەرمومو) مان بەجێهێشت بۆ مانۆڕکردن، بەڵام ئەوەتا ئێمە لێرەین).

بۆم راست کردەوە ووتم:(مەبەستت کۆدەتای سەربانەیە؟)

- کۆدەتای سەربازی چی؟ هەر لەبەیانی زووەوە دەرچووین بەرەو بۆزنیکا بۆ مانۆڕکردن..

- بەڵام دەزانی بۆ ئێمە لێرەین؟

- بەڵآ هەموومان جادوومان لێکرا.

- فەلاح ، گاڵتەمان پێدەکەیت؟

- کآ؟ من؟ هەرگیز، یەکێک لەو شتانەی کە لەدەستم داوە، ئەویش ئەوەیە کە توانای گاڵتە پێکەنینم نەماوە. لەوەتەی ئەو مادانەی دەرخواردداوم ئەو ژنە توانای پێکەنینم نەماوە. ئایا منت بەپێکەنین بینیوە؟

- نەخێر، تۆ راستەکەیت، کآ لەم چاڵەدا پێی باشە پآ بکەنێت؟

دڵنیابووم کە نەخۆشیەکەی فەلاح ترسناکە. سوزەیەک دەبێتە مایەی شێتی، بیری لەدەست نەدابوو، بەڵام هەست کردنی بەوەی دەوروبەری لەدەست دابوو، بۆیە بڕوام بەپەندۆلەکەی نەبوو، ئەوەبوو خۆم سەعاتەکانم دەژمارد، شێتیەکەی دیارنەبوو، ئەو بەرووختەیی قسەی دەکرد، بەڵام لەکاتی قەسەکردندا شتی ناحاڵی دەووت:

(خەدیجەم باش لەبیرە، لە مێشكم دوورناكەوێتەوە، دەیووت مەمكەكانی گەورەن، چەند حەزم لەمەمكی گەورەیە، چاوەكانی رەش بوون كاتێ پێدەكەنی كوڵمەكانی دەلەرینەوە. پاشان ئەسپەكە سەركەوتە سەر منارەی مزگەوتەكە، لەوێوە میزی دەكرد بەوانەدا لەوێوە تێ دەپەڕین، بەڵا، ژەنراڵ سزای دار هەنجیرەكەی دا، هەموو هەنجیرەكانی لێكردەوەو دای بەخەدیجە. بەهەرحاڵ، ژەنراڵ باوكی كیژە گەورەكەیەتی، ئەو كیژەی كە دەرگاكەی بۆ دەكردەوە بۆ ئەوەی بچم بۆ مانۆڕەكان. باشم بیرە ئەو بەیانیەی كە سەگەكەی(رەبڵە)ی دراوسێمان قاچی نادر حەبووسی گازی، ئەو دەگریاو منیش پێدەكەنیم. خەدیجە نان و تووتنی دەداما، دەبێ حەشیشەم كێشابێ كە لەهیندستان یان لەچینەوە دەهات. زۆر توونددبوو، نەمدەزانی لەكوێم و چی دەكەم. ئەوە جادوە، گەمژەنیم. دەی، باوەڕ نەكەیت كە من گەمژە، نەخۆشم، هەموو نەخۆشیەكم هەیە، بەڵام دوای تەواوكردنی مانۆڕەكان لەهەموویان پاك دەبمەوە، ئەوەی لێرە دەیكەین مەسەلەیەكی چاكە، راتدێنن لەسەر بەرگریكردنی سەرماو گەرماو دووپشك و سیسركە. بەڵام، ئەگەر ژەنرال هەندێ دەرمانم بداتێ مەسەلەیەكی چاك دەبوو. دیارە ئەو بەدووربینێكی یابانی چاودێریمان دەكات، لەتاریكیدا دەبینی و، نیشانەی ئاستمان بۆ دادەنێت، لەلای خۆمەوە ئاستی من باش نابێت، چونكە خەدیجە رەتی كردەوە سێكسی لەگەڵ بكات. تۆڵەی خۆی دەكاتەوە. كاتێ پیاو ژەنراڵ بێت هەزار حیسابی بۆ دەكرێت، دەتوانێ چی بوێ بیكات، كەس پێی ناڵێ نەخێر، تەنها خەدیجە نەبێت، ئەم رەوشتەیم خۆش دەوێ گەرچی ئەزیەتی داوم.. هەركە لێرە دەرچین دەچم بۆلای و دووشتی پێ دەڵێم

1. ئافەرین چونكە رازی نەبووی ژەنراڵ سێكست لەگەڵدا بكات.

2. شتێكی باشت لەگەڵ مندا نەكرد، دڵنیام كە پەشیمان دەبێتەوە، چونكە ئامێرەكەم پەكی كەوتووە، سوودی تێدا نەماوە كاتێ میز دەكەم ئازاری توونددم دەبێت. ئەم هەمووەی پێ دەڵێم، بەڵام پێم بڵێ تۆ هەمووشتێك دەزانیت: مانۆڕەكان كەی تەواو دەبن؟.

- بەم نزیكانە، فەلاح، زۆر بەم نزیكانە..

- لەگەڵ خۆتدا دەمبەیت بۆ خنەیفەرە بۆ دیتنی خەدیجەی جوان؟

- بەتەئكید، دەتبەم بۆ ئەوێ و پێی دەڵێم ئەوەی لەگەڵ تۆدا كردی مەسەلەیەكی خۆش نەبوو.

- تۆ، تۆ برادەری منی، پێم بڵێ ئێستا سەعات چەندە؟

- بەڵام تۆ پاسەوانی پەندۆلەكەی!

- ئۆە، راستە، لەبیرم چوو، بەڵام چ پەندۆلێكت مەبەستە؟

- پەندۆلی بەندیخانە..

- ئاە، تۆ مەبەستت پەندۆلی سەربازگەكەمانە! پەكی كەوتووە دەمێكە، دەبێ چاكی بكەمەوە. لەژیانی مەدەنیمدا سەعاتچی بووم، باوكیشم سەعاتچی بوو. چوومە سوپاوە بۆ ئەوەی سەعاتی ژەنراڵەكان چاك بكەم. ئەی سەرنجی ئەوەت نەداوە كە ژەنراڵەكان هەمیشە لەنوێژكردن دوادەكەون؟ چونكە ئەوان سەعاتی ئاڵتونیان پێیە، ئاڵتوون لەگەڵ كاتدا ناڕوات، باشتر وایە مرۆڤ سەعاتی پێ بێ كانزای رووت بێت، بەمەیش ووردەكاریەكەی مسۆگەر

**دەکات، باوکم ئەمەی فێرکردم، لەسەردەمێکی زوودا..لەسوپادا خرامە خزمەتی ژەنراڵەکانەوە، لەکاتێکدا دەمویست بایەخ بەکات بدەم، زۆرم لێکردن، گەزاف لێدانەکانمیان بەهەند وەرنەگرت، پێم بلێ، ئایا باشم کرد کە خەدیجەم نەخواست؟**

- **بەڵێ، فەلاح، باشت کرد.**

- **کاتێ دەچین بۆ مانۆڕ باش نیە لەدوای خۆمان ژن بەجێبهێڵن.**

**بەتایبەتی ژنێکی وەکو خەدیجە، تووشی پێکان دەبین، وابزانم بریندار بووم. دەبێ گوللەیەک بەرسکم کەوتبێ یان لەژێری.**

- **لەوانەیە. تۆ دەزانی، مانۆڕەکە بەتەقەمەنی زیندوو بوو.**

- **ئاە، بەڵێ، ئەمەم باش لەبیرە، لەئێوارەدا فەرماندەکە بەپێکەنینەوە پێی ووتین(مانۆڕەکان بەتەقەمەنی زیندوو) ئەمەی چەند جارێک ووتەوە، پاشان هەمووماں پێکەنین. بەڵام تۆ پزیشکە فەرەنسیەکەت لەبیرە کەهات بۆ بازنەی ئەفسەرەکان و، بەگاڵتەوە وتی(ئایا کۆدەتایەکی سەربازی ئامادە دەکەن؟) نەقیبەکە وەڵامی دایەوە و پێی وت(نەخێر، خۆمان بۆ مانۆڕی گرنگ ئامادە دەکەین).**

- **بەڵێ چاک ئەوەم لەبیرە، تۆ ئێستا دەبینی کە جگە لەمن لەوێ کەسی دیکە هەبوو لەبارەی کۆدەتای سەربازیەوە قسەی کرد.**

- **بەڵێ، بەڵام ئەنجامەمان نەدا، پیاوەتیەکی ئەوتۆمان نیە تا ئەوەبکەین بەڵام دەربارەی پیاوەتی لەوەدا خێرم تێدانیە، پیاوەتیم بەکەڵکی هیچ نایەت، چونکە خەدیجە گەستوویەتی و هەموو خودو رۆح و ژیانمی قووتدا.**

- **کاتێ لێرە دەرچووین و مانۆڕەکانیش تەواو بوون، دەچین بۆلای حاجی ئیبراهیم، فەقێیەکی بەتوانایە بۆ بەتاڵکردنەوەی جادو و بەدبەختی، دەبینی فەلاح کە هەموو شتێک بەسەر خەدیجەدا دەشکێتەوە، ئەویش شێت دەبێت.**

- **ئۆە، بەڵێ، برادەرەکەم، دەبێ بەزۆر مێشکی کەمتیاری دەرخوارد بدرێت، پیرەمێردێکی دەشتەکی دەناسم لەبازاڕی مەراکیش دیفرۆشێ، ئەگەر سێکسی لەگەڵدا بکەم بەدرێژایی تەمەنی نەخۆش دەکەوێت.**

- **بەڵام نەخۆشیەکە تووشی هەموو ئەوانە دەکات کەسێکسی لەگەڵدا دەکەن، ئەمەیش راست نیە، دەبێ ئەوە نەکەیت.**

- **تۆ راست دەکەیت، ماسیم دەوێ..**

- **فەلاح شەوی بەدەم داواکردنی ماسیەوە بردەسەر بەگوزارشتی عەرەبی و فەرەنسی هاواری دەکرد لە جۆری قورس . ئەو ژمارەیەک گوزارشتی دەزانی کەسێکسی تێکەلڕ بەئایین دەکرد.**

**هەر ئەوشەوە گوێم لەقیرەی جەنازەیی بایەقوشەکە بوو، لەبەر خۆمەوە ووتم:(وەختی رزگاربوونی فەلاح نیزک بووەتەوە). بەڵام(فەلاح) نەبوو، عەبدوڵا بوو ئەفسەری دوو ئەستێرە و مەشق دەربوو، وەک من وابوو، ئەوەبوو دوای چەند هەفتەیەک بەهۆی سکچوونی بەردەوامەوە مرد، هەرگیز باسی ئەوەی نەکردوە کە تووشی ببوو، رۆژ لەدوای رۆژ**

خودی خۆی بەتاڵ کردبووەوە و پیسایی بەخۆیدا دەکرد و ئاگام لێ نەبوو، هەرگیز بۆنەکان ئاگاداریان نەدەکردینەوە بەو نەخۆشیانەی کە لەنێوانماندا بلێوببووەوە. مەرگ بۆنی هەبوو. تێکەڵەیەک لەئاوی لێخن و سرکە و چڵک وکێم بوو، تێکەڵەیەکی ووشک و تیژبوو. قیرەی بایەقوشەکە هەمیشە لەهاوشانی ئەو بۆنە کەسکوونە بوو، هەر بەهەست دەمانزانی، پێویستی بە تەئکیدکردن نەدەکرد، هەر کەبەیانیان پاسەوانەکان دەهاتن و نان و قاوەیان دەهێنا پێمان دەووتن:(تەئکید بکەن لەوانەیە کەسێک مردبێت)

فەلاح نەیدەتوانی میزبکات، ئەنجامی ئازارە رادەبەدەرەکانی مرد. لەقسەکردن کەوتبوو، وورێنەی دەکردو لەخۆیەوە شتی دەووت، وورتە وورتی دەکرد، هاواری دەکرد، بەهەردوو پێی لەدەرگاکەی دەدا، پاشان شەو غەڵبە غەڵبەکە نەما، سەیر لەوەدابوو باڵندەکە پێشبینی مەرگی نەکردبوو، ئەوشەوە گوێمان لەقیرەی شوومەکەی نەبوو.

(31)

لەسەردەمی سەرەرۆییدا، زیادەرۆییم دەکرد لە هەڵسەنگاندنی خۆم، قۆناغەکانم دەسووتاند، ئەو رۆژانە ژیانی بەلای منەوە تەنها بەداهەتێکی جوان و هەروەها مەسەلەکەیش بەختەوەری بوو. هەڵە بووم، شتێک نیە بۆ خود باسی بکرێت لەچاوی کەسانی دیکەوە، بێجگە لەوە ناخۆشی بیابان برین و شەوگار. وام لەخۆم کرد کە ئەزموونێک بژیم بەبێ گازندە. تەنها لۆمەی خۆم کرد لەسایەی بێدەنگی نێوان دوو نوێژدا، نوێژم بۆ خوا دەکرد بێ ئەوەی بزانم چی روودەدات و ئەوەی کە دەتبات بۆ نوێژکردن، لەبەرامبەردا رچاوی هیچم نەدەکرد. لەسایەی نوێژەوە دەگەیشتم بەچاکترین شت لەوەی کە لەخۆمدایە بەتەوازوعەوە بەرە بەرە لەجستەی خۆی جیادەبێتەوە و لێ دوور دەکەوێتەوە بۆ ئەوەی نەبێتە کۆیلەی ئەشکەنجەو شەهوەتی وورێنەکانی. ئەو فەرزانەم بەجێدەهێنا کە لەسوودی موتڵەق پاک بوونەتەوە، بەپێچەوانەی ئەو ئەولیانەی کە لەگەڵ خوا وپێغەمبەرەکانیدا خشتەی ئەژماری وانەکراو دەکەن. بڕوا بوون بەخوا و سوپاسی رەحمەتی و زیکرکردنی و نەمرکردنی روحانیەتی، ئەم هەمووە بەلای منەوە پێویستیەکی سروشتی بوو، بەرامبەریشی هیچم ناوێت. هیچ شتێک هەرگیز هەر ئێستا گەیشتمە وازهێنان لەزوهد کە دڵدانەوەیەکی ئەوتۆم دەداتێ ، بووم بەکەسێکی دیکە، منێک کە لەمەوبەر بڕوام بەزیندەوەرێک هەبوو کە نەگۆڕبوو، رووبەرووی منێکی دیکە بووم کە لەهەموو کۆت و پێوەنێکی دەستکردی ژیان ئازاد ببوو، ئەمەیش بردنەوەی من بوو. لەوەتەی(لەحسێن) مردبوو پێش ئەوەیش ئەو شەڕە قسەیە بریندارکەرەی کە پێکەوە کردمان. هەستم کرد کە دەبێ خۆم بگرم، سەرلەنوێ رێگای بیری باڵا بگرم کە کۆتایی نایەت، دوعا بۆ رۆحێکی ئاڵۆزتر بکەم، شاراوەتر کە نشتەجێی گەردونێکە کە کلیل و نیشانەکانی لەلای منە. بەردەرەش ناوجەرگەی گەردون، بیری نیعمەت، قەشەنگی ئیمان، هەڵکشانی موتڵەق، ئەوە ئەو نیشانانە بوو کە رێگایان پێ دەگرمەبەر، دەبووایە هەندێ جاریش بوونی هەردوو پاسەوانەکەم بخستایەتە سەر و(سیبیبت) و بەداخیشەوە باڵندەی بایەقوشەکە کە بۆ رووداوێکی ناکاو دەیقیراند. بەدەنگی نزم نوێژم دەکرد، خۆم دەدەمە دەستی مۆسیقایەکی ناوەوە کە جمکی ئەو حاڵەیە کە تێیدام ، گوێم لەوە نابێت کە لەدەورم دەووترێت، ئازاری پشت و بڕبڕە جۆگای خۆیان هەڵدەکەنن، لەبەر ئەوەی خەریک بوو توانای تەرکیزکردنم نەدەما، پەنام بردە ئەو داوەدرمانەی کە مەفازڵ بۆی دابین دەکردم. بەردەوام دەبووم بە خویندنی بیروباوەڕەکانی سۆفیزم ، بۆ سووککردنی جەختی ئازارەکەم، تەنانەت هەندێجار بە دەرهێنانی خودم لەو جەستە ئەشکەنجە دراوە شێواوە و خۆڕاگرە سەرەڕای

**هەمووشتێک. پێش کۆتایی، جەستەم بەدەستی ویستی خۆم نابێت، چونکە ئەو بەجێمدەهێڵا، ئەوسایش بەسەرخۆمدا پەپکە دەخۆم و وەکو پشیلە دەخەوم، دەیگرم، خۆم زەویەوە دەگرم بۆ ئەوەی ڕێگای لێبگرم بۆ ئەوەی بە یەکجاری بەجێم نەهێڵا، توانای بیرکردنەوەم نابآ. توانای خەیاڵکردنی هیچ شتێکم نابآ. بەتالڕ دەبم، دەبمە گێڕیەک لەو چاڵە کە تا ئەمرۆ پانزە هاوڕێمانی قووت دا لەئەسڵی بیست وسآ کەس. هەمووشتێک سنووری خۆی هەیە، سەرم ئاقلڕ نیە، یان بەزۆر کار دەکات. هەژدەسالڕ تێپەڕی بۆ جارێکیش لە ئاوێنەدا سەیری سەروچاوی خۆم نەکردوە، کێم و لەکآ دەچم؟ هەر کەسەرکەوتوو دەبم بۆ بەرزکردنەوەی قۆڵم، بەئەسپای لەپم دەهێنم بەسەروچاومدا و، وەکو کوێر پەنجەکانم ئاگادارم دەکەنەوە، گۆناکانم لاواز بوون، رووەمەتەکانم زبرو هەڵزەپاو بوون و چاوەکانم چووبوون بەقوولآ، زۆر لاواز بووبووم.**

**پێویستم بەوە نەمابوو کە لەئاوێنەدا تەماشای سەروچاوم بکەم. بۆ چاکردنی ورد کاریەکە، یان، بەئاسانی، بۆ ناسینی خودی خۆم، بۆ دڵنیابوون لەوەی کە هێشتا ئەوکەسەم راهاتبووم کە ببم، ئەو عادەتە لە وونبووە، لەبیرکراوە، بەلامەوە هیچ نەبوو، چ سوودێکی هەیە کە مرۆڤ خۆی ببینآ؟ دەبآ مرۆڤ هەندآ خۆی خۆش بووآ بۆ ئەوەی کەسانی دیکەی خۆش بووێت. بەڵام من کەسم نییە تا خۆشم بوێت یان رقم لێی بێتەوە. ڕۆژێکیان ئوستاد لێی پرسیم، ئەو کزە ڕووناکییەی بەهەل زانی کەدەهاتە هەیوانەکەوە، ئەگەر سەروچاوی هێشتا لەشوێن خۆی مابآ، لەمەبەستی تێنەگەیشتم(مەبەستم ئەگەر سەروچاوم هەڵنەگەڕابێتەوە ئەگەر پشتەملم لەشوێنی گوێزەکەی گەردنم نەبێت؟.)**

- **دەتوانی بزانی ئەگەر بەناو لەپت دەست بدەیت لەسەروچاوت.**

- **نەخێر، نەخێر، ناتوانم، چونکە دەستم هیچ هەستکردنێکی بەشت نەماوە هەستی لامیسەی لەدەست داوە، بەڵام ئەمە ئازارەکانی لەناو نەبرد. پێی وتم:"من لەناوەوە ئازارم هەیە، بەتایبەتی دلڕ وسنگمی قورس کردووە، تووشی گومان دەبم، کتێبی ئازیز دەخوێنمەوە، لەخوا وپێغەمبەر(د.خ) دەپاڕێمەوە. پاشان لەخاڵی سەرەتاوە دەمبینیتەوە بەتەنیا و بەجێماو لەگەلڕ چارەنووسی خۆمدا، دەکەومە ناو ئۆقیانووسی کتێبەوە، ئەو ئۆقیانووسەی کە بەبآ کەنارە. لەدەوری خۆم دەئاڵێم، خەریکە دەخنکێم بەلافاوی ئەو وشانەی کە یەکگرتوو نین، لەهەناومدا هەست بەئازار دەکەم و ژانە سەر و نازانم چی بکەم، ئەمرۆ باسی مەسەلەکەت بۆ دەکەم چونکە هیچ دەرفەتێک نابینم، دەمرم بەر لەوەی خۆر و ڕووناکی سەر لەنوآ ببینمەوە، لەوانەیە لەوآ دۆزەخ بەڕەحمتربێت لەوەی کە لێرە بەدەستیەوە دەناڵێنین. پێم وایە خوا لێم خۆش دەبێت، خوا حەقە، خوا خێرە، خوا رەحمانە، خوا رەحیمە. بەپەرۆشم کە داوای رەحمەتی بکەم(والیە ترجعون) چوومەتە تەمەنەوە، ئەوەندەیش نەژیام، ئەمەیش قەدەرمە هەست دەکەم وەخت و سەعاتم نزیک بوەتەوە. تکات لێدەکەم نەیەهێڵێت بەگەچی گەرم دام پۆشن، پەنام بەتۆیە کە بەپاکی وتەمیزی بچمە بەردەم خوای خۆم ، لەکفنێکی سپیداو نوێژ لەسەر تەرمەکەم بکرێت، دەخوێنمەوە بۆ ئەوەی ئازاری سنگم لەبیربچێتەوە، وەک بڵێی پارچە ئاسنێکی یەک تەنیە، لێرەوە، سنگی قورس کردووم".**

**ئەمە ئاویلکەی مەرگە، تەنها لەخوا ترسەکان دەیزانن. دوای تۆزێک دڵی وەستا، هێشتا لە هەیوانەکە بووین. پاسەوانەکان هیچ خۆیان تێک نەدا، ئوستاد بەربووەوە سەر زەویەکە. باوەشم پێدا کرد. لێگەڕام تا پەنجەی دۆشاومژەی دەربێنێت و شایەتمان بێنێت و. دەستم گرت و لەدوای ئەوەوە ئەو وشانەم دەوتەوە، کە دەبێت هەموو موسڵمانێک بەر لەکۆچکردنی لەدنیا بیانڵێتەوە.(مەفازلڕ) ڕێگەی داین ئوستاد غەربی وەک پێویست بە خاک بسپێرین. ژمارەمان کەمتر بووەوە. یەکێک لەپاسەوانەکان چەرچەفێکی سپی بۆ هێنام تا بیکەمە کفن بۆی. ئەوە یەکەم مردوو ناشتن بوو کە**

**بەپێی ئوسولڕ بەڕێوە چوو، ئەو ڕۆژە ئاسمان خۆڵەمێشی بوو و ڕووناکییش مامناوەندی بوو، چەند ساتە وەختێک لەسەر قەبرەکەماینەوە و قورئانمان خوێند، یەکێک لەپاسەوانەکان فرمێسکی سڕیەوە، زۆر بەداخ بووین. دەنگی ئوستادمان لەکیس چوو لەنێو دەنگەکانمان، شڕەوپڕ ِەکەیم توڕدایە تەنیشت گۆڕەکەیەوە، کاتێک بەنیوە وەرچەرخانێک ویستمان بگەڕێینەوە بۆ چاڵەکە، واکرین ئیشارەتی بۆ کردم کە ئاوڕی لای چەپ بدەمەوە، ئەوەی دیتم راینەچەڵەکاندم، بەڵام ئەوانەی ترساند کە لەژیاندا مابوون، لە حەوشەکە حەوت گۆڕیان هەڵکەندبوو، ئێمەیش حەوت بووین، گۆڕەکان بۆ ئێمە ئامادەکرابوون، لەلایەکی ترەوە دەگۆڕی تر بەدەرەوە بوون. دیاربوو بۆ زیندانیەکانی قاوشێکی دیکە ئامادەکرابوون. لەئێوارەدا دەمەتەقێیک لەسەر دۆزینەوە شوومەکە دەستی پێکرد. واکرین لە هەموومان ترساوتربوو، هەر دەیووتەوە کە بآ بەرگری کردن ناچێتە سەر سەکۆی سێدارە، هەموومان لەگەڵڕ رای ئەوبووین، بەڵام لەلای خۆمەوە پێم وابوو کە ئەو گۆڕانە پەیوەندی بەئێمەوە نیە، قەناعەتم تەنها هەست بوو. چۆن دەتوانرآ قەناعەت بەکەسانی دیکە بکەیت بەوە؟ تەنانەت ئارەزووی هەوڵدانەکەم نەبوو.(فیشەکێک لەپشتی سەرەوە).**

**ئەمە هەستێک بوو، بەهەموو لەهجەکان ئەو دێڕەی دەووتەوە: بەفەرەنسی، عەرەبی، ئەمازیغی.**

(Une baauulle Laaa nuuuque)

**(فیشەکێک لەپشتەمل)**

(Tadoat aguenso takojuat)

(Kartassa dans takojuat)

Kartassa **فیشەک** tadouat kartasso tadouat **فیشەک.**

Kartassa، **پشتەسەر، پشتەسەر،** Kartassa.. **تواناى بیستنی ئەم ووشانەم نەماوە، هەموومان ماندوو، خەمۆکین، زۆر دڵگران بووین بەمەرگی ئوستاد، خۆم هێورکردەوە ، توانیم دەنگی لە گوێم بسڕمەوە. لەگەڵ بەیاندا گوێم لە خوێندنی (سیبیبت) بوو، وێندنێکی کورت و بچڕبچڕ، پێشبینی دەدامێ دەربارەی جموجوڵی حەوشەکە، یەکسەر دوای ئەوە (مەفازڵ) هات ،لێی پرسیم کە چون شەوم بەسەربرد، سەرم لە پرسیارەکەی سووڕما، چونکە لەمەوبەر هێچ پاسەوانێک گوێی بەشەوان و ڕۆژمنان نەدەدا. پاشان هەمان پرسیاری ئاراستەی واکرین کرد. عەشار لەوەڵامدانەوە دەسپێشخەربوو:**

- **خەونی زڕاندین، شەوی بەووڕێنە بردەسەر، نابوو ئاگاداری کەیتەوە ئەگینا هەمان ئاوازی دووبارە دەکردەوە: گوللەیەک لەپشتی سەر** Kartassa)

**(مەفازلڕ) بێدەنگی کرد، پاشان دەرگاکەی (واکرین)ی کردەوە کە لەلایەکی زیندانەکەی بەدەما کەوتبوو، بەترسەوە قاچی ڕاستی پاسەوانەکەی گرت:(بلێ کە تۆ ئەمە ناکەیت؟ نەتۆ، نامکوژیت، پێم بلێ، ئەی برادەرەکەم، ئامۆزاکەم، ئەم گۆڕانە بۆ ئێم ەنیە، تۆ گوللە نانێیت بەپشتی سەرمەوە، نەخێر، تۆنا، ماوەیەک یەکترمان ناسیوە. نزیکەی بیست سالڕ دەبآ، بەو کابرایە بلێ کە لەپشتەوە وەستاوە بڕوات، پێی بلێ کەتۆ لێرە فەرماندەریت، تکات لێدەکەم دەریکە،**

ئەو بەرەشاشەکەی هەڕەشەم لێدەکات، ئەم کابرایەم لەمەوبەر نەدیوە، لەکوێوە هاتووە؟ کێ ناردویەتی؟ ئەو لەناوبەرمانە، بۆچی جلی مەدەنی لەبەرکردوە؟ ئەو پۆلیسە، ئەو ئیش بۆ پۆلیسی سیاسی دەکات؟ مەفازلڕ شتێک بکە. پیاوی وەکو ئەو ترسناکە. ئەگەر بمانکوژێت، تۆیش دەکوژێت چونکە شتی زۆر دەزانیت.

- بەسە واکرین..

مەفازلڕ هاوار لێکرد وتی بەتەنهام و کەسیش لەدوامەوە نیە، تۆ وڕێنەدەکەیت. کەس بۆ کوشتنت نەهاتووە، ئەوە منم، برادەرەکەت لێرە وەستاوە، هاتووم لێت بپرسم ئەمڕۆ حەزت لەچی خواردنێکە، گۆشتت دەوێ یان ماسی؟

- ئای، کەواتە لەسەر راست بووم! ئەمە دوا ژەمە بۆ بە مەرگ حوکمدرا و، چونکە دەبێ مرۆڤ بەتێریی و تەندروست بمرێت، ئەمە هەموو مەسسەلەکەیە، بایەخ بەتەندروستیت دەدەن بەرلەوەی بتنێرن بۆ ئەو دنیا، کوڕگەل ئاگاتان لە خۆتان بێ من شێتۆکە نیم. سروشتی نیە کە ژەمە خۆراکە ئەبەدیەکەمان بگۆڕن و لێمان بپرسن، بەرووخۆشی، کەچیمان دەوێ، ئەی رۆشنبیر تۆ ڕات چیە؟

- منیش پێموایە کە مەسەلەکە سروشتی نیە، ئەوان کە خواردنەکەمان باش دەکەن، ئەمە واتای ئەوەیە خۆیان بۆ مەسەلەیەک ئامادە دەکەن، چیە؟ نازانم..

- بەڵام من دەزانم، سەرەڕای هەموو شتێ مەیەلەکە سەرنج راکێشە، ئەو گۆڕانەی کە تازە هەڵکەنراون، بەخاکسپاردنی ئوستادی هاوڕێمان بەپێی داب ونەریتی ئیسلامی تەواو. پاشان چاککردنی خواردنەکەمان، لەم چیرۆکەدا مەسەلەیەکی نامۆ هەیە،

- واکرین گوێ بگرە، هێوربەو واز لەڤیژە بێنە. من دڵنیام کە مەفازلڕ خودی خۆی نازانێ چیمان بۆ تەگبیردەکەن. بۆیە، وازبێنە لەوەی خۆت، نوێژ بکەو چاوەڕێ بە).

مەفازلڕ دەرگاکانی داخست، ڕۆیشت بێ ئەوەی فزەی لێوەبێت. دەستمکردەوە بەبیرکردنەوە لە ئوستادو ئەو بۆشاییە گەورەیەی کە لەدوای خۆیەوە بەجێی هێشتبوو. دەنگە گڕو گەشەکەی هێشتا لەسەرمدا زایەڵەکەی دەنگی دەدایەوە. لەمردن نەدەترسا، رۆژێک نەووروژا دەربارەی ئەو بارو زرووفەی کە تێدا دەژیاین، هەمیشە دەیووت(ئەو لەبەندایەتیەکی رووتە بۆخودا) ئەو هەیە بۆ ئەوەی نوێژ بکات نە پرۆتستۆی ئادەمیزاد بکات. رۆژێکیان پێی ووتم مرۆڤ پایەکی گەورەتری هەیە کاتێک دەمرێت لەوەی کە زیندووە. چونکە دەگەڕێتەوە بۆ خۆلڕ و دەبێتە خۆلڕ. هیچ شتێکیش ئەوەندەی خۆلڕ پایە بەرزنیە کە داماندەپۆشێت و چاومان لێک دەنێت و لەنەمریەکی گەشاوەدا دەپشکوێ..

(32)

لە حوزەیرانی ساڵی 1991دا بووین. هیچ بیرۆکەیەکمان نەبوو کە لەوڵات و لەجیهانی دەرەوە چ روودەدات، حیسابێکی زەمەنی رابردووم دەکرد لەنێو یەکەم نامەکاندا کە لەبەندیخانەوە بەدزیەوە دەرۆیشتن و ئەو گۆڕانکاریە کەمانەی کە لەژەمە خواردنەکانمان روویدا بوو، هەولڕ دەدەم ئەو دوو واقیعە بەیەکەوە ببەستمەوە بێ ئەوەی هیچ

**هیوایەکم هەبێ یان بیر لەهیچ سەرکەوتنێک بکەمەوە، پێچ سالر لەنامە ناردن، لەو شووشانەی کە تووڕ دەدرانە ناو دەریاوە، چۆن ئەو هەموو هەوڵەی مەدام کریستین بزانم و، ئەوەی براکەیشم کە لەفەرەنسا دەژی و ژنە خاوەن دەرمانخانەکە، خوشکەکەی عومەر و ژنەکەی واکرین و ژمارەیەک کەسی دیکە، کە دۆزەخەکەی ئێمەیان گەیاند بەجیهان کە لەماوەی پانزە ساڵدا بەنهێنی مایەوە؟**

**ئەنجام واکرین هێوربوو، بەڵام، لەبەرامبەردا، دووانی دیکە لە هاوڕێکانمان ژمارە(1) محەمەد و ژمارە(17) (عیشۆ) کە بەربەری تاغۆنیت بوو، ئەنجامی ئەو نەخۆشیە پیسکردوە کە تووشی ببوون لەگیانەڵا بوون، تاڕادەی تاسان دەکۆکین، پێویستیان بەچارەسەرێکی دیاریکراو بوو. بەڵام ئێمە دەرمانمان هەبوو دەمانخوارد چونکە دەمانزانی بەسوودە لەبەر حاڵەتی تەندروستی گشتیمان. مەفازلر پێی ووتم کە گوێی لێبوو دەکۆکین، لەوانەیە بەم زۆر نزیکانە پزیشک سەردانمان بکات، ئەوسا لێم پرسی:**

- **ئەو گۆڕانە بۆکێن؟**

- **لەکوێ بزانم؟ واز لەم پرسیارانە بێنە. لەماوەی هەژدە ساڵدا دەبێ چاکت زانیبێ کە من تەنها پاسەوانی بەندیخانەم لەجۆرێکی زۆر دەگمەن، پێویست بەزیرەکیەتی ناکات.**

- **باشە، بەڵام برۆ بۆلای واکرین حاڵەتەکەی نیگەرانی کردووم.**

- **بەزمانی بەربەری قسەم بۆ کرد، واکرین گۆڕانیەکی شوانکارەیی وڵاتی خۆیانی دەووت، سەربوردە ئاساییەکەی خۆمانمان لەبەندیخانەکە بەبیرهاتەوە، بیرم لەئاوێنە کردەوە لەسەرچاوم کە سیمای نەمابوو، یان بەبارێکی دیکە سەروسیمای وشک هەڵگەڕابوو، لەسەر رووخساری پیاوێکی خەمباردا، لەخۆی لەو هۆیە ناپرسێت کە چی وای لەسەروچاوی کردوە، هەرچەندێ هەوڵم دایە نەمدەتوانی دەستی لێ بدەم ، چونکە قەناعەتم وابوو کە لێم دزراوە، ئەوەی کە پێمەوەیە سەرچاوی من نیە، ئەو سەروچاوە نیە کە دایکم بە گاڵتەوە دەستی پێدا دەهێنا. ئەگەر موعجیزەیش رووبدات ئەگەر چاوم بەدایکم بکەوێت، بەهەر حالر نامناسێتەوە مەسەلەکە هەندێک وەختی دەوێت بەرلەوەی بێ بۆلام و لەباوەشم بگرێت، هەروەکو هەمووجارێک کە لەسەفەر دەهاتمەوە. لەم حاڵەتەی ئێستامدا، من گەرۆکم، گەرۆکم بەدەوری جیهاندا لەژێر زەوی. بەهەموو لاکانی هەسارەکەدا دەگەڕێم، دەریاکان و چیاکان بە کۆم بوونەوە، لەناو زیندانەکەدا کە لەشێوەی گۆڕە و لەسەر پێچکەیەو فەرماندەیەکی مەست رایدەکێشێت. ئاژەڵی سەیر لەکاتی گەشتەکەدا بەرێکەوت پەیا دەبن، هەوڵدەدەن قەپ لەفەرماندەکە بگرن و رزگارم کەن. مردوویەکم بینی لەناو تابووتێکدا بەگاڵتە پێدەکەنی و کوڵەپنەکان هەڵیانگرتبوو. چونکە هەوڵیدا هەڵسێت ئەو بەرەی کە خستبوویە شوێن هەردوو چاوی لەدەستی دابوو، مردوویەکی کوێر کە چاک نابێتەوە. قوویەکی نەخۆشم بینی لەناوەڕاستی ڕێگاکەدا کەوتبوو و باڵی هەڵدەبڕی بۆ ئەوەی بایەکە رابگرێت.**

**لە پێچی زەمەندا هەورەتریشقە لێیدام و بەسەرخۆمدا وەکو تۆپێکی پووش غل بوومەوە. فەرماندە مەستەکەم نەدەبینی، بگرە مەیموونێکی مێیەم بینی بزەی بۆ دەکردم. لەکوێ بووی؟ بۆچی ئەو هەستەم لەلا دروست دەبوو کەناوچەوانم دەدا لەجامخانە زەبەلاحەکە؟ بەدوای سێبەرێکەوە دەگەڕام دامپۆشێ، من کە لەرووناکی بێبەش بووم، بەڵام سێبەرەکە لە سێبەری داربەڕووەکەدا بوو، ئازادی تەواوم هەبوو کە لەناو گژوگیادا یاری بکەم، راکشێم بەدەست بەتاڵی و ڕاوە پە پوولە بکەم. کوڵەپنەکان مردووەکەیان بەرەڵاکرد چونکە نەمرد بوو، هاتن و دەست و قاچی منیان بەستەوە، نقەیان**

**نەکرد، یەکێکیان بزەیەکی بۆ کردم، هەموویان سەروچاوی مەفازڵیان هەبوو . پێدەکەنیم و لەسووچێکی دووری زیندانەکە چوارمشقی دادەنیشتم. کە بەیانی هەڵدەسام سەرم سووک بوو، دڵم خۆش بوو، وەک بڵێی هەر ئێستا لەسەفەرێکی خۆش هاتوومەتەوە. بوومە پاسەوانی بێدەنگیی. رەتم کردەوە کە دانوستان بکەم لەگەڵ شەوی هیوایەکی دوورودرێژدا. دەبووایە ئەو شەوە بژیبانایە بەبێ دووربوون لەتەڵەکانی و بەبێ خۆگرتن بە بەردەوە، بەبێ خواردنی خۆڵی تەڕی بێژراو کرماوی.**

**زانیم لەتواناماندا هەیە لەسەر هەموو شتێک رابێین، تەنانەت ژیانیش بەبێ سەروچاو، بەبێ سێکس، بەبێ هیوا، هەوڵم نەدا بزانم ئەوانی دیکە چۆن تەگبیری کێری خۆیان دەکەن، من لەلای خۆمەوە، لەسێیەم رۆژی جێگیربوونم لەم چاڵەدا ئەمەم یەکلاکردبووەوە، بڕیارم دابوو نەخێزانم هەیە، نەدەزگیرانم هەیە، نەرابردووم هەیە، بڕیارم دابوو کە بیر لەجیهانی دەرەوە نەکەم، دواجاریش هەموو ئارەزوویەکم لەخۆم حەرام کردو هەموبیرکردنەوەیەکیش لێیان. کێرم تەنها بۆ میزکردن بەکاردەهێنا، ئیدی کاتەکانی دیکە ساردوسڕە، زۆر ئاسایی بچووک بووەتەوە، تەنانەت خەوی سێکسیشم نەدەبینی، نەناڕەزایی دەکردو نەدەجووڵایەوە، بگرە لێم دەگەڕا. بە یەکجاری وازم هێنا لەبیرکردنەوە لێی. کاتێ روشدی بەسزمان گازندەی دەکرد و دەیووت کە بووەتە نێرەمووک، لەبارەی شتی دیکەوە قسەم بۆ دەکرد، ترسی من لەزیندانەکە رووبەڕووبوونەوەی سێکس نەبوو، بەڵام مەسەلەیەکی سەرەکی بوو پەیوەست بەهەر یەکێکەوە بۆ خۆی. ململانێمان دژ بەداگیرکردنی ژیان و دژ بەهاتنی تۆخمەکانی جیهانی دەرەوە، بەبیر، دەبێ ململانێکەمان بەردەوام بێت. چونکە نابێ هیچ شتێک بڕوات، نابێ هیچ شتێ دزەبکات لەوەی کە لەدوای خۆمانەوە بەجێمانهێشتووە، نەخەون و نە پلان و نە بۆنی گوڵ و نەبۆنی هیچ ژنێک. ململانێکی پێویست دەکات ئەو بەربەستە دروست بکەین و پاڵپشتی بکەین، تەنانەت ئەگەریش ئەو دیوارانەی کە دیلیان کردوین بە کەرەستەیەکی تایبەتی داپۆشراون، بەشێوەیەکی ببڕای وموتڵەق دەیکەینە بەربەستێکی جیاکەرەوە. لەبەر ئەم هۆیە زۆر سوور نەبووین بۆ چوونە دەرەوە بۆ بەخاک سپاردنی مردووەکانمان. لەسەرەتاوە رووناکیمان عەمبار دەکرد، لەتێک لەئاسمان، پریشکێک لە ژیان، گەرچیش بەئامادەگی دڕندەیی سەربازی پێچرابێتەوە.**

**لەوسەردەمەدا ململانێکە ریشەیی نەبوو، لەکاتی بەخاک سپاردنی(لەحسێن) لەپڕ ناچار بووم چەند جارێک چاوم بنووقێنم. ئاسمان، گەرچی خۆڵەمێشیی دیاربوو، چاوی ئازار دەدام. بۆیە گوێم بەرووناکی نەدەدا، پێموابوو سەرکەوتنم دەبێ لەزیندانەوە دەست پێبکات، ئەگینا وەکو زۆربەی هاوڕێکانم دەفەوتێم و تیادەچم تەنانەت بەرلەوەی بەرگری بکەم. گۆڕە هەڵکەنراوەکان وازیان لەترساندنی واکرین هێنا، ئەو بەیانیەکیان بەئاگای هێنامەوە، دڵی خۆش بوو لەبەر دۆزینەوەی شرۆڤەیەک:**

**(ئەو گۆڕانەیان بۆ ترساندنمان هەڵکەندوە، سەرنجی ئەوەت نەداوە دوای ساڵێک لەقەدەغەکردن، دوو دڵڕ نەبوون لەوەی کە ڕێگامان بدەن(لەحسێن) بەخاک بسپێرین؟ دەیانزانی یەکێکمان دەمرێت بۆیە ئەو گۆڕانەیان هەڵکەند تابمانترسێنن. ئەمەیش وەکو خۆدەرخستنێک وایە بۆ جێبەجێکردنی حوکمی لەسێدارەدان. ئەمەم لە فیلمێکی ئەمریکاییدا بینی. چاوی حوکمدراوەکە دەبەستنەوە و سەرباز دەهێنن و فەرمانی دەسەڕێژکردن دەدات و دەست بەدەسەرێژدەکەن، حوکمدراوەکە لە ترساندا جل و بەگەکەی خۆی تەڕدەکات. بەڵام ئەو فیشەکە بەکارهاتووانە هەر خوڵەبن، کەواتە، ئەو گۆڕانە وەکو ئەو فیشەکە خوولڵەبانە وان، بەڵام دەزانین کە ئێمە لەو گۆڕانەی حەوشەکەدا راناکشێین، بەهەرحاڵ، حەوشەی سەربازگەیە نەک گۆڕستان. دەبینی، لەمەبەستەکەیان گەیشتم، گەمژەنیم، تۆیش گەمژە نیت، لەگەڵ رئیەکەمدایت؟.**

- بێگومان ئەگەر فەرمان هاتبایە لە(ربات)ەوە بۆ لەناوبردنمان، هێندە زەحمەت ناکێشن بۆ ئەوەی هەریەکەمان بخەنە گۆڕێکەوە. بگرە تەرمەکانمان تووڕەدەنە چاڵێکی بە کۆمەڵەوە، نەزیادو نەکەم.

- تۆ راست دەکەیت، ئەمڕۆ چی بکەین؟

- نوێژ دەکەین بۆ ئەوەی ئازارەکەی محەمەدو عیشۆ سەخت نەبێ. لەهەفتەیەکدا هەردوکیان بەبێدەنگی مردن.

(33)

ناوی ئەو شاعیرەم لەبیرنیە کە وتوویە:"مەرگ ژیان ناوەستێنێ" گەرچی هەمان بیرۆکەی هەستی منیشی بووە، نەمدەزانی چۆن بەفراوانی شرۆڤەی بکەم و بۆ ئەوەدەستە هاوڕێیەی باسکەم کە لەهاوێنی1991 دا مابوونەوە. تەنها پێنج کەسمان مابووەوە لەگرتووخانەی(ب): عەشار، عەباس، عومەر، واکرین و من. هێشتا مەرگ لەدەوروبەر دەسووڕایەوە، نەخێر بگرە پەلەی بوو تا کۆتایی بەوە بهێنی کە بۆی هاتبوو. هەستم دەکرد کە مەسەلەیەک روودەدات. واکرین پێی ووتم کە گوێزان و سابوونی ریش تاشینیان بەسەر رزگاربووەکانی گرتووخانەی(ر)دا دابەش کردوە، مەفازلڕ ئەو هەواڵەی پێ دابوو، هەواڵەکە دروست کراو نەبوو، زۆرجار دەوترا کە بارودۆخی زیندانی لە گرتووخانەی(ر) کەم تووندترە، چونکە لەنێو زیندانیەکانیدا دوو ئەفسەر یان سێ دەرجەداری بەرزیان تیابوو. بەهەرحالڕ، بایەخم بەمەسەلەکە نەدەدا و رەتم دەکردەوە کە لەگەلڕ هاوڕێیاندا باسی بکەم. بەڵام لەوانەیە نیشانەیەک بێت کەشتێک لەژێرەوە تەگبیر دەکرێت. دیارە نامەکانمان بەسەلامەتی گەیشتوونەتە ووشکایی ئەمین و کەوتوونەتە دەستی بە وریاوە.

لەوانەیە میدیای بیانی لەبارەمانەوە قسەیان کردبێت و، فشار خرابێتە سەر دەسەڵات لە(ربات) لەلایەن سیاسیە دەسرۆکانەوە، لەوانەیە رووناکبیران جووڵابن لەپێناوی داواکردنی بەرەڵاکردنمان، لەوانەیە ژان پۆل سارتەر و سیمۆن دووبۆڤار بەخۆیان لەسەرمان هەڵبدەن و، داواکاریی نارەزایی بەسەر خێزانی دەستەی نووسەرانی رۆژنامەکاندا دابەش کرابێت. چۆن بزانین؟ ئێمە لەدەنگ و باسی جیهان دابڕابووین، لەوانەیە رۆژێکیان جیهان ئاورێک لەچارەنووسمان بداتەوە. ئەوکاتە نەمدەزانی کە سارتەرو دووبۆڤار مردون. سەبارەت بەمنەوە جیهان بەردەوام بوو لەژیانی خۆی لەچوار چێوەی تەسکی نەمریەکی هەمیشەییدا، لەوانەیە دەست بدەنە ریش تاشینمان، لەوانەیە پەنابەرنە بەر گۆڕینی زیندانەکەمان تا پێشکەشمان بکەن بەنوێنەرانی رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی؟

دەخرێینە بەندیخانەیەکی پاک و تەمیزەوە، لەو زیندانە رێک و پێک و نوێن و مێزیان تێدایە لەنزیکی نوێنەکانەوە و، گڵۆپی کارەبایی و بەتانیەی نوێ و مریشکی برژاو و گۆشتی مەڕو تەنانەت ماسی بۆرە پێشکەش بکەن. لەسەرەتای تەمووزدا ژەمێکی بەگۆشتمان بۆ یەکەمجار بەرکەوت، لەماوەی هەژدە ساڵدا، گۆشتی حوشتریان پێدایین لەگەلڕ پەتاتە وپیاز، بەشەکان زۆر بوون و بوونداربوون، بۆنی گۆشتم لەبیرچووبووە، بیرم نەدەکرد، لەمنداڵیدا لەماڵی باپیرم گۆشتی جنراوی حوشترم خواردوە، بۆنێکی ناخۆشی هەبوو، تفت و قێزەوەن بوو. ئاگادار بووم، وریا بووم، تەنها سەوزەو نانی بەدۆشاو تەماتەم دەخوارد، بەڵام عەباسی بەدبەخت ئەو گۆشتە چەورەی ماشاندەوە، بێئەوەی بیجوێت و

تووشی هەزمنەکردن بوو، بووە هۆی ئەوەی لەرزوتایەکی توند بگرێت. بۆ رۆژی دواتر لەجیاتی ئەوەی رۆژووبگرێت قاپێک نەشەویات و پاقلەوای خوارد. بۆ هەفتەیەک تووشی رژانەوەو لەرزوتابوو، لەکۆتایی مانگی تەموزدا مرد. عەشار گۆشتەکەی خوارد و هیچی لێنەهات وەکو خۆی بەهێزوگۆشتن مایەوە. بەڵام واکرین پێی ووتم کە گۆشتەکە خراپ ببوو، ویستبوویان ژەهرالومان بکەن، بەڵام عومەر بە ئامۆژگاریەکەی کردم و، دەستی لەگۆشتەکە نەدا ، گەدە نەیدەتوانی خواردن هەزم کە نەیدەناسی..

دوای مەرگی عەباس ئیدی لەگەڵ خواردندا گۆشتیان نەدەدا، بگرە سەوزەیان زیادکردو بەهەموو جۆرەکانیەوە، پاقلاوای ئێوارانیان گۆڕی بەبرنج لەگەلڕ دۆشاوی تەماتەدا. ماوەی مانگێکە بولبولە بچووکەکە(سیبیبت)مکەم، لەفقیرەکەم، بەسۆزەوە دەخوێنآ پێکرا جوان وخەمباربوو، خوێندنێک هەستم کرد کە لەیەک دابڕانێک خەریکە روو دەدات: دابڕانی ئەو، دابرانی من، دابڕانمان، بەتەواوی نازانم، برنجم پێی دەدا، ئەویش مافی ئەوەی هەیە ژەمێکی باش بخوات، بەڵام بایە قوشەکە ئیدی نەدەهات، زیندانەکە لەزۆربەی میوانەکانی چۆلڕ بوو، لێرەدا مەسەلەیەک روودەدات، هەریەکێک لە ئێمە چوو بووە سووچێکەوە و بەقووڵیی تێرامابوو، منیش لەلای خۆمەوە، پاسەوانی پەندۆلەکە بووم، عومەر دڵنیا و بڕوای وابوو کە نامەکان گەیشتوونەتە دەستانی ئەمین. واکرین تەنگەتاوی بۆ هاتەوە لەناداریەوە، عەشار سەرقاڵی پلاندانان بوو بۆ دوای دەرچوونی لەزیندان. منیش هەوڵمدەدا بیر لەئاییندە نەکەمەوە، بەشەوان خەوم دەبینی کە لە وادەی بەرەڵا بوونەکەم دوا دەکەوم، هەموویان لەزیندان دەردەچن و من لەبیردەکەن، کاتآ نووستووم کەس بیری ناکەوێتەوە کە بەئاگام بێنێتەوە، یان قوماندار دەبینم، هەمووماني بانگ کردو قسەمان بۆ دەکات و، کاتێک وادەی بەرەڵاکردنەکە دێت لەپێشدا پێم دەڵآ(تۆ دەمێنیتەوە. باوکت واسیتەی کردوە بۆ ئەوەی بەرەڵا نەکرێێت، بەتەنیا لەزیندان دەمێنێتەوە تا کات و سەعاتی خۆی دآ). ئەودەمەی بەئاگادێمەوە و لەئارەقدا تەڕبووم، لەرۆژی دواتر، ووتارەکەی قوماندار دەڵێمەوە بآ ئەوەی پیتێکم لەبیرچووبآ لێی: "گوآ بگرن، هێمنی، من فەرماندەتانم و پێم دەڵێن سەربڕ، رۆژێک لەڕۆژان هیچ هەستێکم نەبووە، نەچاک و نەخراپ، من لەخزمەتی نیشتمان و خواو شای خۆمدام. کاتآ هاتن بۆ ئەم بەندیخانەیە بیست و سآ کەس بوون، تەنها چوار کەستان ماوەتەوە. وەکو سەرنج دەدەن ئەرکەم سەد لەسەد تەواونەکردووە، خوا شایەتە ئەرکی خۆم بەڕێکی و راستی و ووردیەوە بەکارهێناوە، بەڵام دەسەڵات چیە، بوونی ئێوە لێرە بەڵگەیە کە خوا خۆی ویستی. ئەوەی پەیوەندی بەئێوەوە هەیە هەمووشتێک تەواو بوو، یان خەریکە تەواو دەبێت لێبوردن ئێوەی گرتەوەو تەواو. هیچ بۆنەیەک نیە بۆ مەسەلەیەکی ئاوها، نەچەژنی سەربەخۆییەو یان مەولوود یان جەژنی گەورەیە. ئێستا دەگەڕێنەوە بۆ زیندانەکانی خۆتان. ئەسپن بەسەرتاندا دابەش دەکرێت و دەرۆن، وریا بن، برۆن.."، لەوکاتەدا بانگی کردم و پێی وتم کە لێبوردنەکە من ناگرێتەوە. عەشار وایزانی کە خەونەکە مەبەستی ئەوە بۆیە پێی ووتم:

"لەراستیدا تۆ ناتەوآ ئێمە دەرچین. ئەگەر بتەوآ خەونەکە راڤەدەکەم، تۆ دەتەوآ ئێمە لێرە بمێنینەوە تۆ خۆت رزگارت بآ، چونکە باوکت واسیتەی کردووە بۆ بەرەڵاکردنت. بەوشێوەیە خەونەکەت راڤەدەکەم، گەرچی دەڵێن خەون پێچەوانەی ئەوەیە کە بەڕاستی روودەدات. ئەمجۆرە مەسەلەیەک کوت وپڕنیە کە لەکەسێکی خۆپەرستەوە دەرچێت، کوڕی بۆرژوازی".

گرنگ ئەوەبوو رانەکێشرێم بۆ کاردانەوە، خەونەکەم سادەیە: باوکم دوای هەژدە سالڕ، هەستی کرد تاوانبارە، لەگەلڕ چوونە تەمەنەوە، ترس جێگای ئیمان دەگرێتەوە، یان ئیمان ترس دەشارێتەوە. دەبآ باوکم لەخواترسابێت، ئەو باش دەزانآ کە خراپی کرد بەرامبەرم لەبەر خۆپەرستی و ترسنۆکی، پێویستیشی بۆ رازی بوونی شاە.

بەتەنیا قورئانم دەخوێند، واکرین بەدەست ئازاری جمگەوە دەیناڵاند، زۆر بەزەحمەت دەجووڵایەوە. بەڵام عومەر تابێکۆتا دەیژمارد، عەشاریش بەدەنگی بەرز خەونی دەبینی بەوەی کە دەرچوو لەزیندان چی دەکات:"سەبارەت بەمن مەسەلەکە ئاڵۆزنیە، لەبەر ئەوەی راستەوخۆو سادەبووم، هەرکە لەزیندان دەرچووم، خانووەکەم دەفرۆشم فرۆشگایەکی پێشکەوتوو لەمەراکش دەکرم، وەکو لەمەوبەر وتم سەرلەنوآ ژن دێنمەوە، ژیانم دروست دەکەمەوە. ئەگەر ژن ومنداڵەکانم توانیبێتیان بەبآ من لەماوەی بیست ساڵدا بەردەوام بن ، بەوحاڵەوە تەگبیری کاروباری خۆیان بکەن، لەبیرم چوونەتەوە. دەبووایە وابکەم، زەمەن زەمەنە، ئەوشتانەی کە ئاواتی چاو و دڵ بوون دەسڕێنەوە و لای دەبات. لەرۆژی یەکەم لەدەرچوونم لەبەندیخانە، دەچمە چێشتخانەیەک بۆ ئەوەی نان بخۆم ، مەست دەبم و دەچم لەگۆڕستانەکان میز دەکەم. ئۆف، بێدەنگ دەبم چونکە نازانم تا وادەی دەرچوونم لێرە خۆم رادەگرم؟".

هیچ گومانێکی نەبوو یان گومانکردن لە هەستێک، کەچی خەونەکانم تێکەڵ وپێکەڵ بوون و گومانەکانم هەمووستێکی دەگرتەوە، تاقیکردنەوە فێری کردم کە وەهم دروست نەکەم. ئیدی عەشار تووڕەی نەدەکردم، ئەو عادەتەی عومەریش وەرزی نەدەکردم بۆ برکێشی کردن لەسەر ژمارەکان. ئەو شەوە لەدوا جەنگەکانی خۆمدا بووم، لەمەیش دا چەند سەعاتێکم خایاند، چرنوکەکانی مەرگ دڵیان رادەکێشام بۆ ئەوەی دەریبێنن، منیش بەرەو ئاقارێکی پێچەوانە رامدەکێشا بۆ ئەوەی ژیان رابگرم. بۆئەوەی بیهێڵمەوە. نیازم نەبوو دوای هەژدەساڵ رێگا بدەم مەرگ لەجەنگەکەمدا بەسەرمدا زاڵ بآ، دەمزانی کە من سەردەکەوم، ئارەقەم دەردا، و سەروچاوی مەرگم دەبینی کە دانی بردبووە ریچەوە و تووڕەیی دەتفاندەوە. خۆم نادەم بەدەستەوە، ناترسم، ئەنجامی دواخول تا ئەوپەڕی هەوڵم دا سەرەڕای حاڵەتە کارەساتاویەکەم، هەستم کرد کە چرنوکەکان خاو بوونەتەوە. وەکو مشتێک بەسنگم بکەوێت وابوو و بەبآ هێز کەوتم، بەڵام هەستم بە ئاسوودەیی دەکرد و وەکو بیدعەیەک تاماوم لەبیری ناکەم لەگەڵ ئازارەکانمدا تەنیا بووم، لەگەڵ بیرکردنەوەکانمدا بەتەنیابووم، لەگەڵ جەستەمدا بەتەنیا بووم کە گەیشتووەتە رادەیەکی تەلەف بوون کە سوودی بۆ هیچ تاقیکردنەوەیەکی زانستیش نیە، بەتەنیا و ماندووم، هەست دەکەم کە بڕبڕەی پشتم بەتووندی فشاری بۆ هاتبوو، پەنجەکانم رەق ببوون، شانم شێوابوو، پشتم چەمابووەوە و سکم قوپابوو، بیروباوەڕی خۆم پێچابووەوە و لەسووچێکی بێلایەندا هەڵواسرابووم، نەرەش ونەسپی، وەک بڵێی گەیشتوومەتە کۆتایی شتێک ، لەژیاندا دەڵێن گەیشتووەتە قەراغی لەفافەکە، بەزەحمەت خەیاڵی ئەوەم دەکرد کە بەلەفافەکەی ئێمە بچێت، لەوانەیە لەجۆری باگردێن بێت، بە زرێگیراو. ئەو رۆژەی کەباسی فیلمی بۆنۆبل(فریشتەی وێرانکەر)م بۆکردن، هاوڕێکانم هاواری ترسیان لێبەرزبووەوە. سنارێوکەم کردبووە شێوەیەکی مەغریبی، پێم ووتن کەشێوە نایابەکە لە ڤیلایەک دەکرا، لەگەرەکێکی خواپێداو لەدارولبەیزا. هەربەرێکەوت لەوآ بووین، بانگێشت کرابووین بۆ ئامادەکردنی خوانەکە و، زامن کردنی ئاساییشی ئەفسەرەکان و ژنەکانیان. لەباخچەکەدا بووین، لەناو خێوەتەکە گەورە بۆرژوازیەکانی مەغریبی لێبوو، بزنزمان و بەرپرسە سیاسیەکان و خانمانی کۆمەڵ، بەهەموو شێوە خواردنێک ئینتەلایان دەکرد. پاشان، زەنگی دوانزهەم لێدەدرا، ئەمەش مژدەی هاتنی نیوەشەو بوو، گومەتێکی شوشەی نەبینراو لەئاسمانەوە دەهاتە خوارەوە و ئابلوقەی دەدان و دەیخستنەحاڵەتێکی شەڕەوە، بۆ بەجێهێشتنی ئەو خانەی دەردەسەری و لەشوشە و چارەنووسێکی زۆرداریی بۆ خەڵکانێک نەیاندەزانی خۆیان کێن، یان لەگەڵ کێدا دەژیان. بەدەم بیرەخواردنەوە چاودێریمان دەکردن، کە دەیانبینی ئێمە پێدەکەنین کەفیان دەچاندو هاواریان دەکرد، نەماندەتوانی هیچیان بۆ بکەین، شوشەکە لە کەرەستەیەک دروست کرابوو نەدەشکا، ئەمە ویستی خودا بوو، عەدالەتی حاڵەتێک بوو بەویستی خودا و ئێمەیش نیشتەجآ بووین لەسەر خۆشی ونیگەرانی، نەماندەزانی کەی ئەو مەرگەساتە کۆتایی دێت، شەڕێکی ناوخۆی بچووک لەبەرچاوماندا بەڕێوەدەچێت، لەگەڵ چاوەکانی خۆیان رکەبەرایەتیان دەکرد، بەچەقۆ و چەتاڵی شیوێکی نایاب

**شەڕیان دەکرد، خوێن لەهەموو شوێنێک بوو، فرمێسک و، ئەو ژنانەی جل و بەرگەکانیان دڕابوون و مەمکیان دەرپەڕین بوو، سمتیان کەوتبوونەدەرآ، پیاوەکانیان بەقەپالڕ بەربوونە یەکتری، بوونە مرۆڤ خۆر، دڕندەبوون، گەڕابوونەوە سەر ئەوەی کە پێی گۆش کرابوون، پاشان پەزی ئەتڵەس هاتن و دەوری ماڵەکەیان گرت و کەوتنە لەوەڕ لەسەوزەکە گایەکەدا، ژنی کۆلۆنێلڕ مەست بوو سەمای دەکرد، لەیەکآ لەژنە دەوڵەمەندەکانیش بازنی ئاڵتوون و ملوانەکە ئەڵماسەکەی لێ دەدزرێت، ئیدی چۆن بەو دیمەنە ترسناکە پآ نەکەنین؟ لەپشتی خێوەتەکەوە هەموو خزمەتکارەکان کە ماڵەکەیان بەبآ هۆ جێهێشتبوو کۆبوونەوە. دەیانووت خودا دادگایی خۆی بەڕێوە دەبات، ئەوە ڕۆژی حیسابە، هەر کە گومەتە شوشەکە لەبەرەبەیاندا بەرزکرایەوە و، میوانەکان بەژن و باڵای خۆیان ڕێکدەخست، پێچمانکردەوە و بەجێمانهێشت و تادیمەنەکانی کۆتایی ریسوابوونیانمان نەبینی. بۆچی هەستم بەم فیلمە کرد؟ بۆ کردم بەشێوەیەکی مەغریبی تاڕادەیەک بڕوام پێی کرد؟ موعجیزەی زیرەکیە، ڕێک زۆرپێویستمان بەوە بوو: زیرەکی هەر کە لەڕوایەتەکەم بوومەوە داوای لێبوردنم لە بۆنۆێلڕ کرد، چونکە ڕووداوێکی وڵاتەکەم نووسان بەفیلمەکەیەوە. وەکو هەموو جارێک. عەشار واتای جامخانە نەبینراوە تآ نەگەیشت، نە لەدەستدانی ئیرادەی ئەو کۆمەڵە خەڵکە خۆشگوزەرانە، ناڕازی بوو وداوای ڕاڤەکردنێکی لۆژیکیی دەکرد. بیرم لەو فیلمە دەکردەوە، ئەو ڕۆژەی کە ئازایەتی و هێزی ئیرادە خیانەتی لێکردم. خەیاڵی ئەوەم کرد کە قوماندار پەلاماری گرتووخانەکەمانی داوە و، بەدەستی خۆی دەرگای زیندانەکانی کردووەتەوە و دەڵآ:**

**"دەی، لێرە بڕۆن، ئێوە ئازادن" بەرەو دەرگاکە دەڕۆین و لەوآ تەونێکی جاڵجاڵۆکەی نەبینراو ڕێگای لێدەگرتین، یان ئەوەتا لەتەونی ئەهریمەنە، یان تەونی پلەی قوماندار کە ڕێگە لە دەرچوونمان دەگرێت، چونکە ئەوسا بەنیگای پڕ لەرق وکینە سەیرمان دەکات، لەپێکەنینێکی بەناڵەدا بەردەوام دەبێت و، بەتەنیا لەگەلڕ دەردەسەریەکەماندا بەجێماندەهێڵا، تەنانەت ئەزیەت ناداتە بەرخۆی کە دەرگای زیندانەکان دابخات.**

(34)

**ئەودەمە چۆن بزانین کە دوامانگەکانی مەینەتیە تووندەکەمان دەژێین؟ (مەفازلڕ) کە هەڵس وکەوتی خۆی لەگەڵماندا گۆڕی، دەهات لەهەیوانەکە لەگەڵمدا قسەی دەکرد، قسەی سەیری دەکرد. گوێم لێ دەگرت و ناوە ناوە بەبآ ئاگا لەو سەرێکم بادەدا:**

**(دەزانی، بەتایبەتی من تۆم خۆش دەوێت ،بێگومان بڕواناکەیت، ئەگەر لەم شوێنەدا بڕۆن بەتایبەتی بیری تۆ دەکەم. دانیپیادەنێم کە مەسەلەکە زۆر دڵڕەقانەبوو، لەڕاستیدا لەسەرەتادا گوێم بەچارەنووسی کەستان نەدەدا، دەمووت، نەخێر، بگرە هەمووەمان دەمانووت، کە بەرگەی یەک سالڕ ناگرن. بەڵام مرۆڤ عەجایەبە، ئیرادەیەکی ئەوتۆی هەیە کە ڕادەبەدەرە، سەرباری هەموو دەردەسەریەک بەرگری دەکات. دەزانم ئەم مەسەلەیە بەسەر هەمووتاندا پراکتیزە نەدەبوو، ئایا هەست ناکەیت ئەگەر لێرە دەرچوویت واتا زۆر سەیر ڕزگارت بووە. تەنانەت ئێمە گرەومان لەسەر ئەوە کردوە کەکآ لەنێو ئێوەدا خەریکە دەمرێت، تاوانێکدا گەورەتان ئەنجامداوەو نرخەکەیتاندا، ئەمە ئسووڵی گەمەکەیە. خەیاڵکە ئەگەر کۆدەتاکە سەرکەوتوو بووایە، ئەو ئیمڕۆ لەهەمان سەربازگەکەدا هاوکار دەبوویت یان تەنانەت منیش**

**دەبووە بەردەستی ئێوە، دوای پەنجاوهەشت ساڵ خزمەت هێشتا یاریدەدەرم، کەچی تۆیش ئەمڕۆ دەبووی بە سەرهەنگ یان عەقید، بەڕاستی ژیان سەیرە. بگرە، ئەوەتا ڤیتامینم بۆ کڕیویت، بگرە، ئازارت نادات، چوومە دەرمانخانەیەک داوای ڤیتامینم کرد ژنێک ئەم پاکەتەی داماَ، دیارە هەموو ڤیتامینەکانی تێدایە.**

- **ئەی دەربارەی من چیە ئایا دەمرم، عەشار هاواریکرد وتی.**

**مەفازلڕ لەبیری کرد.**

- **(تۆ، بەم ورگەوە کە شایانی بەرازە کێویە لەناوچوون پەیت پآ نابات..)**

- **بەڵام ئازار دەچێژم، هەموو ئەندامی جەستەم بەئازارە، تکات لێدەکەم دەرمانم بدەرآ.**

**مەفازلڕ لێی گەڕا بقیژێنآ و ڕۆیشت دوای ئەوەی دەرگاکانی داخست. لەوساتەدا تۆزێک لەدڵنیایەکی رادەبەدەر ژیام. ئیتر هیچ شتێک نەیدەتوانی بمپێکێ، بچمە دەرەوە، بمێنمەوە، خۆم رزگارکەم، بمرم، لەلام یەکە. دەبمە یەکێک لەرزگاربووەکان مادامێکی توانای نوێژکردنم هەیەو بەردەوام بوون لەگەلڕ خوڵقێنەردا. ئەنجام گەیشتمە عەتەبەی ئەبەدیەت، لەوآ کە رق وکینەی بنیادەم و هیچ و پووچی و بچووک بوونەوەکەیان بوونی نیە، بەوجۆرە گەیشتمە یەکبوونێکی باڵا، یان پێم وابوو گەیشتووم، ئەوەی کە بەرزم دەکاتەوە بۆ سەروی تاریکیەوە و، دوورم دەخاتەوە لە زۆرداران بەسەر زینەوەرە لاوازەکاندا، زایەڵەی ناڵەم نەمابوو، هەموو ئەندامانی لەشم بوونە بێدەنگیی، شێوەیەک لەشێوەکانی کپی کە بەتەواوی نە ئیسراحەت بوو نەمەرگ بوو. گەیشتبوومە ئەوپەڕی بەرگری کردن، ئیدی جەستەم ملی بۆ نەدەدام، سەرم ئاوسا بوو هێندە هەمان نوێژەکان و هەمان وێنەکانم دووبارە کردبووەوە، لەگەلڕ ئەوەشدا، دەمزانی کە رووناکی نوقممان دەکات، خۆم بۆی ئامادەکردبوو بەچاونووقاندن، خەیاڵی ئەو دیدارانەی دوای جیابوونەوەم دەکرد، تۆزێک قبووڵی خۆبەدەستدانەوەم دەکرد بۆ درۆکە، قارەمان نەبووم، بەڵکوو پیاوێک لەماوەی هەژدە سالڕ تووندی سەرکەوتوو نەبوو کە مرۆڤایەتی خۆی دەربازبکات. مەبەستم لایەنەکانی لاوازیی و هەستەکانی و، توانای بۆ هێنانی عاجباتیەکانی گڕکانەکان کە هەمیشە نکووڵی لێدەکرد. ئەو شوورایەی کە قایمی کردووم خەریک بوو درزی تێدادەکەوت، گوێم لەدەنگی ئەوانە دەبوو کە لەلامان ڕۆیشتبوون، هەمووشتێک لەسەرمدا تێکەلڕ دەبوو، کەنەمدەتوانی بەناولەپم رایبگرم، ئەگەر ئازار کۆڵی پێدام تەنیایی نەیدەتوانی بمپارێزآ، بەرامبەر بەئیمانم تەنیا نەبووم، کەسانێکی غەوارە هەبوون لەپەناگە تەنکەکەمدا، بەدکاریی داگیری کردبووم، رەتم دەکردەوە کە گوزارشتی(گیانەلا) بڵێم. پێم باش بوو گوزراشتی(عتە)(1) بەکاربەرم، ووتنەکەی جوانتربوو، سواری(عەین)ە گەورەکە دەبم و باڵم درێژ دەکەم وەکو بڵێی خۆم ئامادە دەکەم بچمە ناو ئاوە شینەکەی حەوزی مەلەکەوە و خۆم(تا و)ە لاستیکیەکەوە دەگرم، دادەبزم و پاشان بەرزدەبمەوە و(ها و)ە کە دەگرم دەیکەمە چەپەرێک و خۆمی پێوە دەنووسێنم، چۆن خنکاوێک خۆی بە بەلەمەوە دەنووسێنآ، بەڵام ئەوەی لەگەل مندا روویدا لەگەلڕ ئەو واتایەدا ڕێکناکەوێت کە ئاسایی دەیبەخشینە ئەو وشەیە،(عەتە) هی سروشتی رزگاری کردم، شێتایەتی مێشکم. عەتەە، عەتەە، عەتەە، سروودم دەووت، خۆشبەختانە**

**تەنیا خۆم گوێم لەخۆم بوو، چونکە دەنگم هەرگیز بەهیچ شتێک ناچووم. وشەکانیدیکە فریام دەکەوتن، لەئۆقیانوسێکی وشەدا بووم. فەرهەنگێکی بەشەپۆل لەپەڕە فڕیوەکان، ئەو وشەیەی کە زۆر بێوەی**

بوو(ئیسترلاب)،حەزم لەریتمی بوو، ئەو ئاوازەی کە هەڵمهێنابوو، بێگومان ئەوە پەیوەندی نەبوو بەو ئامێرەی کە بەرزایی هەرسارەکان دیاری دەکات، گەرچی ئیسترلابەکە ژەهرەکە مژی بووی..

دوای نوێژ هاوارێکی توندی واکرین گەڕانمیەوە بۆ زیندانەکە ئەو بۆشاییەی کە ئەوانەی لەلامان ڕۆیشتبوون لەدوای خۆیانەوە بەجێیانهێشتبوو، وایدەکرد کە دەنگەکە لەهەموو شوێنێک دەنگ بداتەوە، وەکو بڵێی ناڵەی هەورەتریشقەیەکی درێژە لەئاسمانێکی تاریکدا. واکرین نەیدەتوانی کۆنترۆڵی هاوارەکەی خۆی بکات، چونکە ئازارێکی توندی هەبوو توانای هەستکردنی نەبوو بەکردەوەکانی خۆی، لەدەرەوەی هەرکۆنترۆڵێک بوو، چونکە چووبووە دەرەوەی خۆی.

لەنێوان کەڵبەگەلێکی تێکشکێنەردا وا دەهاتە بەرچاومان کە زۆرانبازی لەگەڵدا دەکات، قسەی بۆ دەکات، گوێی لێ نەبوو. هیچ نەمابوو کەبتوانین بیکەین، تۆبڵێی مەرگی دیوە و خۆی نادات بەدەستەوە؟ دوای ئەو هەمووەی کە ماوەی هەژدە سالڕ بەسەرچوون، ئاشنایەتیەک لەنێوان من و عیزرائیلی فریشتەدا دروست ببوو، کەخودا دەینێرێت بۆ دروێنەکردنی ڕۆحی مردوان. بەخاکی دەهاتە بەرچاوم، بەسپی خۆی پێچابووەوە، بەپشوو و دڵنیابوو. لەدوای خۆیەوە عەترێکی بەهەشتی بەجێدەهێشت، بێگومان تاکە کەس بووم کە بۆنم دەکرد، مەسەلەکە چەند چرکەیەکی دەخایاند، هەستمکرد ئەو لەو شنە ساردەوە تێدەپەڕی کە بەسەر گرتووخانەکەدا هەڵێدەکرد، هەست دەکەم ئەو رویشت هەرکە بۆنی خۆش لەناو زیندانەکە دێت، ئەوە زۆر جوانتر بوو ، لەوێنەی ئەو مەرگەی کە ئێسکە پەیکەرێکەو داسێکی گەورەی هەڵگرتووە. ئەو رۆژە هەستم نەبەخۆی و نە بەبۆنەکەی کرد، دەبی هێشتا واکرین ئازاری هەبێت، هێشتا وەخت و سەعاتی نەهاتووە، بەشەو هاواری نەدەکرد، بەڵکو وەکو منداڵێک دەگریا ،کە فرمێسکەکەی زۆری بۆ هانی بآ، بۆ ڤراڤین نانی تازەیان بۆهێنایین، دەبآ نانی دوێنآ ئێوارە بێت ناوە نانی ووشک نەبوو، بەڵام ڤاوەکە هەروەکو خۆی وابوو، میزی حوشتر بوو، بەڵام بۆ جاری یەکەم شەکریان بۆ هێنایین، بەتەواوی تامی شەکرم لەبیر چووبووەوە، تامەکە مزربوو، چونکە لیکەکەم لەگەڵڕ جۆرە خواردنە ڕانەهاتبوو، عەشار لەخۆشیاندا هەلهەلەیەکی کێشا، بەلای ئەوەوە دەرچوونمان نزیک بوو، بەڵام عومەر بێدەنگ بوو، ئەوە بوو بەرە بەرە ژیان دەگەڕایەوە بۆ جەستەی واکرین، نان و شەکرەکەی خوارد. لەخواردنی نیوەرۆژە ڤووتووی سەردینییان لەگەڵڕ پرتەڤالڕ بۆ هێنایین، ئێوارەیش وەکو جاران پاقلاوەیان بۆ هێنایین، چونکە نابآ بەجارێک نازمان بکێشن، لەمانگی تەموزدا بووین یەکێک لەپاسەوانەکان بەرادەیەک قسەی رەق بوو تا پێی ووتین:

"ئەمرۆ جەژنی لاوانە، جەژنی ئاغامانە، خوا خۆی و سەروەری بپارێزآ".

بۆ بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر، هاتن بۆ بردنی عەشار، بەچاوی بەستراو و دەست بەکەلەبچە لەزیندان چووە دەرآ، گوایە بەرەلا دەبآ بۆیە پێی ووتین:

"برادەران تا دیدار، من لەئێوە بەتەمەنترم، چونکە لەمەغریب بەلوتفەوە پیاوی بەتەمەن مامەڵە دەکرێت، ئاساییە کە دەبآ یەکەم رزگاربووان بم. پێموایە بەم نزیکانە ئێوەیش بەردەبن".

یەکێک لەپاسەوانەکان فەرمانی پێکرد کە بێدەنگ بێت، دواجار زانیم کە ئەو ویەکێک لەئەفسەرەکانی گرتووخانەکەیان بردبووەوە بۆ زیندانی ڤونەیتەرەی مەدەنی. چەند مانگێک لەوآ مانەوە دوای بەرەڵاکردنمان. ئەو شەوە ئەم خەوەی خوارەوەم بینی:

**"هەموومان کفنی سپیمان لەبەربوو، لەمزگەوتێکدا کۆبووینەتەوە، بەبآ وەستان نوێژدەکەین، لەهاوشانی یەکتر وەستاوین، بەڵام لەگەڵر یەکتردا قسەمان نەدەکرد، دوای دوو نوێژەکە سڵاوێکی ئاساییمان لەیەکتر دەکرد، هەڵدەسام، بەزەحمەت رێگام دەکرد، چونکە کفنەکە قاچ و دەستی دەگوشیم. لەئاستی پەنجەکانمەوە دەزوویەک رادەکێشم و کوتاڵەکە دەکەوێتە زەوی. رووت نەبووم، کفنەکە جەستەی داپۆشیم، بەڵام پێی نەدەگرتم، دەمتوانی رێبکەم، لەمزگەوتەکە دەچمە دەرەوە، بەڵام هاورێکانم نوێژیان دەکرد و کەس ئاگای لەرۆیشتنم نەبوو. هەر لەگەڵر دەرچوونمدا تیشکێک لەرووناکی بەشەوق ئابلووقەی دام، چاوم دەنووقێنم و دایکم دەبینم، بەردەوام دەبم جورئەتی بیرکردنەوەم نەبوو لەوەی کە مزگەوتەکە بەندیخانە بوو، یان زیندان ناوبنرێت بەشوێنی نوێژکردن. "**

(35)

**شەوی2 یان3ی ئەیلوولی 1991 بوو، ناخۆشترین شەوانی زیندانیکردنم بوو، لەزیندانی(ر) کۆیبیان کردینەوە، ئەوانەی رزگاریان ببوو ژمارەیان زۆرتربوو، عومەر و واکرین ومن حاڵمان شڕ بوو، هێند لە باری جەستەیی و دەروونییەوە ماندوو بووین، بەزەحمەت رێمان دەکرد و بەپێیەوە دەوەستاین، واکرین بەچوارچنگڵە دەرۆیشت، عومەریش خۆی بەدیوارەوە دەگرت نەوەک بکەوێت. مەفازلر لێم نزیک بووە و دەستی بۆ درێژکردم و وتی: "خۆت بەمنەوە بگرە، ئەمە کۆتایی مۆتەکەکەیە، پێموایە ئەمە کۆتاییە. زیاتر دەزانم لەوەی کە دەیزانن، بەڵام ئەم هەمووە بەمەسەلەیەک دەچێت کە خەریکە کۆتایی دێت".**

**سەرم دەلەقاند چونکە ئارەزووی قسەکردنم نەبوو. پآ پەتی بووین، چاویان بەستبووینەوە و کەلەبچەیان کردبووە دەستمان و دەنگێکی نادیار دەیبژاردین، بەوشێوەیە بەمەرگی ئەوانەم زانی کە لەگرتووخانەکەماندا نەبوون، بیست و هەشت رزگاربوو لەکوآ پەنجاو هەشت حوکمدراو، سییان مردبوون، سی ئەشکەنجەدراو، سی سێدارەو ماوەو بێرەحمیان جیاجیایە. سواری لۆریان کردین، گوێم لە دادانەوەی چادرەکە بوو، دواوەی لۆریەکەیش بەسترا، بەدرێژایی شەو جەستەمان رادەژەنرا، ئەو رێگایە لەبەر خراپییەکەی هەڵیانبژاردبوو، لۆریەکەمان هێواشی کردەوە، ئۆتۆمبیلی دیکەی سەربازی لەبەرامبەرەوە دەهاتن بۆم روون بووەوە، لەقسەی نێوان شۆفێرەکان دا، ئەوانە شەڤەل بوون، نەک لۆری کە حوکمدراوە سەربازەکانیان هەڵگرتبآ و جێگەی ئێمە بگرنەوە، شۆفێرەکەمان بەسەکنەکەی خۆی وت:**

**"بلدۆزەرە هەی بلدۆزەر، ئاسنە، ئاسنێک هەموو شتێک تەخت دەکات، هە هە. "**

- **دەبآ رێگایان بۆ بکەینەوە رەت بن ئەگینا دەمانشێلن.**

- **تۆ راست دەکەیت، ئاسن ئاسنە.**

**لەبیرکردنەوە وەستام، خەیاڵم دەکرد، دروستم دەکرد، دووکاجێرەی ئاسنم دەبینی بەکرینێکی گەورەوە هەڵواسرابوون، پاشان شۆڤلر بۆ ئەوەی هەموو شتێک بروخێنآ. نەگرتووخانەکە دەمێنآ و نە بەندیخانە، خانووەکانی گرتووخانەکە لەگەڵ زەوی تەخت دەکات، دیوارەکان دەرووخێنآ، بەرد دەکاتە خۆڵر و لم. ئەو مەکینە هەڵلووشێنەرانە لەهەموو**

**لایەکەوە دێن، هەموو خانووەکان دەشێلن، بیرم لەدووپشکەکان کردەوە، ئەوانیش دەبنە لم. بەڵام بۆ هەمووشتێک دەرووخێنن؟**

**بەڵام، بۆ ئەوەی شوێنەواری ئەو هەموو بەدکاریانە بسڕنەوە. چ ناشرینترین بەدکاریی بەکارهێنراو حاشا لەڕوودانیان دەکەن. ئێسکەکانت دەشکێنم، گۆشتەکەت وورد دەکەم، تووڕت دەدەمە گۆڕەوە، لێدەگەڕێم بەقومی کەمی بآ رووناکی، بآ ژیان بمریت، پاشان نکووڵی لەو هەمووە دەکەم: ئەمە هەمووی رووینەداوە. چی؟ گرتووخانەیەک لەتزمامارت؟ ئەوخوێرپە کێیە کە جورئەتی بیرکردنەوە دەکات لەوڵاتی ئێمەدا، کە گوایە تاوانێکی لەوجۆرە کراوە، بەدکاریەک کە وەسفی ناکرێت؟**

**با ئەوخوێرپە لەبەرچاو ون بێت، چی؟ ئەوە ژنێکە، مەسەلەکە یەکە، با وێڵ بێت، جارێکی دیکە پی ناخاتە سەر خاکی مەغریب، کینە لەدڵە، بآ تەربیەتە، لادەرە، جورئەتی ئەوە دەکات کە گوایە گومان هەیە کە ئێمە میکانیزمی مەرگی لەسەرەخۆ لەگۆشەگیریەکی تەواودا تەگبیر دەکەین، ئای چ درندەییەکە! ئەمە لەدروست کردنی دوژمنانی وڵاتەکەمانە. ئەوانەی کە بەخیلی بەسەقامگیریی و گەشەکردنمان دەبەن. مافەکانی مرۆڤ؟ بآ کەموکوڕیە، ئەوەی پرسیار دەکات با بەچاوی ببینآ و تەماشا بکات. زیندانە سیاسیەکان؟ نەخێر، نەخێر شتی لەوجۆرە لای ئێمە نییە..بآ سەروشوێنەکان؟ پۆلیس بەدوایاندا دەگەڕێت، شایانی ئەوەیە سڵاوی بۆ بکەین، چونکە بەجوانترین شێوە ئەرکی خۆی بەجێدەهێنآ.**

**ئەم گووتارە چەندجار لەسەرە بەئێشەکەم دەنگی دەدایەوە. بزەم دەهاتآ، بەوشێوەیە گرتووخانەکەمان دەرووخێنن، ئەوەم دەهێنایە بەرچاوی خۆم کە سەربازەکان چۆن دادەبارێنە سەر کۆمەڵە چیمەنتۆکان، ئارەقەیان کردووەو هەناسەبڕکێیانە، بۆیان نیە کەسیان لەگەڵ ئەویتردا قسەبکات یان پرسیار بکەن"نهێنی سەرکردایەتی باڵا" پرۆسەیەکی نهێنیە. لەوانە ناوێکی هێمای بۆ دابنێن(چەپکە گوڵ) بەهۆی وەرزی ئیمشیل کە پیاوان گوڵ پێشکەش بەوکیژانە دەکەن کە دەبنە هاوسەریان، ناوێکی رۆح سووکە. دەبینم سەربازانی دیکە ئەو دارخورمایانە دەگوێزنەوە کە تازە هەڵکەنراون لەدارستانە دارخورماکەی مەراکیش و، دەیانەوآ لەهەمان شوێندا بیانیێژن، کە پیاوان گەڵێک لەگەڵ سێدارەکەی موتڵەقەکەی خۆیاندا ژیان. بەڵام خەیاڵ دەکەم یان گومان دەکەم و سەرنج دەدەم کە دارخورماکان خۆیان رادەگرن بەرامبەر ئەوەی کە روودەدات. سەربازەکان دەیانیێژن هەوڵدەدەن چەسپیان کەن، بەپەت دەیانبەستنەوە، بەڵام راست ناوەستن، لاردەبنەوە و دەکەونە سەرزەویەکە و تەپ وتۆزی سوورو زەرد لەدەوریان بەرزدەبێتەوە، سەربازەکان نقوم دەبن، دەکۆکن و سەرلەنوآ دەست بەئیشەکەیان دەکەنەوە. بێسوودە، دارخورماکان نایانەوآ لەو زەویە گومان لێکراوەدا بچەقن، لەو شوێنە نەگریسەی کە خوێنی تێدا رژاوە، فرمێسکی تێدا رژاوە. دارخورما لە گۆڕستان ناڕوێت. ئەوسایش سەربازەکان دارخورماکان هەڵدەگرن و دەڕۆن بۆ دارستانێکی چڕ، بۆ هەڵکەندنی داربەڕوو یان مازو بۆ دووبارە هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی پرۆسەی (چەپکەگوڵ) ، بەئامانجی داپۆشینی شوورەییەکە. بەڵام ئەگەر سەربازەکان بتوانن شوێنەوارەکانی گرتووخانەکە بسڕنەوە، هەرگیز ناتوانن ئەو دەردەسەریەی کە چەشتمان لەبیرماندا بسڕینەوە، ئاە، بیرەکەم، برادەرکەم، گەنجینەکەم، تاسەکەم، دەبآ خۆت راگریت. نەکەی بآ تاقەت بیت. فێری ماندوویی و دەردەسەریەکانی رۆژگاربە، ئای، بیرەکەم، ئەی کۆرپەکەم کە ئەم ووشانە هەڵدەگریت بۆ ئەودیوی ژیان، ئەودیوی نەبینراو. کەواتە، برووخێنن، درۆبکەن، بشارنەوە، لەسەرخۆڵەمێشی پیاوەکاندا سەمابکەن. تووشی سەرەگێژکە دەبن، دوای ئەوەیش لە عەدەم بەولاوە هیچیدیکە نیە. ماندوویی و ئازار زۆریان لێکردم کە بێدەنگ بم. سەرم وەکو مەنجەڵ دەکوڵآ و بیرکردنەوەکانم باڵای ۆیان لەدەست داوە. وێنەکانم لێڵ دەبن بەڕلەوەی لەشەودا**

برەوێنەوە. شانم ئازاری دەدام و، بڕبڕەی پشتم ئازاری دەدام و پێستەم ئازاری دەدام، تەنانەت قژەکەیشم ئازاری دەدام، دەستەکانم و گەردنم ڕەق ببوون. گەشتەکە ماوەی دوانزە سەعاتی خایاند، هەرکە لۆریەکان وەستان یەکەمجار هەستم کرد گەڕاینەوە بۆ گرتووخانەکە، لە لۆریەکە دابەزین و سەربازێک بردمانی. کردمی بەژوورێکدا. پاشان کەلەپچەکانمی کردەوە، پەڕۆکەی چاوی کردمەوە. هەرکە چاوم کردەوە هەستم بەئازارکرد، بۆیە سەرلەنوآ نووقاندمەوە و، چاوەڕآ بووم پاڵم دا بەدیوارەکەوە، تابزانم چیم لێدێت، یان لەکوێم لەسەرەخۆ چاوەکانم کردەوە، یەکسەر چاوم بە پەنجەرەیەکی بچووک کەوت لەسەرەوەی دیوارەکە، ڕووناکی لێوە دەهاتە ژوورەوە. سەرەڕای ئەوەی زۆر ماندووبووم، بۆیەکەمجار بوو لەماوەیەکی دوورودرێژدا بزەیەکم هاتآ. سەربازەکە پێی وتم کە دەتوانم لەسەر قەرەوێڵەکە پاڵ کەووم. بەپێییەوە مامەوە و جووڵەم نەکرد، وەک بڵێی گوێم لێ نەبوو. قسەکەی بە لەبزێکی تێکەڵ لەسۆزو ڕێز دووبارەکردەوە: "گەورە ملازمی یەکەم، ئەگەر پاڵکەویت وەزعت باشتر دەبێت". چۆن زانی ملازمی یەکەمم؟ ماوەی بیست ساڵە لەکەسم نەبیستووە کەناوی پلەکەم بهێنآ. بیرم کە بۆ ئەو پلەیە لە9ی تەمموزی 1971 بەرزکرامەوە، بۆ ڕۆژی دواتر ئەستێرەی دووەم خرایە سەرشانم.

بەپاڵکەوتن لەسەر قەرەوێڵە ئازارم دەگاتآ لەسەر لای ڕاستم پاڵکەوتم. وامکرد زەویەکە لەرزیەوە و قەرەوێڵەکەی بەڕاست و چەپدا دەهات و دەچوو. دیوارەکان دەهاتنە پێشەوە و دەگەڕانەوە. بەڵام دەمبینی زەویەکە بەڕووناکی دەدرەوشایەوە هەستم دەکرد بەردەبمەوە ناو بۆشایی، دەکەوتم بەسەر گونیە خوری یان لۆکەدا، ئەوە یەکەم بازدانی بیردەخستەوە لەناو تاریکیدا، هەستم بەسووکە ترسێک کرد لەشوێنی دڵدا. بەڵام لەوآ ترسکە زۆر بوو وەک بڵێی چەترەکە فڕێنەدرابوو، جەستە بەئازارەکەم بەرەو خوار تووندکرابووەوە، هەستم بە سەرما کرد. هەستم کرد لەدۆخێکی بآ ڕاکێشانم و تووشی سەرەگێژەکە بووم. دەبووایە بەزووترین کات ئەو قەرەوێڵە نزمە بەجآ بهێڵم، چونکە پێستەکەم تەحەمولی هیچ نەرم و نیانیەکی نەدەکرد، جەستەم تێر ببوو لەبرینی هەمە جۆرو هەمە ڕەنگێک، دەروونم سەلامەت بوو، بگرە لەجاران بەهێزتربوو. بەڵام پێستەم تا ئەوپەڕی تەلەف ببوو. هەوڵم دەدا سەرلەنوآ هەڵسمەوە، دەستم دەگرت بەنوێنەکەوە بۆ ئەوەی نەکەوم، ئەنجامی هەوڵدانە یەک لەدوای یەکەکانم توانیم بەپێوە بوەستم، دەوەستام، بەچەمینەوە وەکو چۆن لەزیندانەکەم دەوەستام. میچەکە بەرزبوو. بەڵام نزم دەهاتە بەرچاو، داپۆش و چەرچەفەکانم ڕاکێشا و لەسەر زەویەکە ڕاکشام. زەویەکە ڕەق و ساردبوو، ئەمەیش هەستی ئارامی پآ بەخشیم و دەمتوانی بخەوم، نووقم بووم لەزۆربەی شەوە قووڵەکانی دیکە، سەربازێکی دیکە بەئاگای هێنامەوە سینیەکی بۆ هێنام خواردنێکی لەسەربوو ماوەیەکی دوورو درێژ بوو کە نەمدیبوو: نیوە مریشکێکی برژاو، هەریسەی پەتاتەو زەڵاتەی تەماتەو پیاز و نانی گەرم، لەگەڵ جامە ماست. بەدرێژی تەماشای ئەو ژەمەم کرد، بەڵام جورئەتم نەبوو دەستی لێبدەم. نانەکەو هەریسەکەو ماستەکەم خوارد. بەڵام ئەوەی مابووەوە پێم وابوو دەبآ چەند سەعاتێکی دیکە چاوەڕآ بکرێت. هەرکە پارچەیەک لەسنگی مریشکەکەم نایە دەمم، بەزەحمەت دەمجوی، چونکە نیوەی دانەکانم لەدەست دابوو، بەڵام ئەو نیوەکەی دیکە خەریک بوو دەکەوتن. هەر کەقوتمدا هەستم نەکرد، بآ تام بوو، پارچەیەک تەماتەم بەسەردا کرد، پاشان پەرداخێکی گەورەی ئاوم هەڵقوڕاند، لەگەڵ ئێوارەیشدا سینیەکی دیکە پڕی هەمان شێوەنان بۆ هێنام، وەک بڵێی جەژنە. شۆربای سەوزە و گۆشتی وردکراوم خوارد، ئەنجامی ئەوە تووشی سک یەشە بووم، نەدەبوو خواردن زۆر بخۆم، لەشەودا هەوڵمدا لەسەر قەرەوێڵەکە بخەوم، بەڵام تووشی ناخۆشی بووم لە تەحەمولکردنی ئەم خۆشگوزەرانیەدا. شەوی دووەمیشم لەسەر زەوی بردەسەر. بەیانی پزیشک سەردانی کردم، چەند پرسیارێکی پزیشکی ڕوتی لێکردم، منیش بەبآ توانج وەڵامم دەدایەوە، ئاماژەم کرد بۆ شوێنی ئازارەکانم، بۆ ماوەی سەعاتێک پشکنیمی

وەسفی تویکاری میزو و خوێنی بۆ کردم و، دەرمانی بۆ هێنام بۆ ئەوەی بیخۆم، دوای سێ رۆژی دیکە پزیشکێکی دیکە سەردانی کردم. دیاربوو پسپۆڕ لە مەسەلەیەک، لەحاڵەتی زراومی پرسی:

"دەبێ نەشتەرگەریت بۆ بکرێت، بەڵام بۆ ئەوەی ئەوە بکەین دەبێ چاوەڕێ بین، چونکە ئێستا حاڵەتت رێگا نادات نەشتەرگەریت بۆ بکەین، ئەم حەبانە بەکاربێنە ئەگەر تووشی ئازار بوویت پاشتر با بزانین چی دەبێ". پزیشکەکانی دیکە هاتن بۆ ژوورەکەم، دیار بوو حاڵەتەکەم حاڵەتی بەسەیر رزگار بوو یەک بوو. چونکە ناخۆشترین دەردەسەریەکانم پەڕاندبوو، جەستەیشم شایەتی ئەوەیە، برینپێچێک هات بۆ ئەوەی بمبات بۆ کلینکیکی پزیشکی ددان، ئەمیش کلینکیەکی گوستراوەی مەیدانی بوو،کە هەموو ئەو ئامێرانەی تێدا بوو چارەسەری ددان، گالیسکەی کلینکیەکە راستەوخۆ دەیڕوانیە هەیوانی ئەو بینایەکی کەمنی لێبووم، بەس بوو بۆ ئەوەی لەپەنجەرەکەوە تەماشایەک بکەم و بزانم شوێنەکە کوێیە، درەختەکان هێشتا وەکو خۆیان وان، هەروەها چیاکانیش، ئاسمان رەنگگەلی سەیری هەبوو.

بۆ ئەوەی بەر لە بەرەڵاکردنمان چارەسەرمان بکەن، ئێمەیان گەڕانەوە بۆ ئەو قوتابخانەیەی کە لێوەی دەرچووین بەر لەبیست ساڵ بجێبەجێکردنی کۆدەتا سەربازیەکە، لەقوتابخانەی (هرمۆمۆ) بووین، کرابوو بەبنکەیەکی چاودێری پزیشکی بۆ ئەوانەی کە لە(تزمامارت) رزگاریان ببوو، ئەو رۆژە رۆژێکی مێژوویی دەبێ لەژیانمدا: کاتێ لەسەر کورسیە بەجوولەکەی پزیشکی ددانەکە راکشابووم، چاوم بەکەسێک کەوت لەسەرسەرم، ئەو کابرا غەریبە کێ بوو، چاوی تێبرپیبووم؟ سەروچاوێکم بینی لەمیچەکەدا هەڵواسرابوو. هەرکە دانم جیڕدەکردەوە، ئەویش دانی جیڕدەکردەوە، چارەی گرژ دەکرد هەرکە چارەم گرژ دەکرد گاڵتەی پێ دەکردم. بەڵام کێ بوو؟ خەریک بوو هاواربکەم بەڵام دانم بەخۆماگرت، ئەم جۆرە خەیاڵاتانە ئاساییە لەزیندانەکەدا. بەڵام لەوێ لە زیندان نەبوو. دەبوو مل کەچبم بۆ ئەو سەرەتاتێکدەرە: ئەو سەروچاوە هەڵپێکراوە، چرچ ولۆچە، بەلۆچ و ئاڵۆزی دابێژرابوو، تۆقیو و ترسێنەر، ئەوە سەروچاوی خۆم بوو، لەماوەی هەژدەساڵدا بۆ جاری یەکەم بوو بەرامبەر وێنەکەی خۆم وەستام، چاوم نووقاند، هەستم بەترس کرد، لەدووچاوە بەقووڵاچووەکەم تۆقیم، ئەو نیگایەی بەزەحمەت لەمەرگ دەرباز بوو، ئەو سەروچاوەی کە پیربووە و رووخساری مرۆڤایەتی خۆی لەدەست داوە. تەنانەت پزیشکەکەیش سەر سووڕماوی خۆی نەشاردەوە، بەرووخۆشیەوە پێی وتم:

- دەتەوێ ئەو ئاوێنەیە داپۆشم؟

- نەخێر سوپاس، دەبێ رابێم لەسەر ئەو سەروچاوەی کە هە ڵمگرتووە بێ ئەوەی هەست بکەم چۆن دەگۆڕدرێت.

دۆخی ددانەکانم تووشی شۆکی کرد، ئەوەم بەروونی لەو نیشانانەی سەروچاوی بەدیکرد، کابرایەکی رۆح سووک بوو، بێگومان ویستی هاوسۆزی خۆی دەربڕێت، وەلێ ئەو نیگا سەیرەم کەتێم بری بوو، رێگای لەهەر گوزارشتێک گرت، ئایا لێم دەترسا، لەوێنە ترسناکەکەم، یان ئەوەتا دۆخی گشتی تەندروستیم نیگەرانی کردبوو، بەڕادەیەک توانای قسەکردنی نەهێشت؟

بەقووڵیی هەناسەی هەڵکێشا و دەمامکی کرد دەم ولووتی هەوڵیدا بۆ هەڵکێشانی ددانم ب. ناو دەمم لەهەموو شوێنێکدا خوێنی لێدەهات، وەستاو وتی:"لەجاری هاتوودا ناو دەمت دەدورمەوە" چەند حەبێکی دامێ بۆ ئەوەی بیخۆم و لەهەڵسانەوە یارمەتی دام، لەکاتی رێ و رۆیشتنمدا بەدوای ئەو سەرچاوەی دیکەوە دەگەڕام کە شەڕی پێ دەفرۆشتم،

**تەماشای میچەکەو دیوارەکان و دواوەم دەکرد. ئەو سەربازەی یاوەرم بوو پێی وتم:"بەرێز مولازمی یەکەم، کەس بەدوامانەوە نیە".**

**سەرتاشێکمان هەبوو قژو ریشی دەتاشین. ئاوێنەی نەبوو، رۆژێکیان داوام لێکرد ئاوێنەیەک بێنآ.**

- **قەدەغەیە، وتی ئێوە لەژێر چارەسەردان، ئەوان دەترسن بیرەکردنەوەی رەش بێتە بیرتان.**

- **باشە، تێگەیشتم، بەلاَم هەر هیچ نەبآ ناتوانی رێگەم بدەیت کە سەیری سەروچاوی خۆم بکەم لەئاوێنەکەدا.؟**

- **ئاوێنەم نیە..**

**بەماوەی مانگێک رەنگ و رووی زینەوەرێکی ئادەمیانەی ئاساییم لێ نیشت، هیچ گرفتێکم نەمابوو تەنها ئەو نیگایە نەبێت کە هەر کەسێک سەیری کردبام لێی دەترسا. پزیشکی دەروونیەکە خۆی وانیشاندا کە چاوم بێزاری ناکات. چەند پرسیارێکی لێکردم و منیش بەکورتی وەلاَمم دەدایەوە.**

- **هەستت چیە بەرامبەر بەسوپا؟**

- **هیچ..**

- **هەست بەرق وکینە دەکەی بۆ تۆڵە سەندنەوە؟**

- **نەخێر.**

- **رات چیە بەرامبەر بەخانەوادەکەت؟**

- **خانەوادەیە..**

- **رات چیە دەربارەی باوکت؟**

- **ئەوکەسێکە منداڵەکانی خۆی خۆش دەوێت، بەلاَم باوک نیە.**

- **رقت لێیەتی؟**

- **نەخێر، هەرگیز.**

- **چی دەکەیت کەلێرە دەرۆیت؟**

- **نازانم، لەوانەیە چارەسەری خۆم بکەم.**

- **پێیان وتم تووشی شۆک بوویت وێنەکەی خۆت لەئاوێنەکەی پزیشکی ددانەکە دیوە ئایا ئەمە راستە؟**

- **بەڵێ، راستە ئەوە نیگایەکی شێتانە بوو، لەکاتێکدا هێشتا ئەقڵم تۆکمە بوو، نیگای مەرگ بوو کەچی هێشتا زیندوو بووم، پێم قبوولڕ نەبوو ئەو جووتەچاوە کە مەسەلەیەکی ترسناکیان تێدابوو، هی من بن، ئەوانە**

**جووتە چاوی کەسێکی وڕێنەکەرە، هەست بەترس دەکەم، ترس لەچاوانی کەسانی دیکەیش دەبینم، لەوانە دەبووم خۆم ئامادە کردبایە بۆ ئەو شۆکبوونە، بەڵام رۆژێکیان ئەوە دەکەم.**

- **ئەوە دەکەین، دڵنیام، ئایا لەوەتەی لێرە خەون دەبینی؟**

- **بەڵێ، خەونی زۆر، تەنانەت لەوێ بەدرێژایی وەخت خەونم دەبینی، هەمووشی خەونی ترسناک نەبوون.**

- **دەتوانی یەکێک لەوخەونانەم بۆ بگێڕیتەوە؟**

- **بابڵێین خەونێک کاری تێکردووین**

- **ئەو خەونێک بوو کە دووبارە دەبووەوە. خۆم لەمەراکش دەبینی لەخانوویەکی کۆندا لەشار. بریتی بوو لەگوڵزارێکی دەورەدراو بەحەوشەی دەرەوە و ژووری پان و بەرین. لەچێشتخانەکەدا دایکم دەبینی، ئەو منی نەدەبینی. مل دەنێم بەرەو بەردەڵانەکەی پشتەوە کە بیرەکەی لێیە، دەمی بیرەکە بەو سەرپۆشە چنراوە داپۆشراوە کە خوشکەکانم لەرۆژانی خوێندن چنیویانە، خۆم ژوورە تاریکە دەبینیەوە. دوو پیاو دەبینم خەریکی گۆڕهەڵکەندن بوون ، لەلای راستی بیرەکەوە و، لەلایەکی دیکەیەوە خۆڵێ کەڵەکە کراوە.**

**دەنکە درەوشاوەی بچووکی لێوە دەهاتە دەرێ. نەیدەترساندم، من لەوێ بێ ئیرادە بووم، دەنگم نەمابوو، هەردوو پیاوەکە لەقۆڵم دەگرن و فڕێمدەدەنە ئەو گۆڕەوە کە هەڵیانکەند بوو، خێرا بەخۆڵێ دامدەپۆشن، جووڵە ناکەم، هەوڵنادەم هاواربکەم. لەچاڵێ نرابووم، بەڵام دەمبیست و هەموو شتێکم دەبینی کە لەچێشتخانەکە روویدەدا. دایکم دەبینی خواردنی ئامادە دەکرد . کارەکەرەکەم دەبینی زەوی دەسڕیەوە. دەمبینی پشیلەکە راوی مشکێکی دەنا، هەست بەترس ناکەم، هەست بەهیچ ناکەم، بەتەنیا پێدەکەنم و کەسیش نایەت لەوێ دەرمبێنێ.**

**ئەوەتا دکتۆر ئەم خەونەم خۆش دەوێ چونکە لەگەڵێ هەست پێکردنمدا دەگونجێ. دەمزانی کە لە(تزمامارت) نامرم.**

- **سوپاس بۆ هاوکاریت. هیچم نیە بیڵێم، خوا یارمەتی دەرت بوو.**

(36)

**لەهرمۆمۆ، دوای دوو مانگ چارەسەرکردن، زانیمان کە بەرەڵا دەکرێن، دەسەڵات پەنای بردەبەر هەڵبژاردنی دوو زیندانی یان سێ پاشان دەیاندایە دەستی پۆلیس لەناوچەکەی خۆیاندا. تا دواسات نەماندەزانی کێ دەروا و کێ دەبێ چاوەڕێ بێ. دوای پانزە رۆژ نۆرەی من هات لەسەرەتای پرۆسەی بەردان، لەژوورێکدا بووم کە قوماندار بەهاوڕێتی پزیشکێک هاتەژوورەوە:**

**(مەولامان شاە لێت خۆش بوو، لەماوەی چەند رۆژێکدا دەچیتەوە ناو خێزانەکەت، بێگومان رۆژنامەنووسە بیانیەکان پەیوەندیت پێوەدەکەن، ئەو خەڵکانەی کە چاوی بەدکارییان بڕیوەتە وڵاتەکەمان. ئەوەی داواکراوە لەتۆ زۆر ئاسانە: وەڵامی پرسیاری ناحەزانە نەدەیتەوە، هاوکاریان لەگەڵدا نەکەیت، پەیوەندیان پێوە نەکەیت، هەرجۆرە زیرەکیەک**

**بکەیت خۆم دەتهێنمەوە، بەم دوو دەستەی خۆم بۆ تزمامارت، تێگەیشتی؟ سووربووم کە قسەنەکەم، لای بێدەنگیی بگرم، گەمەکەی ئەوان نەکەم، بەڵام لەم جۆرە هەڵوێستەدا دەبوو وەڵام بدەمەوە:**

- **قوماندار دەباح گوێبگرە، دوا رستەی خۆت بکێشەرەوە، چونکە بوونی خراپتر لەتزمامارت مەسەلەیەکی مەحاڵە..**

- **چۆن ناومت زانی؟**

**توانیم پرکێشی لێ بکەم**

- **لە ئەکادیمیە کەسێکم دەناسی بەتۆ دەچوو، وەکو بڵێی تۆ بووی، کەواتە، هەڕەشەکانت بۆ خۆت هەڵگرە، سەربارى ئەوەیش داوایەکم لێت هەیە.**

- **داوا؟ چیرۆکی ئەم داوایانە چین؟**

- **ئەگەر لەم جیگایە دەرچووم، دەبآ بەراکشاوی بچمە دەرەوە، بۆیە پێویستم بەقەرەوێڵەیەک هەیە، ئەگەر لەسەر چوار چنگڵە برۆمەوە، پێموایە مەسەلەیەکی ئاوها خراپ بێت بۆ ناوبانگی سوپاو پۆلیس و تەنانەت بۆ ناوبانگی وڵاتیش..**

**بەرەو پزیشکەکە وەرچەرخایەوە و لێی پرسی:**

- **دەبینی، دکتۆر دۆخی تەندروستی تا ئەم رادەیەک خراپە؟**

- **نەک دۆخی تەندروستی زۆرخراپە، بگرە زامنی ئەوە ناکەم ئەگەر بەراکشاوی نەبێت بەزیندووی بگاتە مەراکش.**

- **کەواتە باشە، قەرەوێڵەیەکی بۆ دەبێ.**

**پاشان رۆیشت گەڕایەوەو لەدرزی دەرگاکەوە وتی:**

- **تۆ لەچ ساڵێک لە ئەکادیمیە بوویت؟**

- **ئێستا ئەوە سوودی چیە؟ پێموانیە ئێستا ئێمە بیرەوەریەکانی لاوی دەگێڕینەوە!**

- **لەدوای خۆیەوە بەتووندی دەرگاکەی داخست، لەو کاتەوە ئیتر نەمبینیەوە..**

**بۆ رۆژی دواتر هاتن بۆ بردنم لەنیوەشەودا. تاخمێکیان ئامادەکردبوو لەگەڵ کراسێک و بۆینباغێک و پێڵاوێک دا، هیچیان بۆم نابوون، بۆیە بەبیجامەیەکی وەرزشەوە چوومە دەرەوە.**

**سەفەرەکە نزیکەی بیست سەعات دەبوو، لەناو لۆریەکەدا راکشابووم، لەرینەوەش تووشی ئازاری دەکردم، کات درێژ دەبووەوە. لەگەڵ ئێوارەدا گەیشتمە مەراکش. گوێم لە بانگدەرەکە بوو بانگی دەدا بۆ نوێژکردن و هۆڕنی ئۆتۆمبیلەکان و هاڕەی ماتۆڕ و مۆسیقای ژیان. لەبنکەی ژاندرمی شاهانە لەمەراکش دایانگرتم، چاوەڕێم بوون، بردیانمە ژووری**

نووسینگەیەکەوە خەڵکی بەدەسەڵاتی لێدانیشتبوو لەناوەڕاستی ژوورەکە لەسەر کورسیەک دانیشتم، دەستم تێک ئاڵاند و کەوتمە تەماشاکردنی فەرماندەکە کەقسەی بۆ دەکردم، وەکوبلێی دانیشتنی دادگایەکی دەرەکیە:"خاوەن شکۆ شاهنشامان، خوابیپارێزآ و راوەستاوی کات، لێت خۆش بوو، سبەینآ دەگەڕێتەوە بۆ ناو خانەوادەکەت، بەڵام وریابە، بەتەئکید خەڵکانی بیانی هەن پەیوەندیت پێوە دەکەن.. تاد". بەزمانێکی ئاغری پڕلەفیزەوە قسەی دەکرد، گوێم لەهیچ نەبوو جگە لەقۆڕەی سک و تڕو جیرەی ددان نەبێت، ئەو هەمووەی کە لەشێکی نەخۆش دەیووروژێنآ لەژاوەژاوە زیاتر، سەروچاوی گۆڕاوێکی قەبارە جیاجیا بوو. لێوی شۆڕ ببوەوە، دەگەیشتە سەر مێزەکە، بەدەستەکانی یاری بەراستەکە دەکرد، دانەکانی لەیەکیان دەدا خڕە خڕێکی دروست دەکرد وەکو بەرد بەربێتەوە، لوتی ئاوی لێدەهات، هەموو جەستەی ئارەقەی لێدەتکا، فەرماندەکە سەرنجی ئەوەی نەدابوو، بەردەوام بوو لەهەڕەشەکانی و منیش بەرێکی چاوم تێی بڕیبوو، هەر کە زۆر چاوم تێ بڕیبایە، زۆر دەپەشۆکا، هەڵە، وریا بوو بۆ گەڕان بەدوای دەربڕینەکانیدا. نیگاکانم کەفیل بوون بەوەی لەپەل وپۆی بخەن. بەراستەکە دای لەمێزەکە، کاغەزەکانی ناو یەکێک لەفایلەکان پەرش و بڵێوبوونەوە و لەناو ژوورەکە پەرت بوون، ئەوسا هاواری کرد چونکە لەوێزەی نەمابوو وتی:

"چاوت داگرە. تۆ لێرە لەبەردەم فەرماندەدایت، کۆمسیاری ناوچەکە، سەرۆکی ناحیەکە.. باشە، دەڵێم ئەگەر کەسێک پەیوەندی پێتەوەکرد، دەبآ ئاگادارمان کەیتەوە، تێگەیشتی؟".

نقەم نەکرد، بەردەوام بووم لە چاوتێبڕینی، شێتگیر بوو و جگەرەیەکی داگیرساند و سەرلەنوآ کێشای بەمێزەکەوە، کۆمیساری ناوچەکە وەستانی: "لەمەگەڕآ:، وازی لێ بێنە".

هەرکە لەنووسینگەکە هاتمە دەرەوە، برا بچووکەکەم بینی  و ژنێکی لەگەڵدا بوو، بەبآ جووڵە تەماشایانم کرد. براکەم بەگریانەوە باوەشی پێداکردم و وتی: "ئایا نادیە دەناسیتەوە؟ ئەوە خوشکە بچووکەکەتە". نادیە دەگریا، وەلێ هەردوو چاوم بەتەواوی بۆشبوون. هەرکە گەیشتینە ماڵەوە بە زەحمەت هەردوو برابچووکەکەم ناسیەوە. ئەو رۆژەی کە دەستگیرکرام یەکێکیان نۆ ساڵان بوو، ئەویدیکەیان پانزەساڵ بوو. داوام کرد دایکم ببینم، بەڵام لە(جەدیدە) بوو، بۆ چارەسەر چوو بوو. زۆر نەخۆش بوو نەمدەزانی، تەنانەت لەنەخۆشیەکەیشم نەپرسی، نقەم نەکرد: هەستم بەسەرە گێژکە کرد، لەسەر زەویەکە پاڵ کەوتم، لەژێر مێزەکە، وەکو ئاژەڵێکی بریندار بەسەر خۆمدا هەڵکورمام، ئەمدیوئەودیوم دەکرد، پاشان کە هەڵسام سەرم کێشای بەمێزە نزمەکەوە، پاشان بەربوومەوە سەر فەرشەکە، لەهۆش خۆم چووم، ئاگای هیچم نەبوو. لەرۆژی 29ی تشرینی یەکەمی ساڵی 1991 بووین، تازە لەدایک ببووم.



لە دایکبوونیشم مەینەتی بوو. وەکو پیرەمێردێکی لەڕ وابووم کە تازە رووناکیی ببینآ، چواردە سانتیمەتر کەمم کردبوو، کۆم ببووم، سنگم تێکچوو بوو، توانای هەناسەدانم دابەزیبوو. قژم خۆی راگرتبوو، بەڵام پێستەم چرچ ولۆچ ببوو، لەرۆیشتندا قاچی راستم رادەکێشاو، ئەو وشانەی دەمووتن دەکەوتنە ژێر بژارکردنەوە، لەبەر ئەوەی هێندە ئەم دیو و ئەودیوم پێدەکردن بەرلەوەی یەکێکیان هەڵبژێرم. کەم قسەم دەکرد بەڵام سەرم ئارام نابوو، لەدایکبووە نوێیەکە دەبآ لەرابردووی خۆی رزگاری بآ. بڕیارمدا هیچ شتێکم بیرنەکەوێتەوە ، ماوەی بیست ساڵ نەژیام، ئەوەی

بەرلەدەی تەموزی 1971 هەبوو، مردو لەشوێنێک لەچاڵیان نا، لە چاڵێک، یان لەتەختایەکی بەگژوگیادا. بەچی ڕێگایەک ئەوانەی دەوروبەرم تێبگەیەنم کە من زیندەوەرێکی نوێم، کە ئەنجامی ئەو گەشتە تەلەف بووە، هیچ پەیوەندیەکی نیە بەوانەی کە چاوەڕێ بوون، ئەوەی کەرۆژێکیان چووە دەرەوە و نەگەڕایەوە؟ گوزارشتەکان بەشیان نەدەکرد، نەخێر، بگرە سەری لەوانە تێکدەدا کە دەقاودەق تێدەگەیشتن. بۆیە قسەم نەدەکرد، هیچ توانجێکم نەدەدا، بەشداری ژیانی کۆمەڵایەتیم نەدەکرد، گوێم لێبوو کە دەیانووت:

- هێشتا لەژێر کارتێکردنی شۆکەکەیە.
- هەڵس و کەوتی سەیرە
- ڕێک، ئەو تووشی شۆک بووە.

ئەگەر تووشی کەمتر بوونایە لەوەی ئەو وەکو ئەومان لێدەهات خەڵکی ئارەزووی خۆیان دەردەبڕی بۆ پێشوازی کردنی و ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی هاتنەوەم.

دیاریان بۆ دەهێنام، هەندآ هەوڵیان دەدا ڕووداوەکانی نیشتەجآ بوونی دۆزەخیان بۆ بگێڕمەوە، پێیان وابوو ئەو جۆرە شتە ئاسوودەم دەکات، نەیاندەتوانی هەست بەوە بکەن کە چەند دوور بووم، لەشوێنێکی دیکە بووم، خۆم بەنوێژکانمەوە گرتبوو، دوورخرابوومەوە جیهانە پڕ لەروحانیەت و ئیمان و وازلێهێنانەکەم، لەسەر سک دەکەوتم، باڵەکانم ڕاکێشابوو وەکو نەناسراوێک لەسەرەڕآ بەجێیان هێشتبآ، دەترسام لەسەرپشت بکەوم، نامۆ بووم لەجیهانێک هیچی لێ نازانم و کەسیشی لێ ناناسم. پێنج مانگ بەسەرچوو زەحمەت بوو ڕابێم لەگەڵ خۆشگوزەرانی و مەسەلە حازر بەدەستەکان، هەر کە دەچوومە گەرماوەکەوە بۆ ماوەیەکی دووردرێژ دەوەستام و نووقمی تێڕامان دەبووم لە بۆریەکان، بەسەر سوورمانەوە تەماشام دەکردن و جورئەتی کردنەوەیانم نەبوو. وەکو شتی پیرۆز دەستم لێدەدان، بەهێواشی سوورم دەدان و زۆر لەسەرەخۆ. هەرکە ئاوەکە دەڕۆیشت دەستم پێوە دەگرت و هەمووشتێکم کۆ دەکردەوە، زۆر دەردی سەریم کێشا بۆ ئەوەی ڕابێم لەسەر جووتە نەعلەکە لەسەر نووکی پەنجەکانی پێیە رووتەکەم ڕێم دەکرد، وەک بلێی دەترسام بخلیسکێم یان کاشیەکە پیس پێت. گوێم بەشێوەیەکی سەر سوورهێنەر سووک ببوو، هەموو شتێم دەبیست، هێچم لێ ڕەت نابوو، ناخۆش بوو، چونکە دەنگەکان بەگەورەیی دەگەیشتنە گوێم. لەگەرمەی بێدەنگیدا گیزە لەگوێمدا دەبووە ڕیتمێکی تیژ و بەردەوام، چاوەکانم وێنەکانیان هەڵدەلووشی ، بآ ئەوەی بزانن چین، بآ ئەوەی هیچیان لێ هەڵبژێرێن. وەکو ئەسفەنجێک وابووم، هەمووشتێکم دەمژی، خۆم پڕ دەکرد بە هەرشتێک بۆم بهاتبایە. ئەوسا زانیم کە لەدایکبوویەکی نوێم، لەجۆرێکی دەگمەن.

کە هاتم بۆ جیهان بەر لەوەی بێم بۆی تۆکمە ببووم، هەموو شتآ دەمحەپەسێنآ، هەمووشتآ تاسەم دەداتآ و، وازم هێنا بوو لەوەی کە هەمووشتآ تآ بگەم، بەتایبەتی ڕاڤەکردنی ئەو حاڵەتەی کەتێدابووم. بۆ ئەوانەی لەدەورم بوون. بۆ ئەوەی بنووم پێویستم بە قەرەوێڵەیەکی ڕەق بوو، بۆیە پێشنیازم کرد تەختەیەکی پان بخەنە ژێر نوێنەکەم. پزیشکگەلێکی زۆر هاتن بۆلام، تێناگەن چۆن وا بەزیندویەتی ماومەتەوە. پێویستم بەبێدەنگیی و تەنیایی بوو، دابینکردنی ئەم دووشتەیش زەحمەت بوو لەخێزانێکدا کە زۆرینەی کاتی خۆی بۆ ئاهەنگ گێڕان بۆشتەکان بەسەر دەبات. حەزم لەوە بوو بچمە لای دایکم دانیشم، شێرپەنجە ڕۆژەکانی ئازاردەدا، بەڵام گازندەی نەدەکرد، پێی دەووتم:

"دەزانم چ دەردەسەریەکت بینی، پێویست ناکات بۆمی باس کەیت. رادەی ئەوە دەزانم ئەگەر کەسانێک بڕیار بدەن ئازار کەسانی دیکە بدەن. زۆر دڵخۆش بووم چونکە تۆم بینی. دەترسام بمرم و ئەو ئیشە لەدڵمدا بێت، ئێستا ژیانم کەوتووەتە دەستی خوا، داوام بکات بۆ لای خۆی، ویستی خۆیەتی، بآ فرمێسک، بآ گریان، تەنها نوێژو مشتآ خەیاڵاتی نەرم ونیان، کوڕم پێم بڵێ، بۆم بگێڕەوە، دیارە چاوت بەباوکت کەوتووە ، مەسەلەکان چۆن بەڕێوەچوون؟".

- زۆر بەئاسانی بەڕێوە چوو، خوشکە بچووکەکەم ئاهەنگی جەژنی لەدایک بوونی بیست ساڵەی کچەکەی کرد، شێخە ژن و مۆسیقاژەن و ژمارەیەک لەبرادەرانی بانگێشت کرد، منیش لەنێو بانگێشکراوەکان بووم، نیازم نەبوو لەئێوارەیەکی ئاوهادا زۆر بمێنمەوە، باوکم ئاسایی درەنگ هات، هاتنە ژوورەوەی وەکو شاە بوو، ژنە گەنجەکەی لەگەڵ بوو، بەم بۆنەیەوە ژنێکی چاک بوو، دیشداشەی ئاوریشمی لەبەربوو، بۆنی عەتری ژنانەی لێدەهات ،هەرکە هەڵسام و بەرەو رووی رۆیشتم، پاشان داچەمیمەوە وەکو جاران ئاسایی، دەستی راستم ماچ کرد. لێی پرسیم کە حاڵم چۆنە، وەڵامم دایەوە کە باشم، وتی(خوالێت خۆش بآ) لەگەڵ دەست و پێوەنەکەیدا هەڵساو رۆیشت، منیش گەڕامەوە بۆ جێگاکەی خۆم، وەک بلێی هیچ نەبووە، بۆجاری هەزارەم چیرۆکی ئەو سەرتاشە جەزائیریەی بۆ گێڕامەوە، کەنیدەویست کرآی یەکێک لەخانووەکانی (کەلاوی) پاشا بدات، کە تێدابوو.

- ئایا کوڕم دەزانی، ئەو هیچ رۆژێک لە رۆژان باوکی هیچ منداڵێکی خۆی نەبووە. خۆشی دەویستن، نەشدەکرا لەوە زیاتری لێ داوا بکەیت، هەروەکو ئێستا وابوو، هەندآ جار بانگم دەکرد جەنابی میوان. نابآ رقت لێی بێتەوە، پێم بڵێ، دیارە رۆژێک لەرۆژان تزمامارت بوونی نەبووە.

- وادەڵێن، بەڵام چ جیاوازیەکی هەیە. راستە رۆژێک چیە بوونی نەبووە. حەزیش ناکەم برۆم بۆ ئەوآ و لەمەسەلەیە دڵنیابم. دیاربوو بێشیەک لەداربەرووی کۆن بۆ ئەوەی گوێزرابوەوە و چاڵە گەورەکەی داپۆشی بوو. دەیانووت تەنانەت ناوی شارەکەیش دەگۆڕن، دەیانووت.. و دەیانووت.

*********

(*)بەسام حەجار لە فەرەنسیەوە کردوویە بە عەرەبی

**زنجیرەی چاپکراوەکانی ساڵی (2010)ی**

**بەڕێوەبەرێتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی**

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر | بابەت | زنجیرە |
|---|---|---|---|---|
| 1 | دیوانی سامی عەودالْ | ئا/د. کەمال مەعروف | شیعر | 711 |
| 2 | سایکۆلۆژیای دەسەڵات | سەمەد ئەحمەد | لێکۆڵینەوە | 712 |
| 3 | وێنەیەک بەسەر ئاوەوە | سەلاح عومەر | رۆمان | 713 |
| 4 | شەڕی زمان لە پێناو تەئویلکردنی دەقدا | عەبدولمتەلیب عەبدوللا | لێکۆڵینەوە | 714 |
| 5 | ناونیشان لە چیرۆکی کوردیدا | ئارام یدیق | لێکۆڵینەوە | 715 |
| 6 | مرۆڤـ گەردونێکی نادیار | د.هادی محمد | لێکۆڵینەوە | 716 |
| 7 | رێچکەی مێروولەکان | جوتیار ئەحمەد | چیرۆک | 717 |
| 8 | ئافۆریسم | نەوزاد جەمال | لێکۆڵینەوە | 718 |
| 9 | مێژووی تۆپی پآ و پاڵەوانێتییەکانی لە جیهاندا | هەوراز کاوە | وەرزشیی | 719 |
| 10 | شەڕی گۆگامێلا | محمد ئەمین عەلی | مێژوویی | 720 |
| 11 | بونیاتی هونەری لەشیعرەکانی لەتیف هەڵمەتدا | سامان عیزەدین | لێکۆڵینەوە | 721 |
| 12 | ژاکرە مدینە منقرچە | زوهدی داودی | رۆمان | 722 |
| 13 | تۆ لە هەموو شوێنێکی تۆ | کەریم دەشتی | شیعر | 723 |
| 14 | هۆشیاریی یاسایی | فوئاد تاهر | یاسایی | 724 |
| 15 | میرزا مەنگوڕ و یوتۆپیا جیهانییەکەی | سەربەست کەرکوکی | لێکۆڵینەوە | 725 |
| 16 | دیوانی ناری | ئا/عوسمان ناری زادە | شیعر | 726 |
| 17 | کۆمەڵێک شوێنەواری دێرینی بەر لە مێژوو و مێژووی کوردستان | کەمال نوری مەعروف | شوێنەوار | 727 |
| 18 | ساڵی سفرسەباح | رەنجدەر | شیعر | 728 |
| 19 | زمان ئاسۆیەکە لەنێوان ئاسمان و زەویدا | هەندرێن | لێکۆڵینەوە | 730 |
| 20 | جاک دریدا و هەڵوەشاندنەوە | رێبین رەسوڵ ئیسماعیل | لێکۆڵینەوە | 731 |
| 21 | ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا | جەلال مەحمود عەلی | زمانەوانی | 732 |
| 22 | شار و دنیای منداڵی | عومەر دەروێش | کوراسی شێوەکاری | 733 |
| 23 | بەرەو زانستی دەنگسازی لە ئاخاوتنی کوردییەوە | شێرکۆ بابان | زمانەوانی | 734 |
| 24 | حقوق الملكيه الفكريه ژات الێله بالاێناف النباتيه الجديده والمنتجات الدوائيه | د. دانا حمه باقی | لێکۆڵینەوە | 735 |
| 25 | بنەماکانی پێڕست و پۆلێن لە کتێبخانە و بنکە زانیارییەکاندا | شێرزاد سەعید محەمەد | لێکۆڵینەوە | 736 |